# پەروەردەکردنی منداڵەکانمان

## لە چوارچێوەی
## خێزان و کۆمەڵگا و قوتابخانەدا

نوسینی:
عەزیزئالانی

چاپی دووەم





منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

زنجیرەی پەروەردەیی

کتێبی ژمارە (٢)

زنجیرەی هۆشیاری پەروەردەیی

کتێبی ژمارە ٢

# پەروەردەی منداڵەکانمان

## لەچوارچێوەی

## خێزان و قوتابخانەو کۆمەڵگەدا

عزيز عبدالله رسول

**عزیز ئالانی**

**بڵاوکراوەی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا**

**زنجیرەی ٢٩٧**

**ناونیشان / سلێمانی –سەرەتای شەقامی مەولەوی– بەرامبەر پالاس**

**مۆبایل ئاسیا ٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧ – سانا ٠٧٥٠١١٢٨٣٨٨**

chrachra٨٥@yahoo.comEmil:

http://www.facebook.com/chwarchra.chapxanai?ref=tn_tnmn
http://www.facebook.com/KtebxanaiChwarchera?ref=hl

ناوی کتێب: **پەروەردەی منداڵەکانمان**

نووسینی: عزیز ئالانی

٠٠٩٦٤ ( ٠٧٥٠١٥٥٩٣٣٨-٠٧٧٠١٥٥٩٣٣٨)

تایپ: ژیان جلال

بەرگ: فەرهاد

چاپخانە: چوارچرا

ژمارەی دانە: ١٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ: ٢٠١٤

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە ( ١٤٣٦ ) ساڵی ٢٠١٣ی پێدراوە

## پێشکەشە بە...

- هەموو کەسێکی پەروەردەکار کە پەروەردەکردنی کردۆتە خەمی یەکەمی ژیانی
- ئەو دایک و باوکانەی لەماڵەوە مامۆستای منداڵەکانیانن و ئەو مامۆستایانەی لەقوتابخانە دایک و باوکی منداڵەکانن.
- بەو نووسەرو رۆشنبیرو بیرمەندانەی کە بەجۆرەها رێگەو شێوازی پەسەندو هاوچەرخ و بەجێ پەروەردەیان کردۆتە پرۆژەی هەرە گەورەی ژیانیان.
- بەتۆی خوێنەر کە رۆژانە کاتێکت تەرخانکردوە بۆ خوێندنەوەی ئەم کتێبە بەمەبەستی بەشداریکردنت لە پرۆژەی بەرزکردنەوەی هۆشیاری پەروەردەییدا

# •ناوەڕۆك

## بــۆزانــین

**خوێنەرانی بەڕێزم.........!**

زنجیرەی هۆشیاریی پـەروەردەیی، زنجیرە کتێبێکـە لـە سـاڵی (٢٠٠٨) ە وە دەستم کردوە بە نوسین و بڵاو کردنەوەیان کە تـا ئێـستا هەنـدێکیان چاپکراون و بڵاو کراونەتەوە و ئەوانەی تریشم ئامادەن بۆ چاپکردن، بەم ناوانەی خوارەوە :

**کتێبی یەکەم :** هـزری پـەروەردە و فەلـسەفەکەی، لـە سـاڵی ٢٠٠٨ چاپی یەکـەمی بـڵاو کراوەتـەوە، کەلەلایـەن لیژنەیـەکی وەزارەتـی پـەروەردە وە بڕیـاری لەسـەر دراوە.

**کتێبی دووەم :** پەروەردە منداڵەکانمان لـە چـوار چـێوەی خێـزان و قوتابخانـە و کۆمەڵگەدا، کە ئێستا لەبەر دەستی بەڕێزتاندایە.

**کتێبی سێهەم :** یاساکانی ژیری و بیرکردنەوەمان، کە ئامادەیە بۆ چاپ.

**کتێبی چوارەم :** خێزانپەروەریی، کـە ئامادەیـە بـۆ چـاپ و بـە دورو درێـژی باسـی سستمەکانی پەروەردەی خێزانی و گرفت و کێشە و چارەسەرەکان دەکات.

**کتێبی پێنجـەم :** پـەروەردە و چاودێری منداڵـە ساوایکەت دەکـەیت؟ تایبـەت بـە دایکان و فەرمانبەرانی دایەنگەکان.

تەمەن بمێنێ.. بەردەوام دەبین. ژمارەی موبایلی نوسەرو خاوەنی ئەم پرۆژەیە:

(( ٠٧٧٠ ١٥٥ ٩٣ ٢٨ / ٠٧٥٠ ١٥٥ ٩٣ ٢٨ ))



# خۆناساندن

- ناوی تەواوم ((عزیز عبدالله رسول)) ە و بە ((عزیز ئالانی)) ناسراوم، لە ساڵی ١٩٦٨ لە گوندی (شاناخسێ) ی (ئالان) ی شارباژێری سەر بە سلێمانی لە دایکبووم لە بنەماڵەیەکی خوێندەوار
- بڕوانامەی بکالوریۆسی (پەروەردەو سایکۆلۆژیا) و (دبلۆمی تەکنۆلۆژیا) م هەیە.
- بەشداربوی کۆنگرەی چوارەمی پەروەردەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان بووم.
- ئەندامی دامەزرێنەری کۆمەڵەی زانستخوازانی سلێمانی بووم و ماوەی (٤) ساڵ سەرۆکی کۆمەڵەکەش بووم کە کۆمەڵەیەکی زانستی و پەروەردەیی و فێرکاری و خۆبەخشانەیە.
- ئەندامی کارای سەندیکای ڕۆژنامە نوسانی کوردستانم.
- لە ساڵی (١٩٩٣) ە وە لە بواری پەرورده و ڕاگەیاندندا کار دەکەم و تاکو ئێستا دانەبڕاوم و ماوەی نزیکەی (٤) ساڵ بەڕێوەبەری TV پەروەردەیی بووم، پێش ڕاپەڕینیش لە گۆڤاری تەندروستی و کۆمەڵدا بەرهەمەکانم بڵاو دەکردەوە.
- دەیان و سەدان بابەتی بڵاو کراوەم هەیە لە گۆڤار و ڕۆژنامە و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ئەنتەرنێتدا بەهەردووك زمانی کوردی و عەرەبی.
- زیاتر لە (٨) کتێب و نامیلکەی چاپکراوم پێشکەش بە کتێبخانەی شیرینی کوردی کردوە لە بوارەکانی پەروەرده و، وێژە، زانستدا.
- بەشداری چەندین خولی پەروەرده و ڕاگەیاندن بووم لە ناوخۆی کوردستان و وڵاتانی هەندەران و مامۆستای چەندین خول بوم.
- دەیان کۆڕو سمینارم پێشکەشکردوە.
- ئێستا فەرمانبەری وەزارەتی پەروەردەم بە ناونیشانی (بەڕێوەبەری جێبەجێکار) لەسەر میلاکی TV پەروەردەیی و مامۆستای (وانەی فەلسەفەی پەروەرده) م لە بەڕێوەبەرێتی مەشق و ڕاهێنانی پەروەردەی سلێمانی.

# پێشەکی

ئێمە دەژین، بەڵام ژیانمان بریتیە لە وەڵامدانەوەی بەردەوامی مێشك و ژیریمان بۆ ئەو ناوەندە ژینگەیەی کە دەوری داوین، پەیتا.. پەیتا.. لە رێی هەستەکانمانەوە هەست بە دەنگە جیاوازەکان و رەنگە هەمە جۆرەکان و تام بۆنە لە یەکتر نەچووەکان دەکەین و ئەو هەستپێکردنەشمان لە رێی ئەندامەکانی هەستەکانمانەوە و وەکو نامە و پەیام رەوانەی مێشکمان دەکرێن، مێشکیشمان هەموویان وەردەگرێت و دەیانخاتە ناو بۆتەی بیرگردنەوە و کار لێکی بیرمانەوە، سەرەنجام چەند ئەنجامێکیان لێ دەکەوێتەوە کە پێیان دەوترێت بەرهەمەکانی کارلێکی هزریمان، ئەو بەرهەمانە بە چەند پاڵێومرێکدا رەت دەکرێن و پوختە دەکرێن و لە تۆمارگەی یادگە (ذاکرة) دا بەپۆلێنکراوی تاقت (خزن) دەکرێن.

لە ژیانی رۆژانەماندا هەزاران بیرو بیرۆکە بە ئەندێشەماندا دێن و لەگەڵ ئەو پوختە کراوانەی یادگەماندا بەراورد دەکرێن و بەرهەمی نوێیان لێ دروست دەکرێت، هەموو مرۆڤێکی ئاسایی لە ماوەی (٢٤) کاتژمێردا (٦٠٠ ٠٠٠) بیرۆکەی بۆ دێت کە زوربەیان سەلیبن، مرۆڤەکەش دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو بیرۆکانەوە و نا چارە بیانخاتە ناو بۆتەی کارلێکی هزری خۆیەوە و کاریان لەسەر بکات، هەندێ لەوانە رەت دەکاتەوە و دەیانسرێتەوە، هەندێکیان وەردەگرێت و وەکو خۆی تۆماریان دەکات و دەیانپارێزێت، هەندێکیشیان وردو خاش دەکات و لە پارچەکانیان بیرۆکەی نوێ دروست دەکات.

هەموو بیرۆکەیەکی (نوێ) ش (رەفتارێکی نوێ) ی لێ دەکەوێتەوە، کەواتە بەردەوام رەفتارەکان و هەڵوێستەکانمان، گوتارو وتە ودرکەو قسەکانمان، کردار و رەفتارو جووڵە و هەڵسوکەوتەکانمان لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر دەگۆڕێن، بە واتایەکی تر میزاج و هەڵچوونەکانمان لە گۆڕانی بەردەوامدان، تێروانین و بیرو بۆچوونمان بۆ گەردوون، جیهان، ژیان، خۆمان، خەڵکی و.... هتد وەستا وو نەگۆڕو چەسپاونین، بە کورتی (کەسێتی) مان هەمیشە لە باری گۆڕانکاری دایە و هیچ کاتێك لە ژیانمان کەسێتیمان وەك کاتێکی پێشوو ترمان یان داهاتوومان نیە، مەگەر

له خاڵە جەوهەری و ستراتیژیەکاندا نەبێت، هۆکاری ئەم گۆرانە بەردەوامەشمان بریتیە لە و گۆرانەی هەمیشە لە بیرماندا ڕوودەدات کە نیشانەیەکی مەزنی گەشەکردنمانە و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هۆش و بیرمان چالاکە و کار دەکات و نەوەستاوە. سەرەنجام ڕوونە لە لامان کە هەموو گۆرانکاریەکانی کەسێتیمان و بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتەکانمان بەرهەمی بیرمانن، چۆن بیر بکەینەوە ئاواش ڕەفتار دەکەین، بیر لە چی بکەینەوە بەو ئاراستەیەشدا هەڵسوکەوت و جم و جوڵ دەکەین، کەواتە کە چاکین، چاکی بیرمانە کە خراپین خراپی بیرکردنەوەمانە. ([1])

هەر چی شتێك دەڵێین و دەکەین بە فرمان و بڕیاری بیرمانە، بیر کردنەوە باشەکانمان دەروازەکانی باش ڕەفتاریمان بۆ دەخەنە سەر پشت و بەپێچەوانەیشەوە بیرکردنەوە خراپ و لارو لە وێرەکانمان دەرك و دەروازەکانی بەدکاریمان لە مێشکماندا بۆ دەکەنەوە و بەو ئاراستەیە دا دەمانبەن.

زوربەی بیرکردنەوە و بیرۆکەکانی مرۆڤ سەلبین، ئەمەش سیفەتێکی باشی بیرمانە، چونکە ئەگەر بیرکردنەوەمان بەرانبەر بە ژیان ئیجابی بێت، ئەوا تێڕوانینمان بەرانبەر بە شتەکانی ژیانیش ئیجابی دەبێ و هەستی ڕەخنە گریمان بۆ دروست نابێ، بە واتایەکی تر (ڕازی دەبین) بە هەموو ئەو شتانەی لە دەوروبەرماندا ڕوودەدەن و هیچ وەڵام و پەرچە کردارێکمان نابێ بۆ کاریگەریەکانیان، لەو دەمەدا ئێمە هێزی خواست و ویستی خۆمان (قوة الارادة) مان لە دەست داوە، هەر کە مرۆڤیش خواست و ویستی لە دەست دا ئیتر چاوەڕوانی هیچ گۆرانکاریەکی لێ ناکرێت و ڕەوڕەوەی پێشکەوتن و داهێنانی ڕادەوە ستێت، ڕاوەستانی داهێنانیش مانای ڕاوەستانی ژیانە، دواکەوتنە، مردنە، چەقبەستنە، پەرەپێنەدانە، چێژ وەرنەگرتنە لە ڕووەگەشەکانی ژیان، بەجەمسەرەکەی تردا ڕاوەستان و سست بونی بیرمانە، کە دەکاتە کاڵ بوونەوە و نەمانی فەلسەفە لە ژیانماندا، ئیدی نازانم ژیان چ بە هایەکی بۆ دەمێنێتەوە کاتێك فەلسەفەی تێدا نەماوە؟

مرۆڤەکان لەسەر ئاستی تاکە کەسی خۆیان و لە چوار چێوەی

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر کتێبی ژمارە (٣) ی ئەم زنجیرەیە بخوێنەرەوە بە ناوی یاساکانی ژیری و بیرکردنەوەمان.

خێزانەکەشیاندا زۆر ماندوون و بە دوای ئاسودەیی و بەختەوەری و ئارامی گیانی و سرەوتی دەروونیدا وێڵن بەڵام زوربەیان لەو دەروازەیەوە ناچنە ژورەوە کە دەیانباتە سەر خوانی بەختەوەری بەڵکو ڕێچکە و ڕێبازە هەڵدێرو دورو سەختەکان دەگرنە بەر، بۆیە زوربەیان یان ناگەنە دۆزینەوەی بەختەوەری یان بە ماوەیەکی زۆرو تەمەنێکی درێژەوە لە کۆتاییدا دەگەنە سەرچاوەی بەختەوەری، ئەو کاتەش هێندە تەمەنیان بەبەرەو نەماوە کە فریای چێژ کردن لەو بەختەوەری ئاسودەیی یە بکەن.

بۆ ئەوەی مرۆڤ بگاتە بە ختەوەری و ئاسودەیی دەبێ لە دەروازەی بیرەوە بڕواتە ژورەوە، سەرەتا بیری نوژەن و ڕوناك و گەش بکاتەوە، لاپەڕەکانی دەفتەری هزری بەوردی بکاتەوە و بخوێنێتەوە. خۆی بکاتە خاوەنی بیرێکی وردو ڕون و گەش و کاراو هاوسەنگ لە ئەزمونی ژیانی خۆی و کەسانی تر بە هرەمەندبێت، بوێر و داهێنەرو پلاندانەر بێت بۆ هەموو پرۆسەیەکی بیرکردنەوە و بڕیارو هەڵسوکەوتو کردار و گفتارەکانی، بە چاوی پرۆژەوە بڕوانێتە هەموو شتێك و مامەڵەی وردو هەمەڕەهەندو واقعیانە لەگەڵ بیرو ژینی خۆی دا بکات و دەست بگرێت بە بڕی (کات) و (وزە) ی خۆیەوە.

هەموو ڕەفتارو کردارێکی جوان بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی جوانی مرۆڤەکانە، کەواتە سەرەتای هەموو گۆرانکاری و پەرەپێدان و داهێنانێك لە بیرێکی نوێ و گەش و خاوێنەوە هەڵدەقوڵێت، بە واتایەکی تر هەرگیز پەروەردەی هیچ گەل و نەتەوە و ولاتێك پێش ناکەوێت هەتاکو ئەو پێشکەوتنانە سەرچاوەکەیان بیرێکی گەش و خاوێن نەبێت، لە پشتی هەموو شۆڕشێکی ئازادیخوازانەوە بیر گەلێکی ئازادیخواز هەیە.

پەروەردەش گەورە ترین شۆڕشی بەردەوامی مرۆڤایەتیەکە دەبێ هەمیشە لە پشتیەوە بیرگەلێکی داهێنەرانە و بوێرو دلێرو دانا و هۆشیارو ڕوناکبیر هەبێت، زانا و دانایانی بواری پەروەردە بە خۆیان و دڵسۆزی و توانا و قەڵەم و بیری ڕوناکیانەوە لە پێشەنگی ئەو کاروانی شۆڕشە مەزنەدان.

دەبێت کاری یەکەمی حکومەت و دەسەلاتی باڵای وڵات بریتی بێ لە دارشتنی سستمێکی پەروەردەیی تۆکمە و وردو پڕ لە حیکمەت کە لە لایەن زانایانی

پەروەردە و سایکۆلۆژی و کۆمەلایەتی یەوە دابنرێ و چاودێری بکرێت.

ئەم کتێبە هەنگاوێکە بۆ هاندانی حکومەت و زاناو ڕوناکبیرانمان تاکو بە شێوەی پرۆژەی بێنە مەیدانەوە و بۆ دارشتن و پەیرەوکردنی سستمێکی پەروەردەیی مەزن بۆ گەورە و بچوك و خەلك و قوتابی و خێزان و مامۆستا و سەرجەم پیشەوەرە جیاوازەکان، بۆ ئەوەی سەرجەم تاکەکانی کۆمەلگە بکەنە خاوەنی یەك بیری یەکانگیری ڕوون و ئامانجدارو ئامانجدیار. چونکە تا گەورەکانی کۆمەلگە و خێزان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست لە پەروەردە تێنەگەن ئەوەی نوێش بە دروشم پەروەردە ناکرێ بەو ئومێدەوەم کە هەموولامان هاوکارو دلسۆزبین لە گەیاندنی پەیامی پەروەردەییماندا.

ئەم کتێبە بۆ ئەوە نیە کە لە گۆشەی کتێبخانەدا دابنرێ. بەلکو بۆ ئەوە نوسراوەکە هەموو تاکێکی کۆمەلگە کە تەمەنی لە سەروو (١٨) سالەوەیە بیخوێنێتەوە، لێی وردبێتەوە، دێر بە دێری ڕاڤە بکات و شی بکاتەوە، پرسیاری لە لا دروست بکات و هانی بدات بۆ خولیاگەردانی دۆزینەوەی ئەگەر و وەلامەکان.

ئەم کتێبە بۆ ئەوە نوسراوە کە بیرو بۆ چوون ومێشکت بوروژێنێ تاکو لە ئاسۆیەکی بەرزترو فراوان و ڕونترەوە بڕوانیتە هەموو لایەنەکانی ژیانی خۆت و خێزان و هاوڕێ و کەس و کارو دراوسێ و هاولاتیانت لە ژیانی کۆمەلایەتیانە و پیشەییتاندا و پەروەردە بوون و پەروەردە کردن بکەیتە کارێکی سەرەکی و هەوێنی هەموو هەنگاوێکی ژیانت.

لە هەر شوێنێکی ئەم کتێبەدا هەلە و کەموکوڕی و ناڕاستی و ڕەخنەیەکت بە دی کرد، پەیوەندیم پێوە بکەن.. تاکو سوپاسەوە ڕاستی بکەمەوە.

**عــزیز لــالانی**

**سلێمانی ٢٠١٣/١/٩**

# ئەندێشە هەڵوێستەیەك

زوربەمان لە فەلسەفە ترسێنراوین یان بە فەلسەفە ترسێنراوین، هەر لەبەر ئەوەیشە کە توخنکەوتنمان لە فەلسەفە بە بڤە دەزانین و پێمان وایە کە ئەوە بۆ ئێمە ناشێ و تایبەتە بە کەسانی تایبەت و بیرگەرو دابڕوانی خەڵك و نیشتەجێی ئەشکەوتەکان و مامۆستایانی فەلسەفە لە زانکۆکان، بەڵام لە لایەکەی تریشەوە هەریەکەمان لە جێی خۆمانەوە بیرو ئەندێشەو مێشکمان تا ئەو پەڕی سنوری وردەکاری و توانای پڕ لە حیکمەت دەخەینە گەڕ بە مەبەستی وەدەستهێنانی باشترین بەرژەوەندی بۆ خودی خۆمان و هیچ کەسێك ناتوانێ فریومان بدات، چونکە بەر لە هەر هەنگاوێکمان سەدان پرسیار لە خۆمان دەکەین و بۆ هەریەکە لەو پرسیارانەشمان نەك یەك وەڵام بەڵکو چەپکەیەك وەڵامیش ئامادە دەکەین، بەو چەشنە ژیانی ڕۆژانەمان دەگوزەرێنین، هەر زۆر بەسادەییش ئەم بارودۆخانە تێدەپەڕێنین و تۆزێك ورد نابینەوەو هەڵوێستەیەك ناکەین، ئاخۆ ئەوەی گوتمان و ئەوەی کردمان چی بوون؟

بێگومان کوت وەت پەیڕەوکردنی فەلسەفە بوو لە ڕووی کردارییەوە لە ژیانی ڕۆژانەماندا، ئەوەی گوتمان بەر لەوەی بە گوتە دەری ببڕین بابەتی خاوی بیرمان بوو، دەیان جار بەژوورو سوچی کە نارەکانی مێشك و ژیریماندا هێنامان و بردمان، دەستمان تێکوتا، پێوامان، کێشامان، هەڵمانسەنگاند...، ئەو جا بەڕێمانکرد بۆ سەر زمان، بە نوکی زمان دلمان بە ئەمبەراوبەری دەم و قوڕگ و مەلاشوماندا، لە دەروازەی لێوەکانمانەوە فڕێمان دایە ناو بۆشایی هەواوە، بە سواری شەپۆلەکانی دەنگدا دەنکۆڵە ی پیتەکانمان بە ڕیز کراوی بە دوای یەکدا کردن بەوشەو وشەکان بەڕستە و ڕستەکانیشمان بە قوڵایی گوێی گەردونـدا ڕۆهێشت؛ ئەمانە هەمووی کاری وردو پڕ لە حیکمەت بوون، بە واتایەکی دیکە فەلسەفە بوون، کەواتە بەبێ خواستی خۆمان هەریەکەمان لە جێی خۆمانەوە فەیلەسوفێکین، یاخود پەیڕەوی فەلسەفەیەك دەکەین.

هەمووومان فەیلەسوفین، بەڵام زوربەمان بەوەمان نەزانیوە کە فەیلەسوفین،

هەموشمان لایەنی کەم پەیڕەوی فەلسەفەیەك دەکەین لە ژیانماندا، بەڵام یان بەوەمان نەزانیوە، یان ئەو فەلسەفەیەمان نەناسیوە کە خۆمان ڕۆژانە پەیڕەوی دەکەین.

لە ڕاستیدا بەردەوام ئێمەی مرۆڤ بیر دەکەینەوە، دەدوێین، دەجوڵێین، ڕەفتار دەکەین، کۆی گشتی ئەم چالاکیانەمان واتە بەردەوام لە ڕەفتاردا دەژین، لە پشتی هەموو ڕەفتارو هەڵوێستێکیشەوە بە لایەنی کەمیەوە پاڵنەرێك هەیە، کە ئەو پاڵنەرە ئەرکی ئەوەیە بمانجوڵێنێ بۆ ئەوەی ڕەفتارێك بکەین، چونکە ژیان بریتیە لە کۆی گشتی ڕەفتارەکانمان لەودیوی هەموو پاڵنەرێکیشەوە (بیرۆکە) یەك هەیە، هەموو بیرۆکەیەکیش بەرهەمی بیرومێشك و ژیریمانە، هەموو ژیریەکیش لە ئەنجامی پێکەوە جۆشدان و تاوتوێکردن و کارلێکردنی زانیاری وەرگیراوە وە بەرپا دەبێت، زانیاریەکانیش لە ڕێی هەستەکانمانەوە دەگەنە مێشکمان، وەك هەستی بینین، بۆنکردن و..... هتد.

ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی ڕۆژگارە کە وامان لێ دەکات لە ڕێی ئەو زانیاریە وەرگیراوانەمانەوە پەی بەرین بەکەرەسە و تەن و کەل و پەل و مادده و کەسەکانی دەوروبەرمان و پەیوەندییان لەگەڵدا گرێ بدەین و ببن بە بەشێك لە بابەتی نیش لەسەر کردنی مێشك و بیرمان.

ئەزموونی ژیانیش هەروا بە سادە و ساکاری وە دەست نایات بەڵکو کات و ماوەو پەراوە و ڕاهێنانمان پێویستە، سەدان سەرکەوتن و شکستی و دڵخۆشی و خەمناکی و ترس و ڕاڕایی و دڵەڕاوکێی جۆراوجۆرمان دێتەرێ لە هەرشتە و شتێك فێردەبین، لە هەر فێر بوونێکمانەوە بیر لە داهێنانێکی تازە تر دەکەینەوە، هەموو ڕەفتارەکانی ژیانمان، پێویستی بەوە هەیە کە بڕیاری لەسەر بدەین، لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین (ژیان هەر هەمووی بریتیە لە هەڵوێست و ڕەفتار، هیچ هەڵوێست و ڕەفتارێکیش بەبێ بوونی بڕیار ئەنجام نادرێت، کەواتە ژیان بریتیە لە گۆڕانی بەردەوام و بڕیاری بەدوایەکدا هاتوو).

مرۆڤ بەبێ لێوردبونەوەو هەڵسەنگاندنی ورد بڕیاری خێراو بێ

سەروبەرە نادات، کەواتە دیسانەوە لە پشتی هەموو بڕیارێکیشەوە هێزێك هەیە کە ئاراستەمان دەکات بۆ بڕیاردان، کە پێی دەوترێت (هێزی ئاراستەکار) هێزی ئاراستەکاریش پەیوەندیەکی تۆکمە و بەتینی هەیە بەلایەنی حەزو خواست و ئارەزوە دەرونی یەکان و سۆزو پێداویستیەکانی ژیانمان و ژیری و لۆژیکمانەوە.
ئەو مرۆڤەی لە ژێر ڕکێفی هێزی ئاراستەکار دا چالاکی و بڕیارەکانی نادات، ئەوا یان نیە، یان بوونێکی بێ ڕژێمە و ڕۆبۆتێکی بێ خواستە.
ئاراستە و ئاراستەکاریی ڕۆڵی ڕکێفگری مرۆڤ دەبینن و پەیتا پەیتا دەیخەنەوە سەر شاڕێی ژیان، کاتێك هێزە کارتێکەرە دەرەکی و ناوەکیەکان لەو ڕێیە لایدەدەن.
هەمووومان ئاراستەکاری خۆمان و کەسانی تریشین، دەکەوینە ژێر کاریگەری ئاراستەکاری ئەوانەوەو ئەوانیش دەکەونە ژێر کاریگەری ئاراستەکاری ئێمەوە.
تاکە سەرچاوەیەك کە مرۆڤ لێوەی فێر بێ ئاراستەی خۆی و کەسانی تر بکات بریتیە لە پەروەردەی کرداریی، تەنها پەروەردەیە کە دەتوانێت فێری ئاراستەکاریمان بکات و هاوکات بمانکاتە ئاراستەکار بۆ خودی خۆمان و بۆ کەسانی تریش.
ئێمەی مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتین و هەرگیز ناتوانین دەرك و دەروازە فراوانەکانی ژیان بە ڕووی خۆماندا دابخەین و بە تەنها بژین، هەریەکەمان پێویستمان بەوانی ترمان هەیە، بۆ نمونە : تۆ بە شێکیت لەتەواکاریەکانی ژیانی من، هەروەها منیش بەشێکم لە تەواو کاریەکانی ژیانی تۆ، بەڵام نە (تۆ) دەتوانیت (من) بیت و نە (من) یش دەتوانم (تۆ) بم، بەڵکو (من) بە بوونی (تۆ) موە دەبم بە (منێکی تەواو) و (تۆ) ش بە (من) ە وە دەبیت بە (تۆیەکی تەواو) بە خواستی خۆمان نیە، بەڵکو پێداویستیەکانی ژیانمان نا چارمان دەکات کە هۆگری یەکتری بین، لایەنی چاك و خراپی ژیانی هەریەکەمان کار دەکاتە سەر ڕەوتی ژیان و هاوسەنگی ئەوی ترمان.
ئەوانەی باسمانکرد لە ڕووی لایەنی ژیری و بڕیاردان و هەڵوێست و

ڕەفتارو بیرکردنەوە وە سەرجەمیان پێویستیان بەوە هەیە کە بەشێوەیەکی وردو پڕ لە حیکمەت بەکار بهێنرێت. ئیتر ئەمەیە کە مانای پەیڕەوکردنی فەلسەفە دەگرێتەوە لە ڕووی کرداری یەوە لە ژیانی خۆماندا، چونکە گفتوگۆ و پرسیار لە خۆکردن و هەڵسەنگاندن و لێوردبونەوە و بڕیاردان و بەدوادا گەڕانی لێ دەکەوێتەوە، ئەمانەش سیفەتی فەلسەفەن.

لەکورتیدا بڵێین : هەموو کەسێك لە مرۆڤە ئاسایی یەکان فەیلەسوفن و پەیڕەوی فەلسەفەیەك دەکەن، پەرۆشی گەڕانن بۆ دەستکەوتنی وەڵامی پرسیارەکانیان و دەیانەوێ بگەنە ناو جەرگەی دڵنیایی و ئارامی و بەختەوەری کەواتە ئێستا بۆمان دەرکەوت کە هەریەکەمان بە گوێرەی خۆمان فەیلەسوفی خۆمانین ئەو فەیلەسوف بونەشمان وامان لێدەکات کە ئەسرەوین بەردەوام لە جم و جوڵدا بین، بێگومان هەموو جم و جوڵ و چالاکیەکیشمان بەرپرسیارێتی لە دوایەو نابێ بە هەڕەمەکی خۆمان بدەینە دەست ڕۆژگار، بەڵکو دەبێ بزانین چۆن ڕۆژگار دەخەینە ژێر ڕکێفی خۆمان و دەستەمۆی دەکەین تاکو لە ئامێزی (کات) دا گەورەترین گۆڕانکاری و گەشە بە خۆدانمان بەرپا بکەین و ئەو ئاسودەییە بۆ نەوەکانمان دەستەبەر بکەین کە ( خۆمان نەمانتوانی پێی بگەین، چونکە نەکۆشاین بۆ ئەوەی تێی بگەین).

دەبێت ئەرکی پەروەردەکردن بە ئەرکی یەکەمی خۆمان بزانین، سەرەتا دەبێ خۆمان پەروەردە بکەین، ئەوسا دەتوانین منداڵ و خێزانمان پەروەردە و ئاراستە بکەین و سەرەنجام کۆمەڵگەمان ڕاست بکەینەوە، هەرگیز ناتوانین کەسێك پەروەردە بکەین کە نایناسین، کەواتە دەبێ سەرەتا سروشتی منداڵ بە تەواوەتی بناسین و پێی ئاشنا بین، ئەوسا دەتوانین لە ڕێی شەپۆل و تاڵە دەزوەکانی پەیوەندی سۆزو خۆشەویستیەوە ئەو پەروەردە و ئاراستە کردنە بگوازینەوە بۆ قوڵایی دڵ و دەروونی منداڵەکانمان، زانیاری هەرگیز لە ڕێگەی وشك و بێ سۆزیەوە گوزەر ناکات لە دڵێکەوە بۆ دڵێکی تر، دەبێت ئەو ڕێگەیە بە سۆزو خۆشەویستی و میهرەبانی و ڕێز نەرم و نۆڵ بکەین تاکو بەری پێی

زانیاریـەکان نەڕوشـێت و نەشـێوێن لـە کـاتی گوزەرکردنیـان لـە کەسـێکەوە بـۆ کەسێکی تر. چونکە زانیـاری چۆن بـەڕێ بکرێت ئاوەهـاش دەگاتـە جێـی خۆی، زانیاری شەکەت و شێواو بریندار بە زانیاری نەشیاوو نەخۆش لـە قەڵەم دەدرێـت و بۆ ئەوە نابێ کۆشـك و تـەلاری و بـیری بـۆ بڕازێنـەوە، هـەر وەکو چۆن خۆمـان حەز ناکەین میوانی چڵکن و کوڵکن بێتە سەر خوان و مافورمان.

پرسیارەکە لێرەدا ئەمەیە : لە کاتێکدا هەمووومان یان پـەروەردە دەکـەین، یان پەروەردە دەکرێین، ئامادین بۆ ئەو ئەرك و کارە؟ ئایا ئێمەی دایکان و باوکـان و مامۆستایان و پەروەردەکاران و هاوڵاتیانی سەرووی تەمەنی (١٨) ساڵی ئاسایی لە پێناسـەی منداڵ تێگەیشتوین؟

دەزانین منداڵ کێ یە؟

ئاسیومانەو ئاشنا بووین بە جیهانە ڕاستەقینەکەی؟

ئایا دەزانین دەبێت چۆن لەگەڵ ئەو منداڵەدا هەڵسوکەوت بکەین؟

ئایا هەڵسوکەوت کردنمان و بڕیارەکانمان لەو بارەیەوە ڕاست و دروسـت و لـۆژیکین؟ یـان میـزاجین و بـە ئـارەزووی خۆمـان بڕیـار لەسـەر هەڵوێـست و مامەڵەکانمان دەدەین؟

کەواتە سـەرەتا دەبێـت لایـەنی کـەم چـەند خـاڵێکی جەوهـەری دەربـارەی منداڵ بزانین، بۆ ئەوەی بیناسین، هەر وەکو چۆن وەستای دیواری خـانوو، هـەتاکو بە تەواوەتی شاوڵ و کەمچەو چەکوش نەناسێت، ناشزانێت چۆن بـەکاریان بهێنـێ لە دروست کردنی دیواردا، خۆ ئەگەر بـە نـەزانی بـەکاریان بهێنـێ ئـەوا بێگومـان دیوارەکـە لارو لـەوێر دەردەچـێ و لەهـەر سـاتێکدا بـێ دادەڕمـێ، منـداڵیش ئـەو کەرەسـەخاوەیە کـە مرۆڤـی ئاینـدەی لێ دروسـت دەکرێـت بـە شـاوڵ و تـەناڤی پـەروەردە و کـۆنکرێتی سـتونە سـەرەکیەکانی و ئـاوی هێمنـی و بلـۆکی دانـایی و دەستکێشی زانستی و پەنجەی هۆشیاریی، کەواتە با خاڵـە سـەرەکیەکانی سروشـتی منداڵ بناسین و لە خۆمان بپرسین : منداڵ چی یە؟ کێ یە؟ ئەی ئێمە چۆن لێـی تێبگەین و بیناسین؟

# یەکەم :

١. قەوارەیەکی مرۆیی دروست و تەواوە، بارێکی پەروەردەیی لا دەرو یاخی نیە. واتە مرۆڤێکە، وەك ئەوە وایە کە وەکو تۆ گەورە بوبێت و پاشان بچوك کرا بێتەوە و خرابێتە بەردەستی تۆ، وەکو تۆ دەخوات و دەخەوێ و گەشە دەکات و ئارەزووی دیاریکراوی خۆی هەیە و سەدان هیوایەت و ئاواتی لە ناخدایە، دەیەوێت کەسێك بدۆزێتەوە کە لێی تێ بگات و یاری و گەمەی لەگەڵدا بکات و چێژ لە ژیان وەربگرێت، کاتێك دڵنیا دەبێ کە وەکو تۆی گەورەی بۆ نایەتە پێشەوە و ئەو دەسەڵاتەی نیە، ئیتر لاسایی تۆی گەورە دەکاتەوە تاکو بیسەلمێنێ بۆ تۆ کە ئەویش هیچی لەتۆ کەمتر نیە، بەڵام بێگومان ناتوانێ وەکو تۆ بێت لەم تەمەنیدا، لەبەر ئەوە دەکەوێتە هەڵەوە و زوربەی جاریش کەڵەکە بوونی ئەم هەڵانە دەبنە هۆی نا ئومێد بوون و تێکشکانی و پاشگەز بونەوە و خۆ خواردنەوە و تورە بون و دابڕان و یاخی بوون لەمن و تۆی گەورە یان لە خۆی یاخود لە کۆمەڵگەکەی.

منداڵ لە بنەڕەتدا یاخی ولادەر نیە، بەڵکو ئەوە ئێمەی گەورەین هەر کە بە دڵی مـن و تـۆ نەجووڵایەوەو گوێڕایەڵی کۆیلایەتیانەی نەکردین ئیتر ناوی یاخی و سەرکێشی لێ دەنێین و دەکەوینە ئازاردان و سەر زەنشتی کردنی، سەیرەکە لەوەدایە ئێمەی گەورە کارەکەی خۆمان ناو دەنێین (پەروەردەکردن)و ئەوەی ئەویش ناو دەنێین (سەرکێشی و یاخی بون و لادان)، کەلە ڕاستیدا بە پێچەوانەوەیە، ئەوە نەزانینی ئێمەیە لە بواری پەروەردەدا کە منداڵ و خواستەکانیمان نەناسیوە و دەشمانەوێت کوت و مت وەکو خۆمان بن، یان لە (خۆمان) ی ئێستامان چاکتر بن، ئەوە ناخەینەوە بیری خۆمان، ئاخۆ (خۆمان) لە تەمەنی ئێستای ئەودا چۆن بوین و حەزو ئارەزوومان چی بوو؟ چەند لەو ئاوات و خواستانەمان وەدی هاتبوو؟ چەند

ڕقمان لەو کەسانە بوو کە لێمان تورە دەبون و ڕێگر بوون لەبەردەم هێنانەدی خواستەکانمان و تێرکردنی چێژی منداڵیمان. چەندە ڕەقمان لەو کەسانە بوو کە لێمان تێنەگەیشتن؟

## دووەم :

٢. منداڵ لە پێناوی تێرکردنی چێژەکانیدا ئەرکەکانی جێ بەجێ دەکات نەك لە ڕێی ئازارەوە، واتە منداڵ (چێژ) ی دەوێ نەك (ئەرك) واتا نایەوێ لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێ لەسەرکەمتەرخەمیەکانی، چونکە لە بیرو بۆچون و فەرهەنگی ئەودا شتێك نیە ناوی (کەمتەرخەمی) بێت، ئەوەی لای من و تۆی گەورە ناوی (کەمتەرخەمی) یە، لە لای ئەو شتێکی فەرامۆشکراوە چونکە چێژی تێدا بەدی نەکردوە و سەرنجی ڕانەکێشاوە، دەبێت ئێمەی گەورە چێژی بۆ بخەینە ناو هەموو ئەرکەکانیانەوە، تاکو بە هۆی ئەو چێژەوە ڕووی تێ بکات و جێبەجێی بکات، منداڵ لە ڕێی ترسەوە هیچ فێر نابێ، ئەوەی دەیکات لەبەر خۆلادانیەتی لە سزای ئێمەی گەورە، ئەگینا لە بنەڕەتدا باوەڕی پێی نیە. کەسیش فێری شتێك یان زانیاریەك نابێ کە ئارەزوی نەبێ و باوەڕی وا نەبێ کە دەیەوێ فێربێ.

ژیان لە سەر بنەمای ململانێ و بەربەرەکانێ و دژە کرداروو پەرچە کارنا چێتە سەر، باشترین شت گونجاندن و هاوکاری و دادپەروەری و تێگەیشتن و قەناعەتی واقعیانەیە، جا ئەگەر بەو ڕێگایانە گەیشتنە یەکتری ئەوا هەموو لایان بەشدارو ئاسودە دەبن، ئەگەر وا نەبن ئەوا با هیچ نەبێ وزەی خۆیان لە بەگژیەکدا چوونەوەدا بە فیرۆ نەدەن، کە هیچ ئەنجامێکی باشی لێ چاوەڕوان ناکرێ.

زەپۆش و بواری منداڵ بۆ لێکهەڵوەشاندنەوەیە، نەك بۆ بنیاتنان و پێکەوە نان، واتا ئەو شتانەی منداڵ دەیکات چەسپاونین و ماوەکە کەم دەخایەنێ و زوو

لەبەر یەك هەڵدەوەشێن، بۆ ئەوە نین کە بەردەوام لەسەر یان بێت و بیانچەسپێنێ، بۆ نموونە : منداڵ کاتێك یاری بە میکانۆ دەکات، کاتێکی زۆر لە دروستکردنی خانوی میکانۆدا بە سەر دەبات، لەو ماوەیەشدا سات بە سات چێژ لەو یاریە وەردەگرێ، تاکو چێژەکەی تێر دەبێ، ئیتر ئارەزوەکەی پێچەوانە دەبێتەوە و حەز دەکات خانوەکەی تێکوپێك بدات و بیڕوخێنێ و هەر پارچەیەی بەلایەکدا فڕێ بدات، دیسان لەم تێکدانەش چێژ وەردەگرێ، کە تێر بوو ئیتر واز لەو یاریە دەهێنێ و دەچێتە سەر جۆرە یاریەکی تر، یان دەخەوێت.

بە هەر حاڵ ئەم جیهانە گەورەیە، لە لای منداڵ بریتیە لە یاریگەیەکی گەورە هەموو شتەکان بەبۆ چوونی ئەو بۆ گاڵتە و گەپ و گەمەویاری دروست کراون دایك و باوك و ئەندامە گەورەکانی خێزانەکەیشی بۆ ئەوە دروست کراون کە بەردەوام گەمەو یاری لەگەڵ ئەمدا بکەن، واتا لای منداڵ شتێك نیە ناوی ڕاستی ڕەهاو بەردەوامی بێت، کاتێك مناڵێك هەڵەیەکی ڕەفتاریانەت بەرانبەر دەکات، وا مەزانە کە ئەوە بە ئەنقەستە و قین و ڕقەوە تۆڵەی خۆی لە تۆ دەکاتەوە، منداڵ ڕق و تۆڵە نازانێ، ئەو کارەیشی شتێکی کاتیە و پاش کەمێکی تر بە تەواوەتی پێچەوانە دەبێتەوە، بۆ نمونە : دوو منداڵی دوو خێزانی دراوسێ لە کاتی یاریدا شەڕیان دەبێ و لە یەکتری دەدەن، دایك و باوکەکەی هەر دولایان دەیکەنە هەراو دەمە قاڵێ و شەڕ، بەڵام کاتێك لەشەڕو هەرا لێدەبنەوە و ئاوڕ دەدەنەوە بەلای منداڵەکانیانەوە دەبینن کە هەر دووك مناڵەکە زۆر بە ئاسایی و بەبێ هیچ کۆنەقین و ڕقێك گەمەو یاری دەکەن و پێ دەکەنن، کەواتە نابێ پێویست و کارو گوتاری منداڵ بە شێوەی قاڵبی کۆنکرێتی وەربگرین، بەڵکو وەکو گونکە هەویر تەماشایان بکەین و دەکرێت جۆرە هاشکڵ و شێوەیان لێ دروست بکەین.

هەموو ئارەزووەکانی منداڵ بەجێن، بەڵام هەندێ جار منداڵ بە شێوەیەکی هەڵە ئارەزووەکەی خۆی دەردەبڕێ یان داواکاریەکەی داوا دەکات، منداڵ مافی خۆیەتی داوای هێنانەدی هەموو حەزو خواستەکانی خۆی بکات لە

دایك و باوك بەخێوكارو مامۆستا و كۆمەڵگەكەی، ئەمەش سەبارەت بـە منداڵەكـە خۆی، منداڵ هەقی ئەوەی نیە جیهان لە دەرەوەی خودی خۆی چیە و چۆنە، ئـەو نازانێ چیە، ئەو هێشتا ڕەمەكە ڕەسەنە ئاژەڵیەكەی تێدا ماوەو لە قاڵب نـەدراوە، وەك مـن و تـۆ لـە قاڵب دراویـن و گـەلێك جار شـەرم و یاسا و نـەریت و.... هتـد دەكەینـە ڕێگـرو كۆسـپ لەبـەردەمی ئـاوات و حەزەكانمانـدا، دەگێڕنـەوە منـداڵێك داوای ماستی كرد، دواتر داوای دۆشاوی كرد ئینجا بە دایكی گوت بۆم تێكـەڵ بكـە، پاشان وڕكی گرت لەسەر ئەوەی كە دەبێ دۆشاو و ماستەكەی سەر لە نوێ بۆ لـە یەكتری جیا بكاتەوە، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەودی كـە (منـداڵ ئـەوەی دەوێ كـە دەیەوێ، ئەوەی ناوێ كە دەتەوێ) هەروەها (ئەوە دەكات كـە چێژی لێ وەردەگـرێ، ئەوە ناكات كە بە زۆر پێی دەكرێ).

وەك مرۆڤێكی ئاسایی نەبەستراوە بـە نـەریت و خـوی كۆمەڵگەوە، منـداڵ هـەر داواكاریـەكی هـەبێت داوایـەكی ڕەوایـە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی هەنـدێ لـە داواكاریەكانی لەگەڵ نـەریت و یاسـای بـاوی كۆمەڵگـە و خێـزان و لـۆژیكی واقعی ژیاندا ناگونجێن، ئێمە ناویان لێ دەنێین (داواكـاری نابـەجێ)، یـاخود منداڵەكـە لـە شێوازی داواكاردنی ئارەزووەكەی دا شارەزا نیـە و بەشـێوەیەكی ئـەو تـۆ داواكـەی دەردەبـڕێ كـە لـەلای مـن و تـۆی گـەورە ئـەو جۆرە داواكردنـە بـاوی نیـە و پێـی ڕانەهاتوین، هۆكاری سەرەكی بەرپا بوونی كێشە لە نێـوان بـەخێوكاری منـداڵ و خودی منداڵدا لە ڕووی ئارەزووەكانی منداڵەوە پەیوەنـدی بـەوەوە هەیـە كـە تـاكو ئێـستا وەك پێویـست نـاخ و نـاوەڕۆك و سروشـت و خـودی منـداڵ لـە لایـەن بەخێوكارانەوە نەناسراوە، یـاخود منـداڵ ڕانـەهێنراوە لەسـەر شـێوازی گونجـاو بـۆ چـۆنیەتی داواكـاردنی حـەزو داواكاریـەكانی لـە كەسـانی گـەورەتر لە خـۆی، كـە ئەمەش دیسانەوە هەر دەگەڕێتەوە بـۆ بـەخێوكار، چونكە بـە وردی كـاری لەسـەر پەروەردەكردنی منداڵەكەی نەكردوە تاكو فێری شێوازێكی ڕاست و دروستی بكات لەسەر ئەو شێوازە.

خۆشمـان كاتێـك منـداڵ بـووین كەوتوینەتـە هەڵـەی لـەم جـۆرەوە، واتـا

نـــەمانزانیوە چـــۆن نـــاخی خۆمـــان و شـــێوازی داواکاریـــەکانمان دەربـــڕین بـــۆ گەورەکانمان.

یاخود ئێمە زانیومانـە، بـەڵام گـەورەکانمان نـەیانزانیوە لـە زمـانی داواکـاری ئێمـە تێبگـەن. منـداڵ زمـانێکی تایبـەتی و دەربڕینێکـی نیمـچە هێمـای هەیـە بـۆ دەربڕینـی نـاخی خـۆی و داواکردنـی پێداویـستی یـەکانی، کـە زوربـەی کەسـانی گەورەو نامنـداڵ ئـەو زەمانـەیان لـە بـیر چوەتەوە، ئـەگینا کاتێـك خۆشـیان منـداڵ بوون ئەو زەمانەیان زانیوە و هەربەو شێوازو زمانە دواون، ناسینی منـداڵ گرنگـە، بـۆ ئـەوەی لێـی تـێ بگـەیت، تێبگـەیت بـۆ ئـەوەی بزانیـت وەڵامـی داخوازیـەکانی بدەیتەوە، چونکە ئەگەر منداڵ وەڵامی داواکاریـەکانی نەدرێتـەوە، یـان قەناعـەتی پێ نەکرێت، ئەوا توشی گەلێك گرێی دەرونی و لاواز بونی متمانـە بـە خـۆ بـون و شـکانەوەی کەسـێتی و خـۆ بەکـەم بینـی دەبێـت و لـە تەمـەنی گـەورە بوونیـدا مەترسـیەکانی دەردەکـەوێت لـە ڕووی کۆمەڵایـەتی و دەرونـی یـەوە. هـەموو پشێویەکی ڕەفتاریانەی منداڵ، سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی پشێوی لـە تێرنەکردنی پێداویستی یە پەروەردەییەکانی. هەموو کەسێك لـە ژیانیـدا تووشـی پشێوی ڕەفتاریی دەبێت، واتە بەلایەنی کەمیـەوە مـرۆڤ لـە قۆنـاغێکی تەمەنیـدا، یان لە ماوەیەکی ژیانیدا نا هاوسەنگی و تێکەڵ و پێکەڵییەك بەسەر هەڵسوکەوت ڕەفتارەکانیدا دێت، بەڵام کورت و درێژی ئەو ماوەیە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، هۆکاری بەرپا بوونی پشێوی ڕەفتاریش لە مرۆڤەکانـدا دەگەڕێتـەوە بۆ یەك خاڵ، ئەویش نەبوونی پەروەردەیـەکی شیاوە، واتـە نـەبوونی پەروەردەیـەکی ئـەو تـۆ کـە بـە ئاسـانی مـرۆڤ ڕابهێنـێ لەگـەڵ ژینگـەی سروشـتی و کۆمەڵایـەتی مرۆڤەکانـدا.

هەمووومان ئەوە دەڵێینەوە و دەکەینەوە کە لە ڕێگەی پـەروەردە لـە دایـك و بـاوك و خێـزان و مامۆسـتاو کۆمەڵگـەوە وەرمـانگرتوەو فێـری بـووین، هـەموو فێربوون و فێرکردنێك جۆرێکە یان ڕێگەیەکە لە ڕێگەکانی پەروەردە کردن.

بەردەوام مرۆڤ زانیاری نوێ و خووی نوێ و کـرداری نـوێ فێـر دەبـێ، کـە

هەندێك لەوانە بەلای كۆمەڵگەوە ڕاست و پەسەندن و هەندێكیان ناڕاست و نەشیاون، هەمیشە كۆمەڵگە هەوڵ دەدات نەوەی نوێ فێری ئەو ڕەفتارو كردارو گفتارانە بكات كە بەلای كۆمەڵگەوە پەسەندن، بەڵام گەلێك جار مرۆڤ لە پێناوی ئارەزووەكانی خۆیدا بە ئاشكرا، یان بە نهێنی سەر پێچی یاساكانی كۆمەڵگە و نەریت دەكات و كردارو ڕەفتاری نا بەجێ دەكات، كە ئەمەش جۆرێك لە پشێوی ڕەفتار دروست دەكات، دەبێت سەر لەنوێ ئەو كەسە ڕاستكردنەوەی ڕەفتاری بۆ بكرێت، ئەگینا بەرەو بەردەوامی و (لادانی ڕەفتاری) دەچێت، وتمان لەودیوی هەموو ڕەفتارێكەوە پاڵنەرێك هەیە، بەلایەنی كەمیەوە، مرۆڤ لە ڕێی ئەو پاڵنەرەوە هەوڵ دەدات بۆ گەیشتن بە خواست و تێركردنی ئارەزووەكانی و پێویستییەكانی، هەر كاتێك مرۆڤێك پێویستیەكانی تێر نەبوو ئەوا هەوڵ دەدات بە هەر ڕێگەو شێوازێك بێت بكاتە تێر بوونی ئارەزووەكانی و پێویستیەكانی،یەكێك لەو ڕێگایانەش گرتنە بەری شێوازی نا بەجێ یەكە دەبێتە هۆی بەرپا بوونی پشێوی ڕەفتاریی، كەواتە سەرچاوەی سەرهەڵدانی پشێوی بریتیە لە تێر نەبوونی پێداویستیەكان، بەڵام پێویستە ئەوەش بزانین كە هەندێ كەس سەرەڕای تێر كردنی پێویستیەكانی هەرزیاتری دەوێت و تێر نابێت، ئەوانە كەسانی زێدەڕەون، دەبێت سنور بۆ مافەكانیان دابنرێ و ڕێگەیان پێ نەدرێ زیاد لە پێویست داوای تێر بونی ئارەزووەكانیان و پێداویستیەكانیان بكرێت.

# لێكدانەوەی وشەی... پەروەردە

ئەگەر چی وشەی (پەروەردە) لە زمانی ئینگلیزیدا ئەو چەمكە واتاییە فراوانەی نیە كە لە زمانی فەرەنسیدا هەیەتی، بەلام لەبەر ئەوەی كە ئەمڕۆ زمانی ئینگلیزی بوەتە زمانێكی جیهانی، وا باشە بنەچەی وشەی (پەروەردە) لەو زمانەدا ڕوون بكەینەوە.

سەرەتا دەبێت ئەو ڕاستیە بە هەند وەربگرین كە لە فەرهەنگی زمان و كولتوری زوربەی ولاتان و گەلانی ڕۆژهەلاتیدا دوو وشە تێكەڵ بوون، ئەگەر چی لە بنەڕەتدا زۆر لەیەكتریەوە جیاوازن، چ لە ڕوی زمانەوە وەك واتا و چ لە ڕووی زاراوە وە وەك چەمك، ئەو دوو وشەیەش بریتین لە (پەروەردە) و (فێركردن)، هۆكارەكانی تێكەڵبونیشیان زۆرن و لێرەدا بە پێویست نازانرێ ئاماژەیان پێبكەین.

educe لە زمانی ئینگلیزیدا بە مانای (لێدەرهێنان) دێت، ئەمەش دەبێتە دایك بۆ لە دایكبوونی وشەیەكی تر كە شیاوی گەشە كردنێكی زیاترە لە باری ئاسۆیی و ستوونیدا، ئەویش بریتیە لە education وە بە واتای (پەروەردە) تەوزیف كراوە و تا ئێستاش هەمان واتای بەسەردا زاڵە، هەر چەندە (لێوەرگرتن و لێدەرهێنان) ڕاست و ڕەوانترە، چونكە مانای دەرهێنانی شتێكە، لە شتێكی تر، وەك دەرهێنانی كەسێك، واتە پەروەردەكردنی، هەر وەكو لە كوردیدا و لە ناوچەی موكریان دەوترێت : (دەرهێنانی پێستە)، واتا خۆشكردنی چەرم و ئامادەكردی بۆ پیشەسازی.

education گەلێك واتای هەیە، لە زمانی ئینگلیزیدا، وەك (پەروەردە، پەروەردەكردن، فێركردن، خوێندەواركردن، ڕۆشنبیری، ڕۆشنبیركردن، زانست و زانیاری، فەرهەنگ، بەرهەمی هزری)، ئەم وشەیە، لاستیكی یە و گەلێك مانا هەڵدەگرێ،

لە فەرهەنگی (حتی) چاپی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٢) دا، لە لاپەڕە (١٣٧) ئەم

وشەیە جگە لە مانای (پەروەردە) مانای (الأرشاد : ڕێنومایی) یشی بەرانبەر دانراوە، هەروەها دکتور محمد علی لە چاپی چوارەمی ساڵی (٢٠٠٠) ی فەرهەنگەکەیدا (القاموس التربوی) لاپەڕە (١٤٧) جگە لە مانای (پەروەردە چەند مانایەکی تریشی بەرانبەر education داناوە، لەوانە : (ڕۆشنبیری، زانستی پەروەردە، فێرکردن)،بۆ(مرۆڤی ڕۆشنبیر و پەروەردەکاریش) educated man ی داناوە، (فەرهەنگی المورد) ی چاپی (٢٤) لاپەڕە (٣٠٥) ی ساڵی (٢٠٠٠) وشەیەکی تر بەرانبەر education هاتوە کە (البراعە) یە، لە لایەکی ترەوە لە فەرهەنگی educational lanyuaye چاپی یەکەمی ساڵی ١٩٩١ لاپەڕە (٨٢) بەوردی باسی ئەو وشە و زاراوانە کراوە کە لە زمانی پەروەردەیی دا بەکار دەهێنرێن،

(جویس. M. هۆگنز) لە چاپی نۆرەی ساڵی (٢٠٠٠) ی (ئۆکسفۆرد) ە کەیدا لە لاپەڕە (١٩٤) دا بە جوانی و شەو زاراوە پەروەردەییەکانی ڕوون کردۆتەوە و پێی لەسەر ئەوە داگرتوە کە education دوو مانای سەرەکی هەیە (پەروەردە، فێرکردن)، بەڵام بۆ مامۆستا، یان پەروەردەکار وشە لاتینی یە دێرینەکەی داناوەتەوە کە بریتیە لە educatoy ئەمە لێکدانەوەیەکی سەر کێڵانە بوو بۆ مانای وشەی (پەروەردە) لە زمانی ئینگلیزیدا، سەبارەت بە (فێرکردن) یش ئەوەندە بەسە کە، کە فێرکردن بەمانای (وەرگرتنی ڕەفتاری نوێ) دێت و learning شیاو ترین وشەی گونجاوە.

لە زمانی عەرەبیشدا وشەی (التربیە) لە سێ بنەڕەتەوە سەرچاوەی گرتوە، یەکەم (ربا، یربو) کە بەمانای (نما، ینمو) دێت واتە گەشە دەکات، زیاد دەکات، گەورە دەبێت (پەروەردە دەبێت)، دووەم (ربی، یربی) واتە (نشأ و ترعرع)، پەرەی سەند، نەشونمای کرد، کەوتە سەرپێ، خۆی گرت، پەروەردە بوو، پەروەردە کرا، سێهەم (رب، یرب) واتا (أصلحە، تولی أمرە، ساسە)، واتا چاکی کرد،چاکسایکرد گرتیە ئەستۆی، سیاساندی، (پەروەردەی کرد).

لەڕوی ماناو چەمکەوە (البیضاوی) دەڵێت : (التربیە) واتە گەیاندنی

شتێك به پلەی كامڵی و تەواوێتی خۆی و لە (المعجم الفلسفی) دا هەروا هاتوە، (ابن منظور) لە (لسان العرب) و (غزالی) لە (أحیاء) كەیدا بە وردی باسیان كردوە، شارەزایانی زمانی عەرەبی لەو باوەڕەدان كە (تربیە) بەكار دەهێنرێ بۆ (ناهق) یش وەك دەگوترێ (تربیە المواشی والدواجن) وە بۆ بێ گیانیش بەكار دێت، وەكو (تربیە النباتات)، بەكورتی (التربیە) لە لای عەرەب مانای بەخێوكردن و چاودێری و فێركردن دەگەیەنێت.

لە زمانی كوردیدا بڕگەی (پەر) بەخستنە پاڵی بۆ لای و شەو بڕگەی تر چەند مانایەكی نوێ وەردەگرێ و پیتی (ر) ی بچوكە، (پەر) واتایەكی (مكان) یانەی هەیە، واتە هەر شتێ (پەر) ی تێدا بێت ئەوا ئەو شتە یان ئەو ئیشو فرمانە دەبێت بوونێكی ڕەهەندیانەی (شوێن) ی تێدا بێت، لێرەدا (شوێن) مەبەست لە (بوونی جەستەیەكی بەرهەستە)، بۆ نمونە : پەروانە ئەو (پەڕ) ە یە كە بە دەوری تۆپێك یان چەقێكدا دەسوڕێتەوە، وەك پەروانەی پانكە و فڕۆكە، (پەر) بەمانای (باڵ) دێت و هەر خۆشی بوە بە یەكێك لە ناوەكانی پەپوولە. (پەر) ئەوشەی (سەرپەرشتیار) دا مانای وایە كە كاری بەدەورە دا سوڕان و چاودێری دراوەتە پاڵ كە سێك بۆ كەسێكی تر كە سەرپەرشتیار چاودێری قوتابی و مامۆستا و وانە دەكات، (پەرستیار) وەك پەروانەلە ژوور سەری نەخۆشەوەیە، (پەروەردگار) بەردەوام سەرپەرشتی گەردوون دەكات، بەم جۆرە (پەر) لە هەموو ئەو وشانەدا هەیە كە چەمكێك لە چەمكە واتاییەكانی جۆرێك لە جۆرەكانی (پەروەردە) دەگرێتەوە، جگە لەو وشانەی بێ گیان و بێ ژیرین وەك (پەردە، پەرداخ، پەرژین) ئەگەر چی لە مانەشدا (پەر) هەر مانای دەورەدان چاودێری و پاراستنە، كە لە بنەڕەتدا هەر (پەروەردە) دەگرێتەوە بۆ نمونە (پەرداخ) پەروەردە و چاودێری شلەكەی ناوی دەكات و (پەرژین) چاودێری باخ دەكات و بەم جۆرە، بە كورتی لە هەر سێك زمانەكەدا وشەی (پەروەردە) مانای چاودێری و پەردەداری و بەخێوكردن و فێركردنو ڕاهێنان و ڕێنومایی دەگرێتەوە، ئەمڕۆش پەروەردەكردن بوەتە زانستێكی سەر بەخۆ و دیاردەیەكی

مرۆڤایەتی نوێ و پێوەری شارستانێتی گەلان و پێویستی یەکەمی گەلان و هیچ گەل و نەتەوەیەك ناتوانێ درێژە بە ژیان و مانەوەی خۆی بدات بەبێ بوونی پەروەردە، چونکە یەکێك لە هۆیەکانی مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤ بریتیە لە خستنەوەی بەرەی نوێ و گواستنەوەی کولتورو زانیاری بۆ ئەو نەوە نوێ یە، جگە لە پەروەردە و فێرکردن هیچ ڕێگەیەکی تر نیە کە مرۆڤ کولتورو زانیاری و نەریتی خۆی لەبەرەو نەوەیەکەوە بگوازرێتەوە بۆ بەرەو نەوەیەکی تر کەواتە پەروەردە کلیلی دەستپێکردنی ژیان و بەردەوامبوونی گوزەران و ژیارو شارستانێتی هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی یە. لە ڕێی پەروەردەوە شارستانێتی و کەلتورو ڕەوشت و نەریتی مرۆڤەکان و کەسایەتیان دروست دەکرێت، دروستکراویش گەشە دەکات و پێش دەکەوێت، بە پێچەوانەوە ئەمر ویستت هەر گەل و نەتەوەو کە سێك لەسەر نەخشەی ژیان بسرێتەوە، ئەوا دەستکاریەکی سەلبیانەی پەروەردەکەی باشترین پەتای کوشندەیە بۆ لەناو بردن و پوکانەوە و دارمانی شترستانێتی و ڕەوشت و کولتوری گەلان.

# مێژووی پەروەردە

مـرۆڤ وەك بونـەوەرێکی بـایۆلۆژی لـە دایـك دەبێـت و وەك بونـەوەرێکی ژیرو کۆمەلایەتی دەمرێت، ئەوەی لە نێوان بون و مەرگیدا یە ناوی مێژوە.

مێژوو ئەلبومێکی پڕ لە وێنـە و یادەوەریـە، مـرۆڤ ژیـری بـەکار دەهێنـێ، کەواتە کار لێکی دوو جەمـسەر لـە نێـوان بـەرەکانی مرۆڤـدا دروسـت دەبێـت و لـە قولایی نـاو جەرگـەی مێـژودا شوێنەوارو جێ پێیـەکانی بـەجێ دەهێلێ، کارلێکە رۆشنبیریەکان هەمە جۆرو هەمە ئاراستەن.

گەشە و زۆر بون و زیندەگی و زاوزێ و پەرەسەندن، لە نیشانە دیارەکانی ژیانی مرۆڤن، لە کاروانی ڕێڕۆیشتنی هەریەکەیاندا دەبێت مـرۆڤ پێگە و شـوێنی خۆی بزانێت و لە هەریەکە لە قۆناغەکانی تەمەنیـدا هەلوێـست و ڕەفتـاری خـۆی دەربڕێـت، هـەموو جـۆرە دەربڕینێکـی ڕەفتـار گـەرایی مـرۆڤ پالنەرەکـەی پەروەردەیـە، چـونکە پـەروەردە میکـانیزمی هەلوێـستوەرگرتن و ڕەفتارگـەرایی گیانەوەرو زیندەوەرانە بەرانبەر بەو ژینگە جۆراو جۆرانەی دەوروبەریان.

مێژوو لە شوێنێك ئامادە نابێت کە مرۆڤی لێنـە بێـت، چونکە هـەرگیز مێـژوو ناتوانێـت جـارێکی تـر هـاودەمێکی تـری وەك مـرۆڤ بـۆ خـۆی بدۆزێتـەوە، چەندێك بڕوانینە گۆڕەپانە تاریکو پانوبەرینەکانی مێژوو جگە لە چالاکی (کـات) و (مرۆڤ) هیچی تر بەدی ناکەین، ڕاستە تـا ئێـستاش مـرۆڤ دیلـی دەسـتی کاتـە و نـەیتوانیوە لـە دەسـتی ڕزگـار بێـت، بـەلام تاکـە بونـەوەریش کـە لـە هـەولی خۆڕزگارکردن، ڕانەوەستاوە و چرای ئومێدی نەکوژاوەتەوە هەر مرۆڤ بووە.

لە نێوان (مرۆڤ) و (کات) دا ململانێیەکی درێژ هەیـە، ئەگـەر چـی (کـات) لە مرۆڤ کۆنترە، بـەلام تـا ئێـستا ئـەوە یـەکلایی نەبوەتـەوە و ئـاخۆ مـرۆڤ مێـژوو دروسـت دەکـات یـان (کـات)، ئایـا (کـات) و (مـرۆڤ) خۆشـیان بەرهـەمێك نـین لەبەرهەمەکانی مێژوو؟!

مێژووش وەك مـرۆڤ لـە دایکبـوە، کەواتـە قۆنـاغی منـالی و هـەرزەکاری و

پیری و مەرگیشی لە پێشە، ئەو کاتە مێژوو دەمرێت کە مرۆڤێك لە دایك دەبێت، ڕەفتارو بەرهەمی هزریەکانی مێشکی مرۆڤ لەسەر یەکتری کەڵەکە دەبن و گردۆلکەیەك دروست دەکەن، مێژووش لە ودیوی ئەو گردۆلکەیەوە هێلانەی خۆی دروست دەکات.

یەکێك لە بەرهەمەکانی مێشکی مرۆڤ پەروەردەیە، کە پێویستی ژیان و ناچاری هێناویەتە ژیانەوە، چونکە مرۆڤ ناتوانێت بەخواستی داواکاریەکانی ژینگەکەی بجوڵێنەوە ناشتوانێت فەرامۆشی بکات، کەواتە باشترین ڕێگە ئەوەیە کە لەگەڵیارێك بکەوێت و خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێ، بەم شێوەیەش دەتوانێت قەوارەی خۆی و بەرژەوەندیەکانی بپارێزێت، تاکە ڕێگەش بۆ خۆ گونجاندنی مرۆڤ لەگەڵ ژینگە و دەوروبەرەکەیدا بریتیە لە (پەروەردە)، چونکە لە ڕێگەی پەروەردەوە نەوەکانی مرۆڤ ڕادەهێنرێن بۆ خۆگونجاندنی لەگەڵ ژیانی ئێستا و ئاییندە.

بۆ هەموو کەسێکی پەروەردەیی و مامۆستایان زۆر پێویستە کە شارەزایی تەواویان هەبێت دەربارەی مێژووی پەروەردە، مێژوو ئەزمونێکی کرداریانەیە و ئامانجەکانیشی دیارن، کەواتە بەرلەوەی هەر کارێك بکەین دەبێت تەماشایەکی ئەرشیفی مێژوو بکەین و وردبونەوە و بەراورد کاریەك بکەین، مێژوو ئەگەر کوتومت وەك خۆی، خۆی دوبارە نەکاتەوە ئەوا بەلایەنی کەمیەوە زوربەی دوبارە کردنەوەکانی هاو شێوەی یەکترین، بە تایبەتی دیمەن و ڕوداوەکانی پەروەردە لە مێژوودا زۆر لە یەکتری دەچن، چونکە گەشەی پەروەردەیەکە سروشتێکی خاوی هەیە و کەرەسەکانی ڕابوردوی کە مەن، لەبەر ئەوە ڕێژەی دوبارە کردنەوەکانی زیاترە.

گرنگە مێژووی پەروەردە بە هەند وەربگیرێت لە هەموو کارێکی پەروەردەیی هاوچەرخماندا، کەڵك لە لایەنە باشەکانی وەردەگرین و پەندیش لە لایەنە چەوت و هەڵەکانی.

پێویستە تۆی پەروەردەیی بزانیت یۆنانیەکان و ڕۆمانەکان و فارسەکان و

میسریە دێرینەکان چۆن ڕوانیویانەتە پەروەردە و چ جۆرە ڕێبازو شێوازێکیان پەیڕەوکردەوە و پرۆگرام و بەرنامەیان چۆن بوە و لە ئەنجامدا دەستکەوتیان چی بووە، لێرەدا نمونەیەك دەهێنینەوە :

یەکێك لەو مادانەی لە پرۆگرامی پەروەردەی یۆنانیەکاندا بووە بریتی بوە لە ڕاهێنان و فێرکردنی قوتابی دەربارەی چۆنیەتی (وتاردان) کە ئەمە پاریدەدەرێکی باش بووە بۆ قوتابیەکە لەگەلێك ڕووکارەوە، توانای قوتابیەکەی لەم بوارانە زیاد کردوە :

١. زمانڕەوانی و بەکار هێنانی دەستەواژەی لۆژیکی و پوخت و نایاب.
٢. لابردنی پەردەی شەرم و ترس و خۆبەکەمزانی.
٣. زیاد بوونی بڕوا بەخۆبون و متمانە و خۆراگری
٤. قەبوڵ کردنی ڕەخنەی بەرانبەرەکان و کردنەوەی دەروازەی گفتوگۆ.
٥. مەشقپێکردن لەسەر کاری بەڕێوەبردن و سەرکردایەتیکردن.
٦. بایەخدان بە هونەری ئاراستەکردن و ڕێنومایی کردن.
٧. پەراوەی نوێنەرایەتی کردن و نواندن و شانۆ.
٨. بە کۆمەڵایەتیکردنێکی مەیدانیانەی نەوەکان و دەرکەوتنی توانا شاراوەکانی ناخی منالەکان و بەهێزکردنیان.

بەلام ئەمڕۆ ئەم مادەیە لە پرۆگرامەکانی خوێندندا بوونی نیە و بایەخی پێنادرێ، لەبەر ئەوە قوتابیانی ئەم سەردەمە شارەزانین لە بواری پێشەنگی و زمانپاراوی و گفتوگۆی کراوەدا، تەنانەت توانای نوسینی وتارو دارشتنیشیان نیە و شەرم و ترس و بەسەریاندا زاڵە. لە ڕووە زانستیەکەوە.

دەکرێت مێژوو بخوێنین تاکو کات بگەڕێتەوە بۆ دواوە و سوود لە ڕابوردوو وەربگرین و نەخشە بۆ ئاینده بکێشین و هەنگاوی کردارییانەی بۆ هەڵبگرین، شارەزابوون لە مێژووی پەروەردە پێویستیەکی سەرەکی مامۆستایان و پەروەردەکارانە و نابێ بە کارێکی کەم و لابەلایی تەماشا بکرێ تەنانەت زانستی پەروەردە بۆ خۆی بەرهەمی مێژووی پەروەردەیە.

لەو (٨) خاڵەی سەرەوەدا مەبەستی یەکەم (زمان ڕەوانی) واتە ئەو منداڵە هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە پەراوەی پێ بکرێت لەسەر ئەوەی چۆن چۆنی زمان و قورگ و دەنگە ژێیەکانی خۆی بەشێوەیەکی هونەری بەکاربێنێ بۆ دروستکردنی وشە ودرکەو دەربڕینەکەی، چونکە شێوازی دان پیانان بەپیت و وشەکان جوانیەکی تەواو دەدات بەبێژەو قسەکان بە ڕادەیەك کەسەرنجی بەرانبەر ڕادەکێشێ و بە جۆرێك وابەستە و کەمەندکێشی دەکات کە لە گوێ گرتن بێزار نابێ، لە ڕووە زانستیەکەیشەوە دەبێ منداڵ فێر بکرێت کام وشە بەکام واتا بۆ کام مەبەست لەکام کاتدا بەرانبەر کێ چۆن دەربڕێت، لە کوردەواریدا وتراوە : (قسە داڕێژە، دابێژە، بیبێژە) واتە : بە تەواوەتی قسەکەت تاوتوێ بکە و داڕشتەی جوانی بۆ ئامادە بکە و پاشان لە هێڵەکی بدە و بیبێژەرەوە و شەخەڵەکەی لابەرە ئەوسا بیبێژە و دەری بڕە، هەندێ کەس هەیە گەرچی کێشەی میکانیکی زمانی نیە، واتا ئامێری زمان و مەلاشوی و دەنگەژێی تەواوە، بەڵام لێزان و وەستا نیە لە بەکار هێناناو پڵتەو لارو وێری تێکەڵی قسەکانی دەبێ و بەرانبەرەکەی بەباشی لێی تێناگات، لەبەر ئەوە گرنگە منداڵ فێری بەکارهێنانی وشەو ڕستە زاراوە بکرێ لەجێ و شوێنی گونجاوی خۆیدا ئەویش بەم چەند هەنگاوە :

١. هانی بدرێت لەسەر زۆر خوێندنەوەی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە و چیرۆك و هۆنراوە و بابەتی ئەدەبی و زانستی.
٢. کۆڕوسیمینار بگرێت بۆ ئەندامانی خێزان و هاوپۆلەکانی لە قوتابخانەدا و گفتوگۆو ڕەخنەسازی فێر بکرێت، بازنەی هزرو بیری فراوان بکرێت بە هاندانی بۆ شیکارکردنی چەندین پرسیاری بیرکاری و مەتەڵ و ژمارەوانی.
٣. ببرێت بۆ کۆڕوسیمیناری کەسانی گەورە و کۆبونەوەی کەسانی شارەزاو بە حیکمەت و دانا لەسەنتەرو ڕێکخراوە ئەدەبی و ڕوناکبیریەکان.
٤. فێر بکرێت کە بە کرداری کۆڕو گفتوگۆی کراوە ئەنجام بدات و لێکۆڵینەوە لەسەر بابەت و تەوەرێکان بکات و فێر بێت ئەنتەرنێت و

سەرچاوەی تـر بـەکاربهێنیّ، وتـار بخوێنێتـەوە بـۆ خـەڵکێکی زۆرو پاشـان لەبەر وتار بڵێت.

٥. فێـری ئـەوە بێـت کـە پرسـیار لەسـەر هەشـتێك بکـات کـە چـاوی پێـی دەکەوێت و لەلای ڕوون نیە، تاکو هیچ شتێك نەمێنێ کە بەلایەوە نـامۆ و ئالۆزو نەزانراو بێت.

٦. فێری بکە کە شارەزا بوون و مێشك پڕ بوون لە زانیاری و زانست باشترین سـامان و دەسـتکەوتە بـۆ مـرۆڤ، با لەگـەڵ هـاوڕێ و کەسـانی گـەورەدا پێشبڕکێ بکات بۆ زانایی و شارەزایی زیاتر.

سەبارەت بە خاڵی دووەم (شەرم و ترس و خۆبەکەمزانی) نابێ ببنە سیفەتی منداڵ، چونکە شەرم ڕێ لەوە دەگرێت کە شتەکان لەناخ و سینەی خۆیدا کەڵەکە دەکات و ئالۆزیان دەکات و هیچ پرسیارێکیش لەکەس ناکات لەو بارەیەوە، بۆیە سینەی پڕ دەبێ لە پرسیارو وەڵامەکانیشیان نازانێ چونکە بەهۆی شەرمەوە ڕووی نایات بپرسێت، منالیش ئەگەر پرسانە بێت دانا نابێت، مرۆڤ کە شەرمی کرد بە دڵنیایی یەوە دەشترسێت، چونکە زانیاری تەواوی دەست نەکوتوە دەربارەی پرسیارەکانی ناخی خۆی، کەواتە لە دۆخێکی دڵ ئارامیدا نا ژی و هەست بە جۆرە ترسێك دەکات، بێگومان مرۆڤی شەرمن و ترسنۆك هەر دەبێ خۆی بە کەم بزانێ، لە ڕاستیدا (کەمە) چونکە کە مایەتی لە زوربەی شتەکانیدا هەیە، لە ژێر گوشاری شەرم و ترس و خۆبەکەمزانیدا تەریق دەبێتەوە و متمانەی بە تواناکانی خۆی نابێت و بڕیارەکانی بە دەست خۆی نابێ و هەمیشە خۆی بە پاشکۆی کەسانی تر دەزانێ و ناتوانێت هیچ جۆرە ئەرك بەرپرسیارێتیەك بگرێتە خۆی، تەنانەت بەرپرسیارێتی و جڵەو گیری و سەرکردایەتی خودی خۆیشی پێ ناکرێت.

بەم جۆرە ئەو هەشت خاڵە و هی تریش دەستکەوتی ئەو منالە دەبێت تەنها بەوەی کە فێری (وتار دان) بکرێت و مەشقی پێ بکرێت، یەکەمین سیفەت کە تیایدا گەشە دەکات زیاد بوونی متمانەیەتی بەخۆی کە ئەوەش دەیکاتە سەرکردە

له ئاینده‌دا.

به‌سه‌ر کرده کردنی منداڵیش واته (به پێشه‌نگ کردن) ی به جۆرێکی ئه‌وتۆ که ئه‌و منداڵه هه‌وڵ ده‌دات هه‌میشه له پێشبڕکێ و پێشه‌نگی یه‌که‌میدابێ و متمانه‌ی به خۆی و تواناکانی هه‌بێت و له هه‌وڵی به‌رده‌وامی داهێناندابێت.

هه‌میشه ئه‌و منداڵانه ده‌بنه سه‌رکرده‌که گوڕی متمانه به‌خۆ بونیان به‌هێز کراوه و هان دراون و بارودۆخیان بۆ ڕه‌خسێنراوه. به‌ده‌گمه‌ن مرۆڤی ترسنۆك و شه‌رمن ده‌بێته سه‌رکرده و پێشه‌نگ.

# تایبەنمەندێتیەکانی پەروەردەی بەرایی

هەر لەگەڵ دروستبوونی خێزاندا، چەند شتێکی تریش هاتنە ئاراوە کە دەبنە مایەی مانەوە و پاراستنی خێزان، لەو کاتەوە کە دایك یەکەم دڵۆپە فرچکی شیری بە دەمی کۆرپەکەیدا کردوە، جۆرە هەستێکی بەرپرسیارێتی ئاراستە یشیی تێدا دروست بووە بەرانبەر بە کۆرپەکەی، لە وانەش چاودێریکردنی باری جەستەیی و تەندروستی منداڵەکەی و دورخستنەوەی لەسەرماو گەرما و گریان، ئەمانەش چەند کارێکی بەخێوکارین، بەڵام بەشێوە گشتیەکەی گرتنە خۆو بەخێوکردن کارێکی پەروەردەیین.

لە کۆمەڵگە دێرین و بەراییەکاندا مرۆڤ مومارەسەی کاری پەروەردەی کردوە، بەڵام ئەم پەراوە و پەیڕەوکردنە ستایلێکی نەگۆڕو ئەکادیمی نەبوە، لەسەر دەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی ترو تەنانەت لە خێزانێکەوە بۆ خێزانێکی تر گۆڕاوە، سەرۆکی خێزان لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە ئەوەو منداڵەکانیان کوتومت وەکو خۆیان بن، هەڵگری هەمان نەریت و ڕۆشنبیری بن کە لەناو خۆیاندا باوی هەبووە، تەنانەت تا ئێستاش ئەم نەریتە لەناو هەندێ گەل و هۆزدا باوی ماوە.

لە چاخە دێرینەکاندا پەروەردە زیاتر کارێکی پراکتیکیانە بووە کە میزاج بەسەریا زاڵ بووە، میزاجی مرۆڤەکانیش پابەندی ڕەزامەندی دەوروبەریان بووە، واتە لادان لە نەریتی هۆزو تیرە ڕیسوایی و شەرمەزاری و دەرکردنی بەدواوە بووە،، بۆ نموونە لە ناو عەرەبەکانی دورگەدا وا باو بووە کە بوونی منالّی کچ لە خێزاندا شەرمەزاریە، لەبەر ئەوە دیاردەی لەناو بردن و زیندە بە چاڵکردن و فرۆشتنی کچان سەری هەڵدا، کەواتە کاتێك نەریت تێکەڵی خوێنی مرۆڤ دەبێت، ژیری دەوەستێت و گەشە ناکات، بەمەبەستمان لە نەریتە سەلبیەکانە.

کۆمەڵگە دێرینەکان دابڕاونەبوون لە پەروەردە، بەڵام ئایا جۆری

پەروەردەکەیان ڕاست بووە یان هەڵە ئەمەیان باسێکی ترە.گرنگ ئەوەیە پەروەردە بوونی هەبووە، زیاتر لەمەش پەروەردە سروشت و تایبەتمەندێتی خۆی هەبووە، دیارترین تایبەتمەندێتیەکانیش ئەمانەن :

١. پەروەردە و دەسەڵاتی پەروەردەیی، دابەشکرا بوون بەسەر چەند کەسێکی دیاریکراودا، ئەوانەش بریتی بوون لە سەرۆك هۆزو تیرەکان و پیاوی ماڵ و دایك وەك پاشکۆو کارەکەری بەردەستی باوك سەیر دەکرا و خاوەنی خۆی و بڕیاری خۆی نەبووە، بەڵام کۆمەڵگەی وا هەبوو، بەپێچەوانەوە بوو ژن تیایدا باڵا دەست و دەسەڵاتداربوو، لەو کۆمەڵگە بەراییانەدا ئۆرگان و دامەزراوەی پەروەردەیی و فێرکاری نەبوو، بەڵکو منداڵان و هەرزەکاران بەشێوەی لاساییکردنەوەی گەورەکان فێری هەندێ شت دەکران، وەك ئەسپ سواری و تیربازی و زۆرانبازی و مەلەکردن و.... هتد.

٢. پەروەردە کردن پلەدارو قۆناغدارو بوو، تەمەنی منداڵەکە بڕیاردەر بوو لەسەر ئەو شێوە پەروەردەیەی کە بەسەریا جێبەجێ دەکرا، هەنگاوی یەکەمی منداڵ فێرکردنی بوو بەوەی کە چۆن خۆراك و بەروبومی کشتوکاڵی کۆ بکاتەوە و ئاودێری ئاژەڵداری و شوانی بکات لە کۆمەڵگە کشتوکاڵیەکاندا، قۆناغەکانی دواییش بریتی بوون لە خۆڕاهێنان لەگەڵ ژیانی پیری و خانەنشینی و کەفتەکەوتەیی دا و کۆتاییەکەیشی بەمەرگ دەهات، ئەم جۆرە پەروەردەیە شتێکی تازەی نەدەهاتە سەر، بەڵکو بەردەوام دوبارە ئەبوەوە و ئەوەو بەرەکان بە هەمان شێوە سستمی پەروەردە و فێرکردنیان دەگواستەوە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان.

٣. پەروەردە تەنها لاساییکردنەوەی گەورەکان بوو، سەرۆکی هۆزو گەورەکانی خێزان چیان بکردایە و چۆن ڕەفتاریان بکردایە، منداڵەکانیشیان وەکو ئەوانیان دەکرد، ئەم کارەیان بە پیرۆز دەزانی و وەك ئەرکو کارێکی ڕۆژانەی پێویست دەیانکرد.

تا ئێستاش ئەم خاڵانە ڕەگوڕیشەیان لەناو پەروەردەی هاوچەرخدا هەرماوە،

بەلاّم شێوە و شێوازەكەی گۆڕاوە بۆ نمونە تا ئێستاش پەروەردی كردن بەسەر چەند كەسانێكی دیاریكراودا دابەش كراوە و هەموو كەسێك مافی پەروەردەكردنی نیە، لە پێكهاتەی حكومەتەكانی ئەم سەردەمەشدا وەزارەتێك تایبەت كراوە بۆ پەروەردە، كە مامۆستایان و شارەزایانی بواری پەروەردەی تێدا كۆبوەتەوە، ئەم وەزارەتە خاوەنی یەكەمی پەروەردەیە و بەرپرسە لە دانانی پرۆگرامی پەروەردە و فێركردنی نەوەكان و شێوازەكانی پەیڕەوكردن و گەیاندنی ئەو پرۆگرامە و ئامادەكردنی مامۆستایان بۆ پەروەردە، كەلە ڕاستیدا دەبوایە كاری پەروەردەی كردن تەنها نەبەسرێتەوە بە یەك وەزارەتەوە، بەڵكو كاری پەروەردەیی كاری هەموو مرۆڤێكە كە تەمەنی (١٨) ساڵی تێپەڕاند بێت، وە دەبوایە پرۆگرامی پەروەردە تەنها لە چوار چێوەی ئۆرگانە فەرمیەكاندا نەبوایە بەڵكو خێزان و كۆمەڵگەیش بگرتایەوە بە شێوەیەكی تەوزیعی و تۆبزی.

تا ئێستاش پەروەردە پلە و قۆناغی هەیە، ئەوەیان خەسڵەتێكی باشە، بەلاّم ناباشیەكەی لەوەدایە كە پەروەردە و فێركردن تەنها لە سنوری قوتابخانەكاندایە كە سەر بە وەزارەتی پەروەردەن واتە خێزان و ئەندامانی خێزان و خەڵكانی ناو چین و توێژەكانی تری كۆمەڵگە لە پەروەردە دابڕاون و هیچ پرۆگرامێكی پەروەردەی فەرمی بۆ ئەوان نیە، لە كاتێكدا زوربەی كاریگەری پەروەردەی نەوەكانمان لە قولایی كۆمەڵگە و جەماوەردایە.

پەروەردە لەسەردەمە كۆنەكاندا لاساییكردنەوەی گەورەكان بوو ـ ئێستاش تارادەیەك ماوە، بەلاّم بە گۆڕانی پرۆگرام و كاریگەری گەشەی كۆمەلاّیەتی و تەكنۆلۆژی تا ڕادەیەك نوێگەری لە ئارادایە.

هەر چەندە پەروەردەی كۆمەلاّتیانەی جەماوەریی هەر وەكو خۆی ماوەتەوە و چاولێكەری و لاساییكردنەوەی نەوەكان بۆ گەورەكانیان بوونی هەیە و كاریگەری زۆری لەسەر ڕەفتار و ئاڕاستەی پەروەردەیی نەوەكان هەیە بەلایەنی هەموارو نا هەمواردا، واتا تاكو ئێستاش كلیل بەدەستەكانی پەروەردە گەورەكانی ناو خێزانن بەبێ ئەوەی وەك پێویست لە پەروەردە بزانن، سەرەڕای گرفت و

کێشە کۆمەڵایەتیە هاوچەرخەکان و نەخۆشی و دیاردە دزێوە دەروونیەکان لێرەوە دەست پێ دەکات، چونکە بەخێوکارانی نەوەی نوێ هەر وەکو لە بواری بەخێوکردندا شارەزایەکی ئەوتۆ نین، هاوکات لە بواری پەروەردە و گۆشکردنی نەوەکانیشدا کەم توانا و کەم زانستن، سەرەنجام نەوەیەکمان خستۆتەوە کە نەکوت و مت وەکو خۆمانن و نەکوت و مت وەکو خۆیانن، بەڵکو لە نێو ململانێی دووفاقی و دوو کەسێتیدا دۆش داماون، ڕازی نابن کە ئاوڕ بۆ دواوە بدەنەوە و تەکانیش بەخۆیان نادەن کە بۆ پێشەوە بڕۆن، چونکە ئامادە نەکراون بۆ بەرەو پێشچونێکی دروست و بەجێ و هاوچەرخانە، لەوەش نەوەی بەخێوکارو گەورەکەسان بەرپرسیارن.

# پێویستی بوونی پەروەردە

پەروەردە پرۆسەیەکی چارەنووسازی مرۆڤایەتیە، هەریەکە لە تاکو کۆی کۆمەڵگەی مرۆیی پێویستیان پێی هەیە، یەکێك لەو هۆکارانەی نەژادی ئادەمیزادی لە سەرزەویدا پاراستوە و گەشەی بەهۆش و ژیری داوە پەروەردەیە، مرۆڤ و ژینگەکەی دەوروبەری لە ململانێو ئاشنایەتیدا دژو دۆستن، ئەو پارسەنگە مەعنەویەی ئەم بارە هاوسەنگ دەکاتەوە و لەنگەری پێ دەگرێت بریتیە لە سستمی پەروەردە، دیارە ئەو سستمەش لە بنەڕەتدا هەڵقولاوی هزرو بیرێکی مرۆییانەیەو و پراکتیزەکراوە لە پێناوی مانەوەی جۆری مرۆیی لە سەر زەویدا پاراستنی جۆریش تەنها بە مانەوەی چەندێتی یەوە بەند نەکراوە، بەڵکو لە و بوارەدا چۆنیەتیش دەوری خۆی هەیە بێگومان (چۆنایەتی) لە بارێکی نەگۆڕدا نیە، بەڵکو پەیتا... پەیتا..... لە گۆڕاندایە، چۆنیەتی تێگەیشتنی مرۆڤ لە خودی خۆی و ئەو گەردوونە فراوانەی دەوروبەری وەك میلی کاتژمێر هەر چرکەیەك لە شوێنێکدایە، ئێستا مرۆڤ بە جۆرێك تێدەگات و ڕەفتار دەکات، سبەی بە جۆرێکی تر، ئەم گۆڕانی جۆرایەتیە هەڕەمەکی و بێ بەرنامە نیە، بەڵکو کۆمەڵێك هاندەر والە مرۆڤ دەکەن لە گۆڕانی بەردەوامدا بێت لە پێناوی درێژەدان بە مانەوەی ژیانی بەردەوامی خۆی، ئەو بۆشاییەی کە دەکەوێتە نێوان (بیرکردنەوە لە گۆڕان) و (کرداری گۆڕان) بریتیە لە پەروەردە، چونکە تەنها پەروەردە دەتوانێت مرۆڤ بسازێنێ بۆ گۆڕان لە ڕێگەی بیرو هۆشەوە.

کاری پەروەردەیە کە ناخی مرۆڤ بدوێنێ گەشە بە خواست و ئارەزووەکانی بکات، ئاراستەی بکات ڕەفتارە پەسەندو ناپەسەندەکانی بۆ لە یەکتری جیا بکاتەوە مەشقی تەواو بەو کەسە بکات کە خولیای مانەوەیە، ژیان بەبێ ئامانج نیە، ئامانجەکانیش بەسەر مرۆڤدا دانابارن، بەڵکو مرۆڤ دوایاندەکەوێت و بۆیان سەردەکەوێ دواکەوتن و گەیشتن بە ئامانجەکان دەبێت لە ڕێگەیەکی ڕوون و دیارەوە بێت، تاکە ڕێگەی ڕوون و ئاشکراش کە (ژیان و

ئامانجەکانی) بە یەکەوە دەبەستێتەوە پەروەردەیە، دیارە لێرەدا مەبەستمان لە پەروەردەی گشتیە، تەنانەت ئەو کەسەی کە ڕەفتاری لە کۆمەڵگەدا دزێو و خراپە و بیر لە خۆکوژی دەکاتەوە، ئەوەش دیسانەوە هەر دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردە، بەڵام جۆری ئەو پەروەردەیە نا هەموارە، ئەمەیان باسێکی ترە.

فەلسەفەی ژیانی کۆمەڵایەتیانەی خەڵك هەندێك یاساو ڕێسا و نەریت بەسەر تاکی کۆمەڵگەدا دەسەپێنێ، کە ئەمانە لەبەر زەوەندی مرۆڤدان، کەواتە دەبێت ئەو تاکەی کۆمەڵگە هەڵگرو پەیڕەوکاری ئەو یاسایانە بێت، دیارە ئەوەش دوای قاڵ بوون دەبێت، قاڵ بوونیش لە ئەنجامی پەراوەو مەشق و شارەزا بوونەوە دەست دەکەوێت، پەراوە و مەشق پێکردن و شارەزا کردن فێرکردنن، فێرکردنیش جەوهەری کاری پەروەردەیە.

بوونی پەروەردە بۆ (تاك) ی کۆمەڵگە بایەخی خۆی هەیە و بۆ (کۆ) ش بایەخی تری هەیە، سەرەتا بۆ تاك ئەم بایەخانەی هەیە :

١. کولتوری ڕۆشنبیری گەلان، بەرهەمی سەرجەم تاکەکانی گروّی مرۆڤایەتیە و کات و وزەیەکی زۆری تێچووە تاکو گەیشتۆتە ئاستی ئەمرۆی، نەوەکان پشتاو پشت ئەم کولتورە وەردەگرن و دەیگوازنەوە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان ئەو ڕێگەیەی کە کاری گواستنەوەی کولتورەکەش دەکات تەنها پەروەردەیە، کەواتە پەروەردە پێویستیەکی گرنگی ژیانی تاکە کەسە.

٢. بە چکەی مرۆڤ لە ماوەیەکی کەمدا ناتوانێت فێر بێت، بەڵکو بە درێژایی ژیانی لەناو سنوری پەروەردەدا وەردەگرێ و دەبەخشێ، پەروەردەش میکانیزمی گواستنەوەی زانیاریەکانە لەبەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی تر، کەواتە فێربوون یەکێکە لە پێویستیە ڕۆژانە یەکەمینەکانی مرۆڤ بەم پییە پەروەردە دەبێتە یەکێك لە پێویستیەکانی ژیان بۆ بەچکەی مرۆڤەکان.

٣. ژیانی مرۆڤ ژیانێکی پڕ لە ئاڵۆزی و گۆڕانی بەردەوامە، کەواتە ستایلی

ژیـانی مــرۆڤ لــە گۆڕاندایــە و دەبێــت هەمیــشە لــە گەشــەکردن و فراوانبووندا بێت، فراوانبوون و گەشەکردن واتە خستنە سەری زانیاری نوێ، ئەمەش دیسانەوە کاری پەروەردە و فێرکردنە، ئەمانـە سێ گرنگی بوون و لەو گرنگیانـەی کـە پـەروەردە پێویـست دەکـەن لەسـەر تـاك، جا لەبەر ئەوەی (کۆ) بریتیە لە چەند دانەیەك لە تاکەکان، کەواتـە هـەمان گرنگی بـۆ (کـۆ) ڕاسـتە، لەسـەروو ئەمەیشەوە دوو خـاڵی تـر پێویـستی هەبوونی پەروەردە بۆ (کۆ) دەردەخەن :

١. میکانیزمێکە بۆ پاراستنی کولتوری ڕۆشنبیری گەل و نەتەوەکان، ئەویش بەفێرکردن و ڕاهێنانی نەوە تازەکانیان لەسەر ئـەو بەرهەمـە هزریانـەی کە هەیانە، واتە پەروەردەکردن و فێرکردن.
٢. پشتیوانکردن و فراوانکردنی کولتوری ڕۆشنبیری گـەل و نەتـەوە، دەبێـت پـەروەردە بـەردەوام خـەریکی بـژارکردنی ئـەو کولتـورە بێـت و هەرچی شـتی خـراپ و نەشـیاوە لایبـەرێت چـونکە ئەگـەر کولتـور ناوبـەناو بژارنـەکرێت ئـەوا شـەخەڵ و پیـسیەکی زۆری لەسـەر کەڵەکـە دەبێـت و بەکـەڵکی پـەیڕەوی نـەوەی نـوێ نایـات، بـەڵام پـەروەردە ئـەو بـژارە بەردەوامە دەکات، کەواتە بوونی پەروەردە پێویستە بـۆ ژیـانی تـاك و بـۆ ژیانی کۆ.

لەم سەردەمەدا پەروەردە وەك پیشەیەکی فراوانی لێهاتوە و بوەتە ئۆرگانێکی بەرهەمهێن، جگە لەمەش مرۆڤی نەخوێندەوار ناتوانێ لەم ڕۆژگـارەدا وەك جـاری جاران ژیانی خۆی مسۆگەر بکات، چونکە شێوەی ئێـستای دەوڵەتـداری شێوەیەکی دامـەزراوەیی و وسـستمگەرایی هەیـە. ئەمـەش پێویـستی بـە پـسپۆڕی و شـارەزایی ئەکادیمیانـە هەیـە، تەنانـەت ئـەمڕۆ بـەو کەسـانەش دەگـوترێ نەخوێنـدەوار کـە شارەزای کۆمپیوتەر نین.

مـەرج نیـە هـەموو کەسـێکی خوێنـدەوار شـارەزای پـەروەردە بێـت، یـاخود سـەرکەوتوو بێـت لــە پەروەردەکردنــدا، بــەڵکو کــاری پــەروەردە کــارێکی

پراکتیکیانەیەو بریتیە لە باش گۆشکردن و ڕاهێنانی نەوەی نوێ لەسەر زمانپاکی و دەرونپاکی و ڕەوشتبەرزی و ڕەفتار پاکی و خوێندەواری، بە جۆرێك کە نەوەی نوێ سوودمەند بێت لەو پەروەردەکردنەی کەلە منداڵیەوە لەسەری گۆشکراوە و پەروەردە کراوە، زۆر ئاسایی یە کە کەسێکی نەخوێندەوار سەرکەوتوو تر بێت لە کەسێکی خوێندەوار لە پەروەردەی منالّەکانیدا، واتا خوێندەواری و بڕوانامە پێوەر نین بۆ بڕیاردان لەسەر پەروەردەکردنێکی ڕاست و دروست، بەڵکو زیاتر هۆشیاری و خەمخۆری و بەدواداچوون و دڵسۆزی و ڕاستگۆیی لە کاری پەروەردە دا دەور دەبینن، هەوێنی ڕاستەقینەی پەروەردە ئەوەیە کە خێزان و مامۆستا مرۆڤی باش پێبگەیەنن و پێشکەشی کۆمەڵگەی بکەن، جا لەبەر ئەوەی خوێندەواری هۆکارێکی باشە بۆ ئەوەی سوود لە ئەزموونی نوسراوی کەسانی پێشووتر وەربگریت لە ڕووی زانست و هونەرو شێوازو کولتوریانەوە.

# مەبەستەکانی پەروەردە

یەکێك لە و بابەتە سەرەکیانەی کە زانستی پەروەردە بایەخی زۆری پێدەدات و لێی دەکۆڵێتەوە بریتیە لە (مەبەستەکانی پەروەردە)، کەلێرەدا بەکورتی ئاماژەیان پێ دەکەین :

لەو ڕوانگەیەوە کە مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، هەر زوو تاکەکانی کۆمەڵگەی مرۆیی هۆگرو تێکەڵی یەکتری دەبن و لەو تێکەڵبوونەوە زانیاری ئاڵوگۆڕ دەکەن و فێری شتی نوێ دەبن، کارای یاریدەدەریش لێرەدا بریتیە لە زمان، واتە مرۆڤ توانایەکی لۆژیکی و قسەکردنی تێدایە و دەتوانێت وێنای چەمکەکان بە (بێژەو درکە) دەربڕێت و کۆئەندامی دەمارو هەستیشی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ نەوەیەك نەوەی دوای خۆی فەرامۆش نەکردوەو هەمیشە سستمێکی پەروەردەییان بۆ نەوەکانی دوای خۆیان بەجێ هێشتووە، کە ئەو سستمە پەروەردەییەش نەك تەنها مەبەستێك بەڵکو چەند مەبەستێکی هەبووە کە زوربەیان ڕوون و ئاشکران، تامەبەستەکان دیار نەبن مرۆڤ ناتوانێ سستمێکی پەروەردەیی بەڕێ بکات لەسەر بنەمای نەخشەیەکی ورد، لێرەوە گرفت و کێشە کۆمەڵایەتیە گشتی و تایبەتیەکان سەر هەڵدەدەن، چونکە (مەبەست و چێژو توانا) دەبێت هاو گونجاوی یەکتری بن، ئەگەر وانە بوو ئەوا پشێوی و ئاڵۆزی لە نێوان خێزان و تاکو کۆمەڵگە دا دروست دەبێت، بۆ نموونە : تۆ کام مەبەستت هەیە؟ چ جۆرە چێژوو سوودێك لەو مەبەستە وەردەگریت؟ ئایا بڕی ئەو توانایەت لەبەر دەستدایە کە تۆ بگەیەنێ بەو مەبەستە لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا؟ مەبەستە پەروەردەییەکان وەڵامی ئەم پرسیارانەت بۆ ئامادە دەکات، مەبەستەکانی پەروەردە لە گۆڕاندان بەپێی چەندکارێکی رێك، لەوانەش جیاوازی کۆمەڵگاکان و ئاست و پلەی پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگایانە و ئەو باردۆخە کۆمەڵایەتی و ئاینی سیاسیانەی  کە فەرمانڕەوایی ئەو کۆمەڵگەیە دەکەن، هەر لەبەر ئەمەیشە کە شارەزایانی بواری پەروەردە و مامۆستایان بیرو ڕای جیاواز و شێوازی هەمە جۆریان هەیە دەربارەی پەروەردە، بۆ نموونە : مەبەستی پەروەردە

لە وڵاتی چین بریتی بووە لە پێگەیاندنی سەرکردە و بۆ ئەم مەبەستەش ئامادەکاری تەواویان ساز داوە لە پرۆگرامی پەروەردەکەیاندا، بەڵام مەبەستی پەروەردە لەلای میسریە کۆنەکان مەبەستێکی ئاینی بووە، هاوکات مەبەستی دنیایشیان هەبووە کە پێگەیاندنی کادرو مامۆستای شارەزا بووە لە بوارەکانی پزیشکی و هونەرە جوانەکان و ئەندازیاری و نووسەری. بەم پێیە ڕەهەندی مەبەستە پەروەردەییەکان لێرەدا چەمکێکی (پەروەردەی ڕەوشتی کۆمەڵایەتیانە) ی هەیە، ئادەمیزاد وەکو تاك و وەکو (کۆ) دەبەستێتەوە بەمەسەلە میتا فیزیکیەکانەوە، واتا کاری پەروەردە دەکەنە کارێکی ڕۆحی بۆ ئەوەی بە نەمری بمێنێتەوە.

کەواتەمەبەستە پەروەردەییەکان ڕۆڵێکی زۆر گەورەتر لە خۆیان دەبینن، شێوازی پەروەردە هەر چۆنێك بێت کۆمەڵێك مەبەست دەپێکێت، بەڵام کاری ڕاست ئەوەیە بەر لە پراکتیزەکردنی پەروەردە مەبەستەکان دیاری بکرێن، تاکو ڕێگەوی گەیشتن بە ئامانجە پەروەردەییەکان نزیك بکەینەوە، ئەوەش ئیشێکی باشە کە مەبەستەکان ئاوێتەوەی ڕۆح و ویژدان بکرێن، مەبەستەکانی پەروەردە لە ناو هەر گەلێکدا و لەهەر سەردەمێکدا چەشن و جۆرێك بوون، مەبەستی پەروەردە لە ئەسینا ئامادەکردنی مرۆڤ بوو بۆ مرۆڤ خۆی واتە مرۆڤی والێدەکرد کەلە هەوڵی خۆ پێگەیاندنندا بێت لە ڕووی ژیری و جەستەوە، بەڵام لە (ئەسپارتە) مەبەستەکانی پەروەردە بریتی بوون لە پێگەیاندنی پیاوی مەیدان و جەربەزە و ماسولکەپان و زەبروەشێن و زمانپاراو، هاوکات عەقڵی فەلسەفیانەی کۆمەڵایەتی وڵاتیش ڕۆڵی هەیە لە دیاریکردنی مەبەستە پەروەردەییەکان، ئەگەر چی فەلسەفە پەروەردەییەکان جیاوازو هەمە جۆرن، هەموویان لە یەك چەقدا یەکتری دەگرنەوە کە، ئەو چەقەش، چەقی گەردوونە (واتە مرۆڤ).

فەیلەسوفەکان مەبەستی پەروەردەیان لە چەند ڕوویەکەوە بینیوە هەندێکیان لەو باوەڕەدا بوون کە مەبەست لە پەروەردە پەروەردە کردنی ژیری مرۆڤە، بەڵام هەندێکیان پێیان وایە مەبەستەکە پەروەردەی جەستەیە یاخود

ڕەوشت و ڕەفتارە، لە ڕاستیدا مەبەستی سەرەکی پەروەردە بریتی یە لە گەیاندنی ژیری و ژیانی مرۆڤ بە ئاستی تەواوێتی ڕەها، جا لەبەر ئەوەی (پەروەردە) هۆکارێکە بۆ گەیاندنی مرۆڤ بەمەبەستەکان و پەروەردەش بەردەوام لە گۆڕاندایە کەواتە مەبەستەکانیش دەگۆڕێن، ئەمرۆ لە هەرێمی کوردستان مەبەستەکانی پەروەردە بریتین لە بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندەواری خەڵك و ڕاهێنانی بەشێك لەوان لەسەر پیشەی پەروەردە و فێرکردن، کە ئەمە بەس نیە، بەڵکو پێویستە جگە لەو دوانە مەبەستی تریشی تێدا بوایە وەك پەروەردەی ژیری و و هۆشیارکردنەوە و بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و سیاسی، هاوکات مەبەستی وەبەرهێنانی کشتوکاڵی و پیشەسازیشی تێدابوایە، تاکو نەوەی داهاتوو کادرو شارەزا بن لە بواری بوژاندنەوەی ئابوری ولات و کشتوکاڵ و بازرگانی و پیشەسازی دا، چونکە ولاتمان لەسەرەتای بوژانەوەو ئاوەدانیدایە، دەبێ تاکەکانی کۆمەڵگە بۆ ژیانی هاوچەرخ و ڕۆژگاری داهاتوو ئامادە بکرێن، مەبەستە پەروەردەییەکان دوو جۆری سەرەکین : مەبەستە تاکە کەسیەکان و مەبەستە کۆ گشتیەکان، لە یەکەمیاندا (تاك) سەنتەری سەرەکی پەروەردەیە و لە دووەمیاندا (کۆ) ئەمەش گفتوگۆ و تیۆری پەروەردەیی زۆریان لەسەرەو لە هەندێ جاردا (تاك) تەواوکەری کۆیە و لە هەندێکی تردا دژ بە یەکترین.

# دوو جۆرە مەبەستەکانی پەروەردە

مەبەستە پەروەردەییەکان دوو جۆری سەرەکین لە ڕوی کاریگەرییان بۆ سەر مرۆڤ مەبەستە تاککەسیەکان و مەبەستە کۆ کەسیەکان، بۆ هەر یەکەیان کۆمەڵێك زانا و لایەنگر هەیە، هەر یەکەشیان بەڵگەی تەواویان هەیە بۆ پشتڕاستکردنەوەی بۆ چوونەکانیان، لایەنگرانی پەروەردەی تاککەسی لەو باوەڕەدان کە (تاك) سەنتەرو بناغەی سەرەکیە لە کارو کرداری پەروەردەدا، لەبەر ئەوە دەبێت بایەخی تەواو بدرێت بە تاك لە ڕووی گەشە پێدانی (ژیری، جەستە، ڕەفتار) ە وە، هەلگرانی ئەم جۆرە مەبەستەی پەروەردە لەو باوەڕەان کە پەروەردە لە هۆکارێك بەو لاوە هیچی تر نیە بۆ گەشەپێدانی منداڵ و ئامادەکردنی بۆ ژیانێکی باشتر.

هەریەکە لە جۆرە مەبەستەکان نا تەواوی و کەموکوڕی خۆی هەیە، ئەو ڕەخنەیەی کە ئاڕاستەی ئەم جۆرە دەکرێت ئەوەیە کە (کۆ) لە پێناوی (تاك) دا فەرامۆش دەکرێت، دیسانەوە بەرپەرچی وەڵامیان بۆ ئەم ڕەخنەیە ئەوەیە کە دەڵێن وەزیفەی (کۆمەڵ) ئەوەیە کە چاودێری بەرژەوەندیەکانی تاك بکات، پەروەردەی تاککەسی مشوری تاك دەخوات لەو کاتەدا کە (کۆ) بوەتە دیکتاتۆری مەیدان و گۆڕەپانی پەروەردەی بۆ خۆی قۆرخ کردەوە.

مەبەستە کۆ کەسیەکانی پەروەردەش لەو باوەڕەدان کە ڕێگەی سەرەکی پەروەمردەکردن بریتیە لە پەروەردەی کۆ کەسی و دەڵێن کە پەروەردەی تاکەکەسی لەوە بەولاوە هیچی تر نیە کە هۆکارێکە و ڕێگەیەکە بۆ چاکسازیکردن و پەروەردەی کۆمەڵ، ئەمانە (تاك) بە گرنگ نازانن و بە پێچەوانەوەیشەوە (کۆمەڵ) یان لە لا هەموو شتێکە، تاك بەلای ئەوانەوە پارچەیەکی بچوکە و بوون و نەبوونی وەکو یەك وایە، بەڵام کۆمەڵ دایکە، گشتیە، باڵایە، سەرورە، خاوەنی گۆڕەپانی پەروەردەیە، (تاك) هیچی لە دەست نایات مەگەر تەنها ئەوە نەبێت کە خۆی لەناو کۆمەڵدا بتوێنێتەوە و وزەو بڕست و توانای مانەوەی خۆی لە

کۆمەڵەوە وەربگرێ، ئەوانەی هەڵگری بیرۆکەی مەبەستە پەروەردەییەکانی تاکن ڕەخنەیان لە هەڵگرانی مەبەستە کۆیەکان هەیە و دەڵێن (کۆ) لە ئەنجامی کەڵەکە بوونی (تاك) ە وە دروست دەبێت، کەواتە (کۆ) جگە لەوەی لە تاك دروست بووە، هاوکات ناشتوانێت دەستبەرداری تاك ببێت، بەم جۆرە هەریەکە لە هەڵگرانی مەبەستە پەروەردەییەکان بیرو بۆ چوون و تیۆرو بنەماو پێگە و میکانیزم و سستمی تایبەتیان هەیە بۆ پەیڕەوکردنی بیرۆکە کەیان و بەرگرکردن لە هزرو بیریان، ئەم دوو جۆرەش بەردەوام لە ململانێدان و هەریەکەشیان کاری خۆیان دەکەن و سودو بەرژەوەندیەکانیش دەڕژێنە کاسەی سوود وەرگرتن و گەشەی کردنی پەروەردەی مرۆڤ بەشێوەی گشتی و کۆ بێت یان بەشێوەی تاکە کەسی بێت.

باشترین ڕێگەی گونجاو وشیاو ئەوەیە کە مەبەستە پەروەردەییەکان بە تاکو کۆ پێکەوە بخرێنە کار، نابێ هیچ لایەکیان بۆ لایەکەی تر فەرامۆش بکرێ، بۆ نمونە : لە سستمی جارانی پەروەردەی عێراقدا تەنها مەبەستە پەروەردەییە کۆییەکان بەکار دەهێنرا، قوتابخانە لە چەند پۆلێك پێك هاتبوو، مامۆستایەك ئیشی لەسەر پەروەردە و فێرکردنی هەموویان ئەکرد، ئەمە ڕێگەیەکی سەرکەوتوو نەبوو، هەر چەندە ئێستاش هەمان جۆر بەردەوامە بەڵام هەنگاو بەرەو پەروەردەی تاکە کەسی نراوە، وەك پەیڕەوکردنی سستمی دوو مامۆستایی و ڕژێمی گروپکردنی پۆل.

چەندخاڵێکی هاوبەش لە نێوان هەردوو مەبەستە پەروەردەییەکەدا هەیە و دەبێت بە هەند وەربگیرێن، لەوانەش :

١. مناڵ پەروەردەی ژیری بکرێت، تاکو خۆی و دەوروبەری خۆی بناسێت و بزانێت چی بکات و چۆن بیر بکاتەوە و هەنگاو هەڵبگرێ.
٢. دەبێت پەرە بە پەروەردەی جەستەیی منال بدرێت، تاکو لەش و لاری ئامادە و شیاو بێت بۆ پراکتیزەی پەروەردەی تیۆری و بەهێزکردنی گورو تینی ماسولکەیی.

٣. یەکێك لە مەبەستە پەروەردەییەکان ئەوەیە کە (پەروەردە) کار لەسەر چاکسازی و ئاراستەی ڕەوشتی تاکە کانی کۆمەڵ بکات، چونکە لە بنەڕەتدا هەموو مرۆڤێك ڕەوشت بەرز و ڕەفتار نایابە و خەڵك و ژینگە جۆراو جۆرەکان شیرازەی تێکدەدەن.

٤. دەبێت منالْ فێری جۆرەها کارو پیشەی گونجاو بکرێت، تاکو ئەم پیشەیە ببێتە سەرچاوەیەك بۆ دارایی و دەرامەتی ژیانی.

٥. دەبێت ئەو شتانە بۆ منالْ دابین بکرێ کە کاتی دەستبەتاڵی خۆی پێ پڕ بکاتەوە، بە جۆرێك کە سوود لەو کاتە بەتاڵەش وەربگرێ.

٦. دەبێت منالْ وا پەروەردە بکرێت کە هەستی بەرپرسیارێتی تێدا دروست ببێت، بزانێت کە ئەگەر چی منالە بەڵام هەندێ ئەرك و بەرپرسیارێتی لە ئەستۆدایە و دەبێت پابەندیان بێت.

لە شێوازی پەروەردەی هەرێمی کوردستاندا تاکو ئێستا مەبەستە پەروەردەییە کۆیەکان پەیڕەو دەکرێن و تاك بە تەواوەتی فەرامۆش کراوە، بۆ نمونە : مامۆستایان بە وردی نە چوونەتە ناخی قوڵایی دەرونی هەریەکە لە منالەکانەوە، نازانێ شێوەی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەریەکەیان چۆنە، ئەگەر ئەو شتانەش بزانن تەنها لە دۆسیەیەکدا بە ڕێژەو ژمارە وەك زانیاری وشك تۆمارکراون و لە ڕووی پراکتیزە و بەدواداچوونەوە لایان لێ نەکراوەتەوە، مامۆستا وانە بە قوتابیەیەك دەڵێت کە نایناسێت، نەخۆی دەناسێت و نەخێزان و ماڵ و کەس و کاری، نازانێت سروشتی ئەو منالە چۆنە، تەندروستی لەش و دەرونی چۆنە، چ جۆرە خواست و ئاواتێکی هەیە. توانای چەندە بۆ وەرگرتن وگەشە پێدانی خواست و ئاواتەکانی، ئەمە کورتەیەك بوو دەربارەی مەبەستە پەروەردەییەکان، ئەوە ماوەکە (مەبەستە پەروەردەییەکان) و(ئامانجە پەروەردەییەکان) مان لەلا تێکەڵ نەبێت، چونکە ئەمانە بە تەواوەتی لە یەکتریەوە جیاوازن و لە درێژەی ئەم باسەدا کورتەیەك لە ئامانجە پەروەردەییەکان باس دەکەین.

# ئامانجە پەروەردەییەکان

پێشتر مەبەستە پەروەردەییەکانمان ڕوونکردەوە، وە باسمان لەوە کرد کە (مەبەستی پەروەردە) و (ئامانجی پەروەردە) دوو شتی جیاوازن مەبەست واتە (غایە) و ئامانج واتە (هدف) ئامانجەکان ئەو شتانەن کەلە خزمەتی تەوزیف کردنی توانای مرۆڤدان تا دەگەیەنن بەمەبەستە سەرەکیەکە، بۆ نمونە ئێمە لەکاری پەروەردەدا مەبەستمانە کە قوتابیەکانمان شارەزایەکی باش بن لە زمانی ئینگلیزیدا لەبەر ئەوە شارەزا کردنی منالەکان لە ئینگلیزی دا دەکەینە ئامانج، ئیتر ئێمە کار لەسەر ئامانجەکە دەکەین بۆ ئەوەی مەبەستە کەمان بێتە دی.

مرۆڤ سروشتی وایە، بەردەوام حەزی لە داهێنان و نوێگەرییە، ئەمەیشی لە پێناوی دوو خاڵی سەرەکیدایە :

١. پارێزگاری و بەرگری لەمانەوەی خۆی بکات تا درێژ ترین ماوە.
٢. لەو ماوەیەدا ژیانی بێ گرێ گۆڵ بێت و چێژ لە ئاسودەیی بکات.

کەواتە مرۆڤ ئەو دوو خاڵەی زۆر مەبەستە، بۆ گەیشتن بەم دوو خاڵە دەبێت ئامانجەکانی خۆی دیاری بکات و دواتر بەپێی نەخشەیەکی ورد هەنگاوی بۆ بنێت، چونکە ئەگەر ئامانجەکان دیارو ڕوون نەبن لەبەرچاوی ئەوا ناتوانێت نەخشەی ڕێ بۆ هەنگاوەکانی دابنێ، دیاریکردن و ڕوونبوونی ئامانج لە هەموو کاروبارێکدا زۆر گرنگە بەتایبەتیش بۆ کارێکی چارەنوس سازانەی وەکو پەروەردە، خۆ ئەگەر ئامانجەکان دیار نەبن ئەوا بەشێکی زۆری وزەو توانای مرۆڤ بە هەدەر دەچێت، واتە کات و وزەی هزری و وزەی جەستەیی بەفیڕۆ دەڕوات، لە لایەکی ترەوە دیاریکردنی ئامانجەکان والە مرۆڤ دەکات کە هەستی بەراورد کاری و پێوانە سازی تێدا دروست ببێت، مرۆڤ بەپێی سنوری ئامانجەکان دەزانێت هەوڵەکانی تا چەند بەرهەمدار بوون و لە مەبەستەکان نزیکی کردۆتەوە، ئەمە وەکو تێڕوانینی خودی مرۆڤ دیارە پەروەردەش وەك زانستێك تێڕوانینی خۆی هەیە بۆ ئامانجەکان، دیاریکردنی ئامانجە پەروەردەییەکان

یەکێکە لە کارە گەورە و گرانەکانی پەروەردە، چونکە ئامانجەکانی پەروەردە گشتی و گشتگیرو ڕوون و نەمرن و زۆر درەنگ گۆڕانیان بەسەردا دێت، وەکو ئامانجەکانی حیزب و دامەزراوە و سەندیکا و کۆمەڵەکان سنوردارنین، بەڵکو ئامانجە ستراتیژیەکان پەروەردە بڕیاردەرن لەسەر چارەنووسی پیشەیی و ڕۆشنبیری هەزاران قوتابی و خوێندکار، تەنانەت ئامانجە ستراتیژیە پەروەردەییە جیهانیەکان بەرپرسیارن لە چارەنووسی سەرجەم دانیشتوانی سەر ڕووی زەوی.

هەر گەل و نەتەوەو وڵاتێك خۆی بەرپرسیارە لە دیاریکردنی ئامانجە پەروەردەییەکانی خۆی، گەل بڕیاردەرە لەسەر ئەوەی ئاخۆ بەرەو ئەوەی چۆنی دەوێ بۆ ئایندەی وڵاتەکەی، ئەم ئامانجە پەروەردەییانەش دەکرێن بە دوو بەشی سەرەکیەوە :

١. ئامانجە بنەڕەتیەکان
٢. ئامانجە لاوەکیەکان

دەکرێت گەل جۆری تری ئامانجی پەروەردەیی هەبێت جگە لەم دوو جۆرە سەرەکیە، لە ڕووی ستراتیژیشەوە دابەش دەکرێن بۆ دوو جۆری تر، کورت خایەن و درێژ خایەن، ئامانجە پەروەردەییەکانیش دیسانەوە (مەبەست) یان هەیە، دەیانەوێت ئاستی هۆشیاری پەروەردەیی و پرۆسەی فێرکاری بگەیەننە بەرزترین ئاست لە کەمترین ماوەدا بەکەمترین تێچوون و ئەرکی مادی و مەعنەویەوە بۆ ئەوەی باشترین نەوە پێبگەیەنن و پێشکەشی گەل و وڵاتی بکەن، تاکو ئارامترین کەش و هەوای ژیانی ئاسودە بۆ وڵات مسۆگەر بکەن و تاکو کۆی گەل چێژ لە ژیانی کامەران و پێشکەوتن وەربگرێت، بە ڕادەیەك کە ژیان تامی نەمری و بەردەوامی بدات، ئەمەش گەورەترین ئاواتی مرۆڤە لەم گەردوونەدا، لێرەدا ئاماژە بە دیارترین مەرج و تایبەتمەندێتیەکانی ئامانجە پەروەردەییەکان دەدەین :

١. گشتی بن و بۆ هەموو کەسێك دەست بدەن.
٢. گشتگیربن و هەموو لایەنەکانی ژیان بگرنەوە.
٣. ببنەمایەی هاوسەنگی و گونجان، پێچەوانەو دژ نەبن لە نێوان خۆیاندا.

٤. نەرم و كشۆك بن و بەپێی باردۆخە جیاوازەكان بگۆڕێن.

٥. دەست بدەن بۆ مانەوە و نەمری و بەردەوامی و چەسپان.

٦. گونجاو بن لەگەڵ سروشتی مرۆڤ و پاڵنەرو خواست و ڕەمەكەكانی ([١])، لەو ڕووەوە كە (تاك) یەكە و لەو ڕەمیشەوە كە ئەندامی كۆمەڵێكە.

٧. دابڕاو نەبێت لە هەقیقەت و ناكۆك نەبێت لەگەڵ ڕاستیدا.

مرۆڤەكان جۆراو جۆرن، لە ڕەنگ و زمان و نەتەوە و بیرو ئایدۆلۆژیاو ڕەگەزو پلە و پایە و قەدو باڵاو توانای مادی و مەعنەویدا، بەڵام هەموشیان پێویستیان بە پەروەردە هەیە و ناشتوانن خەسڵەتە بنەڕەتیەكانی خۆیان بگۆڕن، كەواتە دەبێت پەروەردە خۆی لەگەڵ ئەواندا بگونجێنێ لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئامانجی گونجاوی پەروەردەییەوە، پەروەردە موڵكی حیزبێك یان ئایدلۆژیایەك یان ئاینێكی تایبەت نیە، بەڵكو موڵكی هەموو مرۆڤەكانە، سوود و بەرژەوەندیەكەیشی دیسانەوە هەر بۆ هەموو مرۆڤەكانە، لەبەر ئەوە دەبێت ئامانجەكانی كشۆك بن، بەڵام نابێ شلۆڤ و نەچەسپاوبن، ژیان كۆمەڵێك ڕاستی شاراوەی تێدایە، نابێت پەروەردە مرۆڤ لە چەمك و ناخی ئەو ڕاستیانە دوور بخاتەوە، بەڵكو دەبێ پەروەردە ئامێرێك بێت بۆ گەیاندنی مرۆڤ بەو ڕاستیانە و ڕێنومایی كردنی، ئامانجە پەروەردەییەكان ئەو پلەیەن كە مرۆڤ بۆ گەیشتن بەمەبەستەباڵاكانی ژیانی بەسەریاندا سەر دەكەوێت و دەگاتە لوتكە، ئامانجە باڵاكان لە لایەن پارلەمانی وڵات و وەزارەتی پەروەردە و وەزارەتە پەیوەندیدارەكانەوە دیاریدەكرێن. ئەو دیاریكردنە كاتێك بەڕاست و دروست دادەنرێت كە ئەندام پەرلەمانەكان بە ڕێگەیەكی دیموكراسیانە و هەڵبژاردنی ئازاد پلەی پەرلەمانتارێتی و نوێنەرایەتی خەڵكیان وەرگرتبێ و لە ئاستی كاری پەروەردە و فێركردندا شارەزا و لێهاتووبن، بە قووڵی بڕواننە ئایندەی پەروەردە و هەنگاو و نەخشەكانی ڕێگە و (پەروەردەی نیشتمانی ڕەسەن) لە چوار چێوەی تەنها

---

[١] ڕەمەك : الغریزە

حیزبەکەی خۆیاندا بچووك نەکەنەوە و تەنها بەگۆشە نیگای هەنوکەیی نەڕواننە ئایندەی نەوەی نوێ، دەکرێت حیزب و ڕێکخراو بکرێنە پلەی پەیژەو ئامێرێك بۆ خزمەتی پەروەردە و فێرکردن بەڵام پێچەوانەکەی جەوت و ئاڕاستە ئەو حیزب و ڕێکخراوانە ژیرن کە (پەروەردە) دەکەنە کارتی بەهێزی خۆیان بۆ فراوانبوونی بنکەی جەماوەری و ڕاکێشانی زۆرینەی دەنگەکان لە هەڵبژاردنەکاندا، بەمەرجێك دواتر بەڕاستی کاری بۆ بکەن نەك تەنها ڕیکلام بێت.

# ئامانجە ستراتیژی و هەنوکەییەکانی پەروەردە

گوتمان ئامانجە پەروەردەییە باڵاو ستراتیژیەکان لە لایەن پارلەمان و وەزارەتی پەروەردە و وەزارەتە پەیوەندیدارەکانی تری حکومەتەوە دیاریدەکرێن، بەڵام ئامانجە لقی یەکان لەلایەن بەڕێوەبەرێتی پەروەردە و بەڕێوەبەرێتی قوتابخانەکان و بەڕێوەبەرێتیە پەیوەندیدارەکانەوە دیاری دەکرێن، تەنانەت دەشێت ئامانجی پەروەردەیی جیاواز بن لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر یان لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر، یاخود لە قوتابخانەیەکەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر، هەروەها دەگرێت ئامانجی هەریەکە لە وانە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر جیاوازبن، بۆ نمونە : ئامانجە لقیەکان لە کاتی قەیرانی ئابوری و جەنگ و ناکۆکی کۆمەلایەتی و ڕووداوی سروشتیدا وەکو ئامانجە پەروەردەییەکان نیە لە کاتی ئاساییدا.

دارشتنی ئامانجەکان کارێکی وردە، نابێ هەڵەی تێدا بکرێ، چونکە لەسەر بنەمای ئەو ئامانجانە ئەوەو بەرەکان پێدەگەن، واتا ئامانجەکان لە شتێکی تیۆری دەڤەوە دەکرێن بە شتێکی بەرجەستەو کردارییانە لە خودی مرۆڤدا، گۆڕین و گۆرانکاری لە هەموو کارێکی تیۆریدا ئاسانترە وەك لەوەی بکرێ بە کرداری و دواتر بگۆڕدرێ هەر وەکو چۆن ڕاستکردنەوەی نوسینی قەڵەمی دار ئاسانترە لە جاف.

مرۆڤ لە ژیانیدا دوچاری دەیان قەیران و کێشەی ئاڵۆزو هەمە جۆر دەبێت، ئەوانەش پێویستیان بەچارەسەر هەیە و دەبێت مرۆڤ لە ڕێی ڕەفتارەوە چارەسەرەکان بکات، ڕەفتاریش بەرهەمی پەروەردەیە، کەواتە ئەگەر بمانەوێت ناراستەی شارستانێتی وڵات بگۆڕین، دەبێت کار لەسەر گۆڕینی هزرو بیری تاکەکانی کۆمەڵگە بکەین، دواتر ئەو گۆڕینە لە ڕەفتارەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە، مەرج نیە کە هەموو تاکێکی کۆمەڵگە بە شێوە قووڵە هزری و فەلسەفی و تیۆریەکان لە ئامانجە پەروەردەییەکان تێبگات، ئەوسا پراکتیزەیان بکات. بەڵکو

کاری سەرەکی خەمخۆرانی پەروەردە و ئاراستەکاران ئەوەیە کە تاکو کۆی کۆمەڵگە هان بدەن بۆ پراکتیزە کردنی هەڵوێست و هەنگاوی پەروەردەیی پەسەندو بەجێ، بناغە و کرۆکی کاری پەروەردەیی چاکسازی ڕەفتارگەراییە، ئینجا کام ڕێگەیە دەمانگەیەنێتە ئەو مەبەستە ئەوا دەبێت ئەو ڕێگەیە بگرینە بەر.

ئامانجە ستراتیژیە پەروەردەییەکان ئەو ئامانجانەن کەلە سەر ئاستی وڵات و هەرێمەکان دیاری دەکرێن بۆ پرۆژەی کاری پەروەردەیی، بۆ نمونە : لە هەرێمی کوردستاندا، حکومەتی هەرێم و وەزارەتی پەروەردە دوای توێژینەوە بۆی دەردەکەوێت کە دەبێت شێوەی کاری پەروەردەی هەرێم بگۆرێت، ئەم گۆڕینەیش دەبێت بەپێی بەرنامە یەك بێت، کە درێژ خایەن بێت، لەوانەش :

١. پێویستە سستمی پەروەردە لە هەرێمی کوردستاندا سەر بە حکومەتی مەرکەزی بێت، یان سەر بە هەرێم بێت، یان ئازاد بێت، دەبێت لە ناو ئەم جۆرانەدا یەکێکیان هەڵبژێرێت و بیکاتە سەرەکی.
٢. نەوەی نوێ زۆر بەکەمی هۆگری نیشتمانەکەیەتی، دەبێت پەروەردەکار لەسەر بوژاندنەوەی نیشتمانپەروەری نەوەکان کار بکات.
٣. نەوەی نوێ زیاتر کەسانێکی بێ بەرهەمن، پێویستە پەروەردەکار لەسەر پێگەیاندنی کەسانی بەرهەمهێن کار بکات و خودی پەروەردەی هەرێمیش ببێتە دەزگایەکی بەرهەمهێنی پەروەردەیی و بەکار بەر نەبێت
٤. زوربەی نەوەی نوێ هۆگری لاساییکردنەوەی نەریت و ژیانی خۆرئاوان و کولتوری نەتەوەییمان لە وەستان و پاشە کشێ دایە، کەواتە پێویستە پەروەردەکار لەسەر هاوسەنگکردنەوەی ئەم لاسەنگەیە کار بکات و نەوەی دواتر وا پەروەردە بکات کە سوود لە شارستانێتی گەلانی تر وەربگرێ و هاوکات کولتورو شارستانێتی خۆماڵیش پەرە پێبدات، نەك بیسرێتەوە.

ئەمانە و چەند ئامانجێکی تر هەیە، کە پێیان دەوترێت ئامانجە ستراتیژیەکانی

پەروەردە، سروشتی ئەم ئامانجانە چەند مەرجێکی تێدایە، واتە دەبێت ئامانجە ستراتیژیەکان ئەم چەند خەسڵەتەی تێدا بێت :

١. بنەمایەکی یاسایی و پشتگیریەکی گەورەی دەسەڵاتی سیاسی وڵاتی لە پشتەوە بێت.
٢. پراکتیزە کردنیان بە ئەرکێکی نیشتمانی دابنرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نەخشەو بەرنامەی وردی بۆ دابنرێت لەلایەن دەوڵەتەوە و سزای یاسایی بۆ سەرپێچیکاران دابنرێ
٣. ئامانجەکان نەمرو بەهێزبن و توانای خۆڕاگرییان هەبێت و بەرهەمی نایاب و واقعیانەیانلێ بکەوێتەوە، هەڵنەوەشێنەوەو بۆ هیچ کەسێك نەبێت، کە پێچەوانەیان هەنگاوبنێ.
٤. دوای توێژینەوەی زانستیانە لە دایك بو بێتن و هاوگونجاو بن لەگەڵ دەرامەت و دارایی وڵات و ئامادەیە مادی و مەعنەویەکان.

هەرچی ئامانجە هەنوکەییەکانیشن بەپێی پێویست تەمەن و ماوە و مەودای کاتی و جیوگرافییان بۆ دادەنرێت، ئامانجەکان هەمیشە پلەی سەرکەوتنن بەرەوگەیشتن بەمەبەستەکان، بۆ نمونە : کاتێك پەروەردە لە هەرێمی کوردستان دەیەوێت نەوەی نویێ زانستخوازبن، کەواتە دەبێت (زانستخوازی) لە دەسەڵاتی سیاسەتی پەروەردەییدا بکرێتە (مەبەست) ئەوسا نەخشەی ورد دابنرێت بۆ هەنگاونان بەرەو مەبەستەکە لە ڕێی چەند ئامانجێکی پەروەردەییەوە، کە هەندێ جار ئەم ئامانجانە بە ئامانجی کاتی و هەنوکەیی دادەنرێت و دوای تەواو کردنی ئەرکەکانیان ئیدی دەپوکێنەوە، پوکانەوەکەشیان شتێکی سروشتیە و نابێت کارایانی بواری پەروەردە وەك (دەقە نەمرەکان) تەماشای ئەو ئامانجانە بکەن، بەڵام ئامانجە ستراتیژیەکان لە باری ستونی درێژ تر دەبنەوە و تەمەنیان زۆر درێژترە چونکە ئەمانە پەیوەستن بە چارەنوسی هەرە گەورەی وڵاتەوە و کاردەکەنە سەر ڕەوتی سیاسیانەی وڵات و ئابووری و زوربەی لایەنە زیندووەکانی ژیانی گەل و نەتەوەکان و پێکهاتە مرۆییەکان. لە ڕاستیشدا هەموو دەقێکی

یاسایی بۆ ئامانج یان مەبەستە پەسەندو بەجێکان بە (دەقێکی نەمر) دادەنرێت هەتاکو پراکتیزەکردنیان دەگاتە لووتکە، ئەوسا لەسەری قوچەکەکەوە وردە.. وردە... نەمری دەقەکان دادەبەزێ و کوالێتی کەم دەبێتەوەو تاکو دەگەنە بنکەی قوچەکە کە بە تەواوەتی دەمرن لاشەکانیان وەك گەلاڕێزانی پاییز لەگەڵ زەویدا دادەرزێن و کارلێك دەکەن و دەبنەوە بە ماددەیەکی خۆراکیانەی باش و بە پیت بۆ ڕواندنی نەمامێکی تری مەبەست و ئامانجە نوێیەکان، بەم جۆرە ئەم سوڕی گەشە و لاوی و پیر بوون و مەرگە پەیتا... پەیتا... دوبارە دەبێتەوە. بەڵام هیچ جارێك بە تەواوەتی لە جارەکانی تر ناچێت، هەموو نەمامێکی مەبەست و ئامانجەکان شێوەو قەبارەو ڕەنگ و تام و تەمەن و بالای تایبەت بە خۆی هەیە، ئەم ڕاستیەش بۆ هەموو خێزان و گروپ و کۆمەڵە و ڕێکخراو و قوتابخانە و بگرە تاکە کەسێکیش ڕاستە.

که دەڵێن : دەبێت دەسەلاتی سیاسی پەروەردە و ئامانجەکانی بکاتە مەبەست واتە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بە فەرمی بڕیاربدات و کار بکات بۆ ئەوەی هەموو کەسێکی ولات ئەرکی پەروەردەکردن و ڕەفتاری پەروەردەییانەی پێ بسپێردرێت و ئەو ئەرکەش مافێکی فەرمی هاولاتی بوونیان بێت، هەرکەسێکیش پێچەوانەی ئەو ئامانجە دەستوریە ستراتیژیە پەروەردەییانە جولایەوە دەبێ یاساو داواکاری گشتی سکالای لەسەر تۆمار بکەن و بەپێی یاسایی سزا بدرێت، چونکە بوەتە کۆسپ لەبەردەم پرۆسەی پەسەندکراوی پەروەردەی ولات و ئاراستەکردنی نەوەی نوێ.

# ئەركەكانی پەروەردە

(پەروەردە) كەزادەی هزری مرۆڤایەتیە و تەمەنی هەزاران ساڵی پڕ لە ئەزموونە، لەم سەردەمەدا بوەتە پیری پیرانی ناو سەرجەم زانستەكان، هیچ زانستێك توانای درێژە بە خۆدان و مانەوەی نابێت، ئەگەر خەسڵەتەكانی مانەوەی تێدا نەبێت، بێگومان پەروەردە لەو زانستە گەورانەیە، كە تا هەتا گەشە دەكات و دەمێنێتەوە، یەكەم هۆكاری مانەوە و بەردەوامی پەروەردە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئەركە گرنگانەی كەلە ئەستۆی دایە و زانستەكانی تر ناتوانن جێگەی بگرنەوە.

پەروەردە ئەو سستمی ڕاگیركردن و پرۆگرامگەراییە كە گەلێك یان وڵاتێك یان چەند وڵاتێك هەڵیدەبژێرن بۆ پراكتیزەكردن لە بواری پێگەیاندنی نەوەكانیاندا و ئاراستەكردنیان لە چوارچێوەی چەند ئامانجێكی پەروەردەیی دیاریكراودا بەمەبەستی گەیشتن بەو خواستە پەروەردەییەی كە دەیانەوێت.

ئەركەكانی پەروەردە درێژ خایەن و كورت خایەنیان هەیە، هەندێ لەو ئەركانە پەروەردەیی فێركارین، هەندێكیان پەروەردەیی ئاراستەكارین كە ئەم دوو جۆرەیان تایبەتن بە منداڵان و هەرزەكاران، بەڵام جۆری سێهەم (پەروەردەیی پەرە پێدان) ن و زیاتر بۆ ئەو كەسانەیە كە تەمەنی هەرزەكارییان تێپەڕاندوە، منداڵ لەگەڵ هاتنە دنیاوە بە دوو بنەمای گرنگ بار بۆ كراوە كە ئەم دوو بنەمایە زۆر گرنگن بۆ كاری پەروەردەیی :

یەكەم : ئامادەگی تێدایە بۆ وەرگرتنی ئاراستە و ڕێنومایییەكان.

دووەم : توانایەكی شاراوەی زۆر گەورەی تەوزیف نەكراوی تێدایە، كەواتە منداڵ یەكەمین بونەوەرە كە ئامادە كراوە بۆ پەروەردە كردن و ئەو كەرەسانەیشی تێدایە كە كاری پەروەردە كردنەكە ئاسان دەكەن. پەروەردە لە سنوری ماڵ و خێزاندا بێت، یان لە قوتابخانە و ئۆرگانە پەروەردەییەكاندا بێت، یاخود لەنار

کۆمەڵگەدا بێت، پێنج ئەرکی سەرەکی لە ئەستۆدایە کە ئەمانەن :

1. گواستنەوەی ڕەفتار، هەر کۆمەڵگەیەکی مرۆیی پێکدێت لە چەندین مرۆڤەهەریەکە لە وانەش لە دوو سەرچاوە وە فێری ڕەفتارە جۆراو جۆرەکانی خۆی بووە و ڕۆژانە پەیرەو یان دەکات، هەر ئەم ڕەفتارانەش بوونەتە کەرەسەی خاو بۆ دروستکردنی کەسێتی ئەو مرۆڤە لەناو کۆمەڵگەکەیدا، سەرچاوەی یەکەم کە مرۆڤ کەڵکی لێوەردەگرێت بۆ هەڵگرتنی ڕەفتارەکانی بریتیە لە خودی خۆی، واتا ئەو کەسە لە ڕێگەی هزرو بیری خۆیەوە دەگاتە قەناعەتێکی گونجاو کە خۆی پێی ڕازیەو لەسەر ئەو بنەمایە ڕەفتارەکانی خۆی پیادە دەکات، زۆرێك لەم کەسانە دەگمەن و پێچەوانەی نەریت و ڕەفتاری کۆمەڵگەن، سەرچاوەی دووەم بریتیە لەو خێزان و کۆمەڵگەیەی تیایدا دەژی، لە ئەنجامی تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی و هاو ژیانیەوە، مرۆڤەکە ئەو ڕەفتارانەی ئەوان هەڵدەگرێتەوە و دوبارەیان دەکاتەوە جایان بەشێوەی دەقاو دەق یان بەدەستکاری کردنەوە، ئەو فاکتەرەی والە تاکەکانی کۆمەڵگە دەکات کە ڕەفتارەکان هەڵبگرنەوە بریتیە لە پەروەردە، تەنها پەروەردەیە کە توانای گواستنەوەی ڕەفتاری هەیە لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی تر، کۆمەڵگە دەسەڵاتی باڵایە و هەر ئەو مافی ئەوەی هەیە کە ڕەفتارەکان لە قوڵایی ناخەوە هەڵبکەنێت و وەك ئەمام بیانگوازێتەوە بۆ بەرەو ئەوەکانی تر، جا ئەو گواستنەوەیە ڕاستەوخۆ لەناوجەرگەی کۆمەڵگەوە بێت یان لە ڕێی خێزان و قوتابخانەوە بێت.
2. گواستنەوەی کولتوری ڕۆشنبیری، کولتوری ڕۆشنبیری بەری ڕەنجی هەموو مرۆڤەکانە، سەرمایەکی سەنگینی ئادەمیزادەکانە و دەبێ بپارێزرێت، پەرەی پێبدرێت، پەرەپێدانەکەی ئەرکی ئەوەکانی داهاتوە، بەڵام پاراستنەکەی‌ئەرکی ئەوە هەنوکەییەکانە، دیارە کولتوری ڕۆشنبیریش تەنها بە یەك ڕێگەیە دەپارێزرێت، ئەو ڕێگەیەش گواستنەوەی کولتورە

ڕۆشنبیریەکە بۆ نەوەکانی داهاتوو، ئەو فاکتەرەش کە دەیگوازێتەوە لەبەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی تر بریتیە لە پەروەردە، واتا گواستنەوەکە ئەرکوکاری پەروەردەیە.

٣. گۆڕین و گەشەپێدان و بژارکردنی کولتوری ڕۆشنبیری، هەرگیز ستایلی پەروەردەیی نەوەیەك لەسەردەمێکدا کوتومت ڕاست و شیاو نیە بۆ نەوەیەکی تر لەسەردەمێکی تردا، لەبەر ئەوە هزرو کولتوری پەروەردەیی بەردەوام لە خۆنوێکردنەوە دایە تاکو لەگەڵ بەرەی نوێدا بگونجێت، کەواتە بەرەی دووەم دەبێت هەمیشە کار لەسەر نوێگەری و تازەکردنەوەی شێوازو ستایلی پەروەردەیی بکەن، بە بژارکردن و لابردن و چاکسازی کۆنەکەو دروستکردنی ستایلێکی نوێ، بێگومان ئەمە ئەرکی پەروەردەیە، کارێکی هەرەمەکی و بێ نەخشە نیە، بەڵکو دەبێ پەروەردەناس و شارەزایان بەم کارە هەستن، لە هەموو سەردەمێکیشدا پەروەردە خۆی ئەو کەسانە دروست دەکات کە دەبنە سەربازی ون و خەمخۆری ڕاستەقینەی پاراستنی پەروەردەکە.

٤. پێدانی زانیاری و شارەزایی کۆمەڵایەتیانەی نایاب بە تاك کەلە نەریت و ڕەوشت و کولتورو سستەم و ڕەفتاری کۆمەڵایەتیانەی کۆمەڵگەکەیەوە سەرچاوەیان گرتبێت، واتە پەروەردەیە کە مرۆڤ دەکاتە بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیانەی گونجاو لەگەڵ ژینگە جۆراو جۆرەکانی دەوروبەری.

٥. پێدانی زانیاری نوێ بەتاك، مرۆڤ لە ڕێگەی پەروەردە گەلێك زانست و زانیاری نوێی پێدەگات و هاوکاروان دەبێت لەگەڵ ڕەوتی شارستانێتی جیهان.

لێرەدا (ژینگە جۆراو جۆرەکان) مەبەست لە دەوروبەری مرۆڤە، کە ژینگەی کۆمەڵایەتی و ئابووری سیاسی و ڕۆشنبیری و...... هتد دەگرێتەوە دەوروبەر واتە ئەو ناوەندەی کە مرۆڤ تیایدا دەژی، کە بریتیە لە پێکهاتەی زیندوو لەگەڵ پێکهاتەی نا زیندوو، نازیندوو وەکو بەردوخاك و شوشە و تەختە و کەرەسە بێ

گیان و نا ژیرەکان، بەڵام پێکهاتە زیندوەکان بریتین لەو مادە و کەل و پەل و زیندەوەرو گیانەوەرانەی لە دەوروبەری مرۆڤ دەژین، وەکو گژوگیا و ڕووەك و دارودرەختەکان و مێروەکان و زیندەوەرو گیانەوەرە خشۆك و باڵندەکان و.... هتد، هەریەکە لەو مادە و کەرەسە و کەل و پەل و گیانەوەر و زیندەوەرانە بە تاڵە هێڵی پەیوەندی بەستراوەتەوە بە مرۆڤەوە، کەواتە لە یەك کاتدا دەیان و سەدان شەپۆلی جۆراوجۆری دەنگەکان بەبیستراو و نەبیستراوەوە و شەپۆلەکانی ڕوناکی بەبینراو و نەبینراوەوە بەسەر مرۆڤدا هەڵدەڕژێن و مرۆڤیش هەندێکیان وەردەگرێ و کارلێکیان لەگەڵ دەکات و وەڵامی جۆراو جۆریان دەداتەوە، هەروەها مرۆڤەکان خۆشیان بە هەزاران تاڵە هێڵی پەیوەندیەکان پێکەوە بەستراونەتەوە و بگرە خودی مرۆڤ خوی لەگەڵ خۆیشیدا بەسەدان داو و تاڵی پەیوەندیەکان بەخۆیەوە بەستراوەتەوە، بەشێوە گشتیەکەی مرۆڤ بەردەوام لەناو تۆڕێکی پەیوەندی هەزار بە هەزار دایە، لەگەڵ ژینگە و خەڵك و خۆیدا، تەنانەت لە کاتی خەوتنیشدا، لە ئەنجامی ئەوەدا مرۆڤ وا ڕام دەبێت کە بەتەنها نەژی و لەگەڵ ئاپۆڕای ئەو ژینگە قەرەباڵغەی دەوروبەریدا هاوکاروان بڕوات و فێر بێت کە ژیان بەتەنها ناچێتە سەرو هەر دەبێ ببێتە بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیانەی گونجاوی ژینگەکەی.

# پەیوەندی پەروەردە بە فەلسەفەوە

پەروەردە، ئەو ڕستەیەکە لە خودی مرۆڤ و پەیوەندیەکانی دەکۆڵێتەوە و نەخشەی ڕێگا دادەنێ بۆ ئایندەی پیشەی ژیان و خۆگونجاندنی مرۆڤ لەگەڵ ژینگە جۆراوجۆرەکانی دەوروبەریدا، زانستەکانی تریش وەك بایۆلۆژی و سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی و..... هتد، هەریەکەیان لە ئاستی خۆیانەوە بە جۆرێك لە جۆرەکان خزمەتی مرۆڤ دەکەن، واتە پەروەردەش وەك یەکێك لەگەورەترین زانستە خزمەتگوزارەکان پێگەی خۆی هەیە و پەیوەندی هاوبەشی هەیە لەگەڵ هەموو زانستەکاندا، لەم زنجیرە باسەدا چەند زانستێك بە نمونە باس دەکەین، لەسەرەتایشەوە ئاماژە بە پەیوەندی پەروەردە دەکەین بە یەکێك لە زانستە زۆر دێرینەکانەوە کە ئەویش فەلسەفەیە.

بەهای مەزنی مرۆڤ لە بیرو هزرەکەیدایە، بیری پەروەردەییش جگە لەوەی خاڵی هاوبەشی لەگەڵ فەلسەفەدا زۆرە، هاوکات بۆ خۆیشی جۆرە فەلسەفەیەکی گرنگە، پەروەردە بەرلەوەی هەرچی شتێکی تر بێت فەلسەفەیەکە، چونکە جەوهەری کارەکەی وا دەخوازێت، دەیەوێت مرۆڤ داناو زانا و شارەزا و بەحیکمەت بێت و لە چەمکی واتا فراوانەکەی بوون و ژیان و گەردون تێبگات، سەرنجی قووڵ بداتە دەوروبەری، بیر بکاتەوە، ڕەخنە بگرێ، داهێنان بکات، ئەمانەش لە ڕاستیدا کتومت ئیشی فەلسەفەن و پەروەردە بە چەمك و ستایلێکی ترەوە دەیانخاتە کار، پەروەردە لە شێوازی هەنگاوی هزریانەیشیدا هاو شێوەی فەلسەفەیە.

بنەماکانی پەروەردە لەسەر فەلسەفەی گشتی مرۆڤایەتی ڕاگیرکراون، لەبەر ئەوە پەروەردە بۆ چارەسەرکردنی زوربەی گرفتە ڕیشەییە هزریەکانی دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە بنەڕەتیەکەی کە فەلسەفەیە، ڕاستە پەروەردە بەر لەوەی پراکتیك بێت هزرە، بەڵام هیچ هزرێکی پەروەردەیش لە بۆشایی هەوادا

ڕاناوەستێ بەڵکو دەبێت لەسەر بنەمای هزرو تێڕامان و وردبونەوەیەکی فەلسەفیانە بێت، هاوکات هیچ کەسێك ناتوانێت ببێتە کەسێکی پەروەردەیی هەتا هەڵگری هزرێکی فەلسەفی نەبێت.

پەروەردە لە سنوری مەبەست و ئامانجدا کارەکانی دەکات، داڕێژەرانی مەبەست و ئامانجەکانیش دەبێ کەسانێکی تەواو شارەزابن لە بواری چەمکە مەزنەکانی ژیان و بەهاکان و واتاکانی بوون، مرۆڤ گەردوون و... هتد واتا کەسانی بەحیکمەت و داناو فەیلەسوف خاوەنی یەکەمی پەروەردەن.

فەلسەفە لێکۆڵینەوەی وردە بۆ گەڕان بە دوای دۆزینەوەی وەڵامی لۆژیکیانەی پرسیارە نەمرەکانی ژیان و کات و هزرو توانا شاراوەکانی ناخی مرۆڤ و ئەندێشەو تێڕامانی بەرفراوان و گشتی لە هەموو شتە مادی و مەعنەویەکان، تیایدا نەخشە بەندی و سەلماندن و پاسادان و هەڵگواستن و بەدواداچوون و دڵنیابوون بەکار دەهێنرێن بەمەبەستی دۆزینەوەی نهێنی یەکانی ژیان و ئارامی ڕۆحی بە مرۆڤ و سرەوتن بەوردبوونەوەیەکی بەراوردکارانە بۆمان دەردەکەوێت کە پەروەردەش بەهەمان دراو مامەڵە دەکات و ئەم چەمکانە بەکار دەهێنێ، بەم جۆرە یەکەم خاڵی هاوبەشی نێوان پەروەردەو فەلسەفە دێتە ئاراوە.

تەنها فەلسەفەیە کە لەسەر هەموو شتێ قسەی خۆی هەیە، ئەو مافەش تەنها بەودراوە، چونکە هەموو شتەکانی دەوروبەرمان لە سێ چەشن و جۆر تێپەڕناکەن (بون، زانیاری، بەهاکان)، لە ڕاستیدا کاری سەرەکی فەلسەفە لەو سێ تەوەرەیەدا چڕو پڕ بوەتەوە، هەرگیز ناتوانین مرۆڤ لە شوێنێکدا دا بنێین کە فەلسەفەی لێ نەبێ. فەلسەفەش بەبێ مرۆڤ هەڵناکات

فەلسەفە ڕشتەیەکە بۆ وروژاندنی مێشکی مرۆڤ پەروەردەش ئامێرێکە بۆ چۆنیەتی کرداری ئاراستە کردنی هزرو بیری مرۆڤ هەر دوولا پێکەوە (پەروەردە و فەلسەفە) لەسەر یەکتری ڕاوەستاون، هەر کامێکیان لابەرین ئەوی تریشیان دەکەوێت، جارێك یەکەم ڕێگەیە و ئەوی تریان بەسەریدا دەڕوات. جارێکی تر دووەمیان ڕێگەیەو یەکەمیان بەسەریدا گوزەر دەکات.

لە لایەکی ترەوە دەبێت (بونەوەر) ێك بوونی هەبێت، تاکو ئەو بوونەی ببێتە مایەی کۆبوونەوە و کەڵەکە بوونی زانیاری لەسەری، دەبێت (بوون) ە کە بەهادار بێت، واتە هەڵگری کۆمەڵێك ڕەوشتی تایبەتی بێت ئەوسا فەلسەفە دەکەوێتە کار، بۆ پەروەردەش بەهەمان شێوە دەبێت بوونەوەرێك هەبێت، وەك مرۆڤ، ئەم بوونەوەرە شایستەی ئەوە بێت کە زانیاری لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە، هاوکات هەڵگری کۆمەڵێك بەهای مەعنەوی بێت، ئەوسا پەروەردە دەتوانێت کاری خۆی بکات، تەنانەت (فەلسەفەی پەروەردە) پراکتیزە کردنی هزری فەلسەفەیە بەسەر پەروەردەدا، زوربەی چالاکیە پەروەردەییەکان لەسەرچاوەیەکی تیۆریەوە هەڵقوڵاون، کەواتە ئەوەی هزرو بیرن، هیچ هزرو بیرێکیش نیە لەم گەرودنەدا کە فەلسەفەی تێوە نەگلابێت، پەروەردە و فەلسەفەیەك درەختی متوربە کراوە کە دوو بەرهەمی هەیە یەکیان فەلسەفی یەو ئەوی تریان پەروەردەییە، ئەم دوانە کاری یەکتری بە تەواوەتی پەسەند ناکەن و بە تەواوەتیش ڕەتی ناکەنەوە، ڕاستە هەریەکەیان تێبینی و ڕەخنەی لەسەر ئەوی تریان هەیە، بەڵام بەبێ یەکتریش هەڵناکەن، فەلسەفە کانیەکی هەمیشە هەڵقوڵاوە، پەروەردەش لە کاتی تینووبوونیدا پەنای بۆ دەبات.

لە ئەمڕی هەرێمی کوردستاندا، پێویستە وەزارەتی پەروەردە زۆر بایەخ بە پەروەردەی فەلسەفی نەوەکانمان بدات، چونکە مەشخەڵی گۆرانکاریەکان لە لوتکەی هەرە بەرزی فەلسەفەوە دادەگیرسێت.

دەکرێت فەلسەفە وەك کورتە مادەیەکی ئاسانکراو لە پرۆگرامی خوێندنی قوتابخانەدا دابنرێت و ئاشنا بکرێت بە منداڵان تاکو لە گەورە بوونیاندا لە فەلسەفە نەترسن و بە بابەتێکی گران و وشك و خەیاڵگەرایی و جادوگەری دانەنێن، بابزانن کە هەموو ژیان لەسەر پەنجەکانی فەلسەفە دەگەڕێت، هیچ کەسێك لەم ژیان و بونەیدا بێ فەلسەفە نەبووە و نابێ، هەموو مرۆڤێك لە ئاستی خۆیەوە و بەگوێرەی خۆی فەیلەسوفێکە، فەلسەفە و شارەزا بوون و بەکارهێنانی مافی ئاسایی هەموو کەسێکە، بەبێ ئەوەی بە خواستی خۆمان بێت فەلسەفە

ناوێتەی خوێنمان بووە و بەبێ ئەو هەڵناکەین، فەلسەفەش جگە لە مێشکی مـرۆڤ شوێنێکی شیاو ترو پێشکەوتوو تـری دەست نەکـەوتووە تـاکو بیکاتـە مـاڵی خۆی، کاروباری ڕۆژانەمان هەر چەنـدە سادە و ساکار بن بەپێی فەلسەفە ئەنجاممان داون و هـەر دەبـێ واش بـین، هـەردەم ئێمـەی مـرۆڤ پێویـستمان بـە گەڕانـە بـە دوای دەسـتکەوتی وەڵامـی پرسـیارەکانی نـاخی خۆمـان، ورد دەبینــەوە، دەکۆڵینــەوە، ڕادەمێـنین، سـەرنج دەدەیـن، ئـەزموون دەکـەین و... هتـد ئەمانـەش هـەموویان بەروبوومی فەلسەفەن، یان فەلسەفە بەروبوومی ئەوانەیە کەواتە گرنگـە هـەر لـە منداڵیـەوە بـەم جیهـانی ڕاسـتیانە ئاشـنا بکـرێین تـاکو لـە گەورەییمانــدا دۆش دانەمێنین لە رزۆك و ترسنۆك نەبین و لە فەلسەفە نـەتۆقین نـەبا دا ئـەویش لـە ئێمە بتۆقێت.

# پەیوەندی پەروەردە بەئەنسرۆپۆلۆژیاوە

ئەنسرۆپۆلۆجیا، ئەو زانستەیەکە لە بوونەوەرە ...ییەکان دەکولێیەوە لەو ڕووەوە کە بوونەوەرێکی ئەندامین و لە کۆمەڵگە دادەژین، ئەو کۆمەڵگەیەی کە سستەم و یاسای کۆمەڵایەتی تێدا پەیرەو دەکرێ... و جۆرێك لە ڕۆشنبیری باڵی بەسەر دا کێشاوە، ئەم زانستە لەلایەنی ڕەفتارو نمونەو شێوازەکانی ژیانی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە، دەچێتە قوڵایی بەراوردکردن و لێکچوونەکانەوە، دەربارەی ڕەگەزەکانی مرۆڤ و بارە کۆمەڵایەتی یەکانیان توێژینەوەی ورد دەکات، هاوکات ورد دەبێتەوە لە داب و نەریتی تیرە و نەوەو گەلانی سەر زەوی و دەیانباتەوە سەر ڕەچەڵەکی بنەڕەتی خۆیان، نەریتەکان بریتین لە کۆمەڵێك ڕەفتاری وەرگیراو کە نەوەکانی پشت بە پشت بۆیانگوازراوەتەوە، لە بنەڕەتدا گواستنەوەی نەریت و ڕەفتار لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر تەنها بە پەروەردە دەکرێت، واتە ئەوە شتەی ئەمڕۆ مرۆڤناسی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات دوێنێ پەروەردە گواستویەتیەوەو هێناویەتی، گواستنەوە بەخشین و گەیاندن و وەرگرتنە، کە ئەمانەش بەری ڕەنجی (کرداری فێرکردن) ن، بەڵام فێرکردن بۆ خۆی یەکێکە لە ئەرکوکارەکانی پەروەردە.

کاتێك ئەنسرۆپۆلۆجیا بەدوای ناسین و بۆلێنکردنی جۆرو ڕەگەزی مرۆڤدا دەگەڕێت، مەبەستی ئەوەیەکە (مرۆڤ) وەك گیانەوەرێکی باڵا لەسەر ئاستی گەردونی بناسرێت، بەڵام دیسانەوە ناسینەکەشی بێ مەبەست نیە، بەڵکو بۆ ئەوەیەکە مرۆڤەکان لەسەر بنەمایەکی زانستی یەکتری بناسن و بە شێوەیەکی بەرچاو ڕوونی مامەڵە لەگەڵ یەکتریدا بکەن بە مامەڵەیەکی نایاب و پەسەند و بەجێ، ئەمەش سەر لەنوێ لەگەڵ بازنەی کارەکانی پەروەردەدا یەك دەگرێتەوە، چونکە فێرکردن و ڕاهێنانی مرۆڤ لەسەر هەڵسوکەوت و ڕەفتاری بەجێ کارێکی سەرەکی پەروەردەیە.

مرۆڤناسی ئەرکی ناساندنی مرۆڤە بە مرۆڤ، ئەرکی پەروەردەش ناساندنی ژینگەیە بە مرۆڤ هەردولایان لە خاڵی (ناساندن) و (مرۆڤ) دا بە یەکتری دەگەنەوە، مرۆڤناسی باروودۆخ دەناسێنێ، پەروەردەش دەیسازێنێ، هەموو ئامانجە زانستیەکان لەگەڵ پەروەردەدا لە خاڵی مرۆڤدا یەکتری دەگرنەوە.

ئێستا دەپرسین :

- مرۆڤ بۆچی بە دوای خۆناسیندا دەگەڕێت؟

+ بۆ ئەوەی زیاتر ناخ و کرۆکی خۆی بناسێت.

- بۆچی؟

+ بۆ ئەوەی بەپێی ئەو خۆناسینە نەخشەی گەشە بەخۆدان دابڕێژێ.

- گەشە لە پێناوی چیدا؟

+ لە پێناوی ژیانێکی بەختەوەرانەو ئاسودەتردا.

- ئاخر گەیاندنی مرۆڤ بە ژیانێکی لەو جۆرە ئامانجی پەروەردەیە.

+ کەواتە پەروەردە و مرۆڤناسی هاو شێوەی یەکترین، لە کارو ئامانجیشدا تەواوکەری یەك پرۆژەی مرۆیین.

پەروەردە کاتێك دەتوانێت کار لەسەر مرۆڤ بکات کە ئەو مرۆڤە لە لایەن پەروەردە ناسراو بێت، واتە دۆسیەی ناسینی ئەو مرۆڤە لەلای پەروەردە هەبێت، چونکە پەروەردە فالگرتنەوە نیە، گۆچانێکی ئەفسوناویش نیە، جۆکەر نیە بۆ هەموو بارەکان یەك شێوازی چەقبەستوی هەبێت، بەڵکو پەروەردە هەڵقوڵاوی فەلسەفەی گشتی کۆمەڵگەیە، زادەی هێزی زۆرینەی تاکەکانی خەڵکە، هەریەکە لەوتاکانە سروشتی تایبەت بە خۆیو نەریت و ڕەوشت و کەسێتی سەربەخۆی هەیە، جیاوازی لە نێوان تاکە کەسەکاندا هەیە، ناتوانین ئەو جیاوازیانە لە بێخەوە دەربهێنین، بەلام دەتوانین چاکسازیان تێدا بکەین، بەپێی جۆرەکان شێوازی پەروەردەی نوێیان بۆ دەستەبەر بکەین، جیاوازی تاکە کەسەکان بیانوویەك نیە بۆ وەدەرنانیان لەناو پرۆسەی پەروەردەدا بەڵکو فاکتەرێکی باشە بۆ چێککردنەوەی پەروەردە خۆی و چالاککردنی و فراوانکردنی سنورەکانی.

کاری مـرۆڤ تـا ئـەو شـوێنە سـەخڵەت و گرانـە کـە خـۆی دەناسـێت، هـەر کاتێك مرۆڤ کە خۆی ناسی مانای وایە کە ئیتر دەتوانێت کۆدی خۆی بدۆزێتـەوە و بـەنێو یـەك بەیـەکی ژورو هەیوانـەکانی مێـشك و دەرونـی خۆیـدا بگـەڕێ، نەخشەی ورد بۆ تەلارەکانی بیرۆکەکانی خـۆی دابرێـژێ، بـە ئـارەزوی خـۆی یـاری بەو کەسانە بکـات کـە لـە مێشکیدان و بوونەتـە هـەورێکی تـەماوی سـەر خواسـتو ئاواتەکانی.

ئەو دەمەی مرۆڤ لە ڕێگەی مرۆڤناسیەوە بـەخۆی ئاشـنا دەبێـت، گـەلێك لە نهێنیەکانی خودی مـرۆڤ ئاشـکرا دەبێـت، چونکە ناسین و ناساندنەکە لەسـەر بنەمایەکی زانستیانـەیەو دورە لە سۆزو پیا هەڵدانی هەڕەمـەکی، خۆشـترین کـاتی مرۆڤ ئەو کاتەیە کە بۆ یەکەمین جار نهێنیـەك ئاشکرا دەکات، ئاشکرا بوونی هـەر نهێنیەکیش لەلای مرۆڤ مانای پێویست بوونی زیاتری مرۆڤەکەیە بـە پـەروەردە، چونکە پـەروەردە مادەیـەکی تـری خرایـە بەردەسـت کـە کاری لەسـەر بکـات، بـەم جـۆرە لەگـەڵ کـشان و فراوانبـوونی زانـستی مرۆڤناسـیدا زانـستی پـەروەردەش دەکشێ و فراوان دەبێت.

یەکەمین بوونەوەر کە سوود لە پـەروەردی وەردەگرێـت مرۆڤـە، کەواتـە دەبێـت یەکـەمین بوونـەوەریش کـە پێویـستە مـرۆڤ بیناسـێت (مـرۆڤ) بێـت، ئـەم کێـشەیەش تـەنها بـە پەیوەندیـە هاوبەشـەکانی نێـوان پـەروەردە و مرۆڤناسـی چارەسەر دەکرێت.

دوورنیە جارێك لە جاران لە ڕێگەوبان و گەشت و هـاتو چۆماندا نـا چار بووین کە ماوەیەکی زۆر لەلای کەسـێکی نەناسـیاوەوە دانیـشتوین، زۆر بەلامانـەوە ناخۆش بووە کە لەو کەسە جیا بینەوە بەبێ ئەوەی بیناسین، ئەی ئەگەر بۆ هەتا هەتایـە لەگـەڵ کەسـێکدا بـژیت کە نەیناسیت چۆنە؟ مەبەسـتم لـە ئەوەیـە کـە ئەگەر خۆت نەتتوانیبێت خۆت بناسیت ـ کەواتـە هـەموو ژیانـت لەگـەڵ کەسـێکی نەناسـراودا بەسـەر بـرد کـە خـودی خـۆت بوویـت، بەڕاسـتی تـۆ کەسـێکی خەمساربوویت کە بەدرێـژایی هـەموو تەمـەنی خـۆت نـەتتوانی تـەنها یـەك کـەس

بناسیت، نەك هەر ئەوە بەڵكو هەوڵیشت بۆ نەداو هەنگاویشت بۆ نەنا، نەك هەر ئەوە بەڵكو ئێستاش كە ئەم بابەتە دەخوێنیتەوە تەنها بۆ خوێندنەوەتە نەكو بۆ هەنگاو نان لە ئێستاوە بۆ خۆناسین، ئەو دەمەی خۆت دەناسیت ئینجا دەزانیت كە مرۆڤ چۆنەو چی دەكات و چی دەوێت و چی دەڵێت! لە كوێدا سەركەوتووە و ڕاستە و لە كوێدا ناڕاست و شكست خواردوە؟ چۆن خۆی بكڕێتەوە و چێژی سەركەوتن و بەهای مرۆڤایەتیانە بۆ خۆی دەستەبەر بكات؟ نهێنی یەكانی ئەو دیوی مرۆڤبوونمان چین؟ لە مرۆڤبونماندا چیمان دەستكەوتووە و باجی چیمان داوە؟ چیمان كردو ئێستا دەبێ چی بكەین؟! لەناو ئەو هەموو مرۆڤە زۆرانەی سەر زەویدا كامیان تۆیت و بەچیدا خۆت دەناسیتەوە؟

# پەیوەندی پەروەردە بەسۆسیۆلۆژیاوە

کۆمەڵناسی یەکێکە لەو زانستە کۆمەڵایەتیە گرنگانەی کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا وەك زانستێکی سەربەخۆ دەرکەوت، هەوڵ دەدات بۆ گەیشتن بە دۆزینەوەی ئەو یاساو دەستورانەی کە دیاردە کۆمەڵایەتیەکانیان پێ ڕاڤە دەکرێت، یان لە دیاردە کۆمەڵایەتیە مرۆییەکان دەکۆڵێتەوە، جا ئەو گروپە مرۆییانە لە شێوەی تاکدا بن یان لە شێوەی کۆمەڵدا.

هەوڵی ڕاستەقینە و مەبەستی سەرەکی ئەم زانستە ئەوەیەکە هاوکاری مرۆڤ بکات بۆ گونجاندنی لەگەڵ ئەو ژینگە مرۆییە کۆمەڵایەتیەی تیایدا دەژی، گرنگترین شت کە کۆمەڵناسی لێی دەکۆڵێتەوە بریتین لەم تەوەرانە :

١. گروپە کۆمەڵایەتیەکان.
٢. کردە و ڕەفتارە کۆمەڵایەتیەکان
٣. ڕۆشنبیری
٤. گۆرانکاری

بەم پێیە ئەم زانستە دەیەوێت بەوردی لایەنی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤ بناسێت و لێکی بداتەوە، ڕوونی بکاتەوە تا چ ڕادەیەك خودی ئادەمیزاد وەك بونەوەرێکی مرۆیی هەڵگری خەسڵەتی کۆمەڵایەتیە، ئەم خەسڵەتە چ سودێك بە مرۆڤ دەگەیەنێت و پەیوەندی بە ژیان و ئاسودەییەوە چییە، لە ڕاستیدا ئەم زانستە بەبێ مەبەست خۆی سەرقاڵ ناکات بەم لێکۆڵینەوە وردو هەستیارانەوە، بەڵکو ئامانجی ناسینی لایەنی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤە تاکو وابکات خۆشترین ژیان بۆ مرۆڤەکان فەراهەم بهێنێ لە چوار چێوەی خێزان و کۆمەڵگە جۆراو جۆرەکاندا.

لە ڕوانگەی زانایانی کۆمەڵناسەوە هەموو ئۆرگا ن و دامەزراوە و گروپ و سستمێکی مرۆیی، دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتین، هەر لەسەر ئەو بنەمایەش تێڕوانینیان دادەمەزرێنن بۆ هەموو شتێکی تر، بۆ نموونە ئەوان وەك دەزگایەکی

کۆمەڵایــەتی دەروانننــە دامــەزراوە پەروەردەییــەکان و قوتابخانـــە و خێـــزان و حکومەت و دەوڵەت و کۆمەڵگە، لـە چوارچێوەی تێڕوانینـی ئـەم زانستەوە تـاك و کۆی کۆمەڵگە وەك بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی تەماشا دەکرێن و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. هاوکات سـەرجەم ڕەفتـارە مرۆییـەکان بـە تیـۆرە کۆمەڵایەتیـەکان ڕاڤـە دەکات.

مێـژووی کۆمەڵناسـی دێرینـە و بـە شـێوەی کولتـورێکی زارەکـی ماوەتـەوە، شوێنەوارو کاریگەریەکی گەورەی لەسەر شارستانێتی بەجێهێشتووە، تەنانـەت ئـەم زانستە بە جۆرێك فراوانـە کـە گـەلێك لـق و پـۆپی تـری لێکەوتوەتـەوە، لەوانـەش (زانستی کۆمەڵناسی پەروەردەیی) کـە کتومـت ئـەو ئەرکانـە جێبـەجێ دەکات کـە ئێمە دەمانەوێت لە چوارچێوەی پرۆسەی پەروەردەییمانـدا سوودی لێ وەربگـرین، سـەر لـەنوێ ئـەمیش لقـی تـری لێدەبێتـەوە، وەك (زانـستی کۆمەڵناسـی قوتابخانەیی)ئەم زانستە تایبەتـە بـە لێکۆڵینـەوە لەسـەر لایـەنی کۆمەڵایەتیانـەی خوێندن، فێرکـردن، پـۆل، قوتـابی، قوتابخانـە، مامۆسـتا، کـادرو شـارەزایانی کـارای بـواری پـەروەردەیی تـەنها لـە سـنوری قوتابخانـەدا، بـەوردی کارلێکـە ژیـری یـە هاوبەشەکانی نێوانیان لێـك دەداتـەوە و نەخـشە دادەڕێـژێ بـۆ باشـترین پـەروەردە کردنی کۆمەڵایەتیانەی نەوەکان.

لەمانـەش زیـاتر ئـەمڕۆ کۆلیـژو پەیمانگـەی تایبـەتی هەیـە بـۆ پێگەیانـدنی کەسانی پرۆفیشناڵ لەو بوارەدا وەکو توێـژەری کۆمەڵایـەتی، ڕابـەری کۆمەڵایـەتی، ئاراسـتەکاری پـەروەردەیی، چارەسـازی کۆمەڵایـەتی، ڕاوێـژکاری کۆمەڵایـەتی. پەروەردە خۆیشی ئامانجی ئەوەیە کە مرۆڤەکان ڕابهێنێ لەگەڵ گونجاندن لـە ڕوی کۆمەڵایـەتی و سروشـتیەوە بـۆ ئـەو کەسـانەی لـە دەوروبـەری دەژیـن، کەواتـە پەروەردە دووجار پەیوەستە بە کۆمەڵناسیەوە، جارێکیـان لـە ڕوی پیشەیی یـەوە، چـونکە ئـەو پێگەیانـدن و ئاراسـتە کردنـە پەروەردەییـە وەزیفـەی پـەروەردە خۆیەتی کە لە بەرژەوەندی کۆمەڵناسیدایە، جارەکەی دیکەش ئەوەیە کۆمەڵناسی پێویستیەکی گەورەی بە پەروەردە هەیە، چونکە تـەنها ئـەوی بـە دەستەوەیە کـە

پرانسیپی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤەکانی بۆ بگرێتە ئەستۆی خۆی.

ئەمرۆ لە کوردستان زۆر پێویستمان بە کارابونی زانستی کۆمەڵناسی هەیە، چونکە نەوەی نوێ زۆرینەی ژیانی کۆمەڵایەتیانەی کلاسیکی ڕەت کردۆتەوە و بە دیلەکەیشی نەدۆزیوەتەوە لەبەر ئەوە کەلەبەرێکی گەورە و قەیرانێکی دژوار جێگەی ئاسودەیی ژیانی کۆمەڵایەتیانەی نەوەی نوێیان گرتوەتەوە، بە چاوی خۆمان ڕۆژانە دەیان کوڕوکچی گەلەکەمان بەدی دەکەین کە بێزارن و حەز لە تێکەڵاوی خەڵك و خزم و دراوسێ ناکەن، تەنانەت کارگەیشتوەتە ئەو ئاستەی منالانی یەك خێزان پەیوەندی کۆمەڵایەتیان لاوازە، نەوەکان بەرەو ژیانی تەنیایی و گۆشەگیری دەڕۆن، ئەمەش ئاکامی دەرونی و جەستەیی و ژێری خراپی لێدەکەوێتەوە، یاخی بون و دڵەڕاوکێی دەبێتە دیاردەی ژیانی ئایندەی ڕۆڵەکانمان، لەم بارەدا سستمی پەروەردەی وڵات بەرپرسیار دەبێت، چونکە نەیتوانیوە پەیوەندیە هاوبەشەکانی نێوان پەروەردە و کۆمەڵناسی بپارێزرێت و گەشەی پێبدات و لە خزمەتی پەروەردە کردنێکی کۆمەڵایەتیانەی ڕاست و دروستدا بەکاریان بهێنێ، هەموو ڕەوشتە کۆمەڵایەتیەکان لە بوتەی کۆمەڵناسیەوە دێنە دەرە و پەروەردەش دەیانچەسپێنێ.

# پەیوەندی پەروەردە بەبایۆلۆژیاوە

بایۆلۆژیا، ئەو زانستەیەکە کەلە زیندەوەران دەکۆڵێتەوە و هەموو ڕوکارەکانی ژیان و زیندەییان لێکدەداتەوە، سروشت و خەسڵەتەکانیان دەدۆزێتەوە و ڕاڤەیاندەکات، ڕوی لێکچون وجیاوازەکانیان بەراورد دەکات، واتا دەگەڕێت بە دوای چۆنیەتی پێکهاتن و دروستبونیان و گەشە کردن و پەرەسەندنیاندا، زنجیرەی ئەڵقەیی پێکەوە بەستنیان لە پەیژەی پەرەسەندنیاندا دیاری دەکات، دواتر بە وردی و لەسەر بنەمایەکی زانستیانە یەك بە یەك توێکاری بۆ هەریەکەیان دەکات، بەمەش مرۆڤ بە تەواوەتی لە سروشتی بون و ژیان و تایبەتمەندێتی هەریەکەیان شارەزا دەبێت و سوودی لێ وەردەگرێ بۆ ناسینی گیانەوەران و زیندەوەرانی دەوروبەری کە هاوبەشی دەکەن لە ژینگە و ئاووهەوادا، ئەمەش دەستکەوتی گەورەیە بۆ مرۆڤ چونکە لە ڕێگەی ناسینی گیانەوەران و زیندەوەرانەوە، مرۆڤ دەتوانێت بگاتە دۆزینەوەی پێگەی خۆی لەم سروشتەداو هانیشی دەدات بۆ چاکتر ناسینی خودی خۆی وەك زیندەوەرێکی بایۆلۆژیانەی گەردونی و گیانەوەرێکی ژیری پەرەسەندوو، بالێرەدا بوەستین و بزانین پەروەردە، وەك زانستێکی مرۆیی چی دەوێت و بەدوای چیدا دەگەڕێت؟!

وەك لە زنجیرەکانی پێشووتری ئەم باسەدا ئاماژەمان پێکرد، پەروەردە بەدوای دۆزینەوەی یاساو ڕێسا گشتیەکانی ژیاندا دەگەڕێت (واتا بایۆلۆژیای گشتی) لەگەڵ گەڕان بە دوای دۆزینەوەی ئەو یاسایانەی تایبەتن بە خۆرمۆلۆژیا و توێکاری زانی و بایۆلۆژیای مرۆڤ بە تایبەتیی و ناسینی تێکەڵ و پێکهاتە مرۆییەکان و گیراوە و ئاوێتە بایۆلۆژیەکانی. بەتێڕوانینێکی وردی هەریەکە لە کاری پێناسەییانەی هەریەکەیان بۆمان دەردەکەوێت کە (پەروەردە) و (بایۆلۆژیا) بەڕادەیەکی ئەوتۆ لەیەکتریەوە نزیکن کە وەکو ئەوە وایە لەکاتی ئامادەنەبوونی یەکێکیان دا ئەوی تریان کاری نادیارەکەیان بکات. چونکە لەهەردوکیاندا مرۆڤ

سەنتەری سەرەکی کارلێکردنەکەیە، واتە پەیوەندیەکە ڕاستەوخۆیە، ئەوەتا بایۆلۆژیا دەکۆڵێتەوە لە مرۆڤ و شێوازی ژیان و پەرەسەندن و زۆر بوونی و پێکهاتەکانی وەك (تاکێکی زیندوو)، هاوکات پەروەردەش سەرقاڵە بەدوای دۆزینەوەی باشترین پەراوە و ڕاهێنانی مرۆڤدا بۆ ئەوەی ڕایبهێنێ لەگەڵ ژینگەو دەوروبەری لە پێناوی گونجاندن و هەڵکردنندا لەگەڵ ژینگەی سروشتی و ژینگەی کۆمەڵایەتیدا، لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردە توێژینەوە دەکات لە ڕەفتارەکانی تاکو کۆی کۆمەڵگە و نمونەی مرۆڤە جۆراوجۆرەکان بەچەشنێ کە شیاوی هاوژیانی گیانەوەران و زیندەوەرانی دەوروبەریان بن و ئاسودەیی لە یەکتری تێك نەدەن، بەڵام ئەم شێوازی گونجاندنەش لە یەك ستایلی یەك شێوەی نەگۆڕدا نیەو پەیتا پەیتا دەگۆڕێت بەپێی ئەو گۆڕانە ژیری و جەستەیی و کۆمەڵایەتی و بایۆلۆژیانەی بەسەریدا دێت، گونجاندن کەسەنتەری کاروباری پەروەردەیە، بەلای زانایانی بایۆلۆژیەوە ئەرکێکی بایۆلۆژیانەی زیندەوەرانە و خەسڵەتێکی درێژەدانە بە پاراستنی نەژادو هێشتنەوەی جۆرایەتی و شێوازێکەلە شێوازەکانی بەرگری لە پێناوی مانەوەدا.

لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە ئەگەر لە گۆشەی پەروەردەییەوە بڕوانینە مرۆڤ ئەوا مرۆڤ بونەوەرێکی پەروەردەییەو بایۆلۆژیا دەیناسێنێ، ئەگەر لە گۆشەی زیندەوەرزانیەوە تەماشای مرۆڤ بکەین ئەوا مرۆڤ بونەوەرێکی بایۆلۆژیەو پەروەردەدەیگونجێنێ (واتە فێری هونەری گونجاندنی دەکات) بەم شێوەیەش هەریەکە لە پەروەردە و بایۆلۆژیا لەیەك کاتدا کار لەسەر مرۆڤ دەکەن و کاریشی بۆ دەکەن و لەلایەن مرۆڤیشەوە کاریان تێدەکرێت، واتە مرۆڤ ئەڵقەی پێکەوە بەستنی بایۆلۆژیاو و پەروەردەیە، بەواتایەکی تر پەروەردە و بایۆلۆژیا بەهۆی مرۆڤەوە یەکتری دەگرنەوە.

لە لایەکی ترەوە بایۆلۆژیا وەك دایکێك وایە، چونکە گەلێك جۆر زانستی تری لێکەوتوەتەوە، لەوانەش زانستی پزیشکی نەخۆشیزانی، پشکنینەکان و........ هتد، هەمووشیان لە خزمەتی مرۆڤدان، واتە بۆ پاراستنی لەشی مرۆڤن، بەڵام

مـرۆڤ تـەنها بـە تەندروسـتی لـەش ولار تـەواو نابێـت و پێویـستیەکی زۆری بـە دەروندروسـتی و ئاراسـتە کـردن هەیـە، ئەگـەر لـە ڕوی لۆژیکیـشەوە بپرسـین ئایـا مرۆڤ تـەنها لـە شـساخی بەسـە یـان لایـەنی ڕۆحـی و دەرونـی و ژیـری و هزریـشی گرنگە و دەبێت بایەخی پێبدرێت؟ وەڵامەکەی ڕوونە. کەوا بێت کاری گۆشـکردنی ژیـری و ئاراسـتەی ڕەفتـاری و چاکسازی کۆمەڵایـەتی ئـەرکی پەروەردەیـە، بـەواتا فراوانەکـەی بایۆلۆژیـا پـەروەردەی جەسـتەیی مـرۆڤ دەکـات و پـەروەردەش بایۆلۆژیـای ڕۆحـی مـرۆڤ دەکـات، پێکـەوە مرۆڤێکـی سـاخ و پـەروەردەکراو پێـشکەشی کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی دەکـەن، هـەر لەبـەر ئـەم خاڵـە گرنگەیـشەکە (زانستی بایۆلۆژیا) وەك وانەیەکی سەرەکی بەشێوەیەکی فەرمی لەناو پرۆگرامـی پەروەردە و فێرکردنی هەموو گەلانی جیهاندا هەیە، هەر لە قۆنـاغی بنەڕەتیـەوە تاکو زانکۆیی و دواتریش.

پەیوەندی نێوان پەروەردە و بایۆلۆژیا بە جۆرێك تۆکمەیـە کـە هـەرگیز ناتوانین لە یـەکتریان جیـا بکەینـەوە، لـە کۆتاییـدا دەڵـێین : بایۆلۆژیـا ناسـنامەی جەستەمانەو پەروەردەش ناسنامەی مەعنەویمانە.

# پەیوەندی پەروەردە بەسایکۆلۆژیاوە

لەبەر ئەوەی سایکۆلۆژیا مێژوویەکی دێرینی هەیە، گەلێك نەتەوەو گەل و چاخ و سەردەمی دیتوە، هاوکات زۆر پێناسەیشی بۆ کراوە، بەلام بەشێوە گشتیەکەی، سایکۆلۆژیا ئەو زانستە وەسفی یە بڕیاردەرمیە کە ڕەفتاری زیندەواران و گیانەوەران وەك خۆی وەسف دەکات، دواتر بەشێوەیەکی پەتی و بێلایەنانە ڕاڤەیان دەکات، واتە بوونەوەرەکان بەو شێوەیەی کە هەنەوەسف دەکات نەك بەو شێوەیەی کە دەبێ هەبن، مەبەستمانە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە سایکۆلۆژیا توێژینەوە لەسەر واقعی حاڵ دەکات، نەك لەسەر ئەوەی کە دەبێت چۆن چۆنی بێت، یان دەبوایە چۆن چۆنی بوایە.

سایکۆلۆژیا ئەو زانستەیەکە لە ڕەفتاری زیندەوەران دەکۆڵێتەوە بەتایبەتیش لە مرۆڤ، ڕەفتاریش بریتیە لەسەرجەم گفتارو کردارو چالاکی یە مێشکی یەکانی مرۆڤ و جوڵە چالاکیەکانی، بەکورتی سایکۆلۆژیا زانستی توێژینەومیە لە ڕوکاری چالاکیە مرۆییەکان، مرۆڤیش ئەو بونەوە و ژیرمیە کە لەگەڵ ژینگە جۆراو جۆرەکاندا خۆی دەگونجێنێ، ئەم خاڵەش پەیوەندیەکی تۆکمەی بە پەروەردەوە هەیە، چونکە سایکۆلۆژیا زانستی گونجاندنی مرۆڤە لەگەڵ دەوروبەرداو پەروەردەش کاری گونجاندنەکە ئەنجام دەدات و بەشێوەیەکی پراکتیکی کار دەکات بۆ پێکەوە جۆشدانی مرۆڤ و دەرەوەی مرۆڤ.

سایکۆلۆژیا هەوڵی گونجاندنی مرۆڤ دەدات لەگەڵ مرۆڤ و ژینگەدا بە دانانی ڕێ و شوێنی پێویست لە مسۆگەرکردنی پێویستیە دەرونی یە مەعنەویەکان و چاکسازی و لابردنی کۆسپ و لەمپەرەکان، ئامانجی ئەومیەکە مرۆڤ خاوەنی کەسێتیەکی سەرکەوتوی گونجاو بێت، بەرگەی گۆرانکاریە دژوارەکان بگرێت، بەشێوەیەکی لۆژیکی و پەسەند بیربکاتەوە و خۆی لە نەخۆشی و دیاردە دزێوەکان بپارێزێت.

سایکۆلۆژیا له هەوڵی ئەوەدایە کە والە منداڵ بکات کە زیرەکتر بێت و بەشێوەیەکی باشتر توانای هزری و دەرونی خۆی بەکار بهێنێ و داهێنەر بێت و بەدوای ئاسودەیی ژیاندا بگەڕێت.

دەرونزانی بە جۆرێك فراوان بوەکە گەلێك لق و پۆپی تری لێکەوتوەتەوە هەندێکیان تیۆری و هەندێکی دیکەیان پراکتیکین، ئەم پەرەسەندنەش بەردەوام دەبێت، سایکۆلۆژیای گشتی بە دایکی سایکۆلۆژیەکانی تر دادەنرێت، زوربەی چالاکیەکانیشی لەو بوارە دایە کە پەیوەستە بەکاروباری پرۆسەی پەروەردە، وەك سایکۆلۆژیای منداڵ و هەرزەکار، کەسێتی، گەشە، فێرکردن، دەگمەنەکان، یاری، جیاوازیەکان، زمان، سایکۆلۆژیای پەروەردەیی، کە ئەمەیان تیۆروپاساکانی خۆی لەبوارە مەیدانیەکانی پەروەردەو فێرکردندا دەخاتە کار، ئەو زانستەیەکە بایەخ بەکرداره پەروەردەییەکان دەدات، بەتایبەتیش فێربوون و فێرکردن و وانە وتنەوەی پەسەند.

سایکۆلۆژیای نوێی پەروەردەیی لە مانەش زیاتر دەکات و وەك جاری جاران تێکەڵەیەك نیە لە تیۆرو بۆ چوونی دەروونی دەربارەی فێرکردن، بەڵکو بەڕادەیەك فراوانتر بوەو گەیشتوەتە سەر ئاستی سەربەخۆیی، بەڵکو بە تەواوەتی بە دەوری سێ تەوەرەی سەرەکیدایە کە بریتین لە (فێرکردن، فێربوون، وانەوتنەوە)،چونکە ئەم سایکۆلۆژیایە لە لایەن خۆیەوە بەجیا پێناسەی تایبەتی بۆ پەروەردە دەکات، زانایانی بواری سایکۆلۆژیای پەروەردەیی لەو باوەڕەدان کە پەروەردە بریتیە لەو کارەی هەوڵ دەدات بۆ گۆڕینی ڕەفتاری قوتابیان و کرداری فێرکردنیش سازدانی بارودۆخە بۆ هێنانەکایەی ڕەفتاری سەرکەوتوو پەسەندی قوتابیان، سایکۆلۆژیای پەروەردەیی بە یەکێك لەبنەما سەرەکیەکانی ڕاهێنان و مەشقی مامۆستایانی پەیمانگە و کۆلیژەکانی پەروەردە دادەنرێت، چونکە ئەم شوێنانە. دەروازەی هاتنە دەرەوەی کەسانی شارەزای بواری پەروەردە و فێرکردنن، کاری سەرەکی ئەم زانستە باربۆکردنی مامۆستایانە بەو بنەما دەرونیانەی لە بواری کاری پەروەردەیی دا پێویستن، بەم هۆیەوە مامۆستایان

جۆرەها کەسێتی و دەروونـی مرۆڤـەکان دەناسـن و چـەندین ڕێگـەی نایـاب شـارەزا دەبن دەربارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا.

هاوکات پەروەردەش پرەنسیپێکی کۆمەڵایەتیانەی مرۆیی ئاراستەکارانەیە بۆ گۆشکردن و ئاراستەکردنی مرۆڤ سەبارەت بە ناسینی دەوروبـەری و چۆنیەتی مامەڵـەکردنێکی بـەجێ و پەسـەند لەگـەڵ خـەڵك و ژینگـەدا، کەواتـە پـەروەردە بـەجۆرێکی تـر هـەمان ئـەو کـارە دەکـات کـە سـایکۆلۆژیا دەیکـات، بەتایبـەتی لێکچونێکی زۆر هەیـە لـە نێـوان کـاری سـایکۆلۆژیایی پـەروەردەیی و کـاری خـودی پەروەردەدا.

لەمەوە دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە پـەروەردە و سـایکۆلۆژیا نـەك هـەر دوو زانستی لێکەوە نزیکن، بەڵکو بە تەواوەتی بەیەکدا چوون و تەواوکەری یەکترین.

لە هەموو  بارودۆخ و سـەردەمەکاندا بـۆ ئەنجامنـدانی کـاری پـەروەردەیی پێویستیەکی زۆرمان بە سایکۆلۆژیا دەبێت، هـەموو کەسـێکی پـەروەردەیی گرنگـە کـە کەسـێکی سـایکۆلۆژیش بێـت، بەتایبـەتیش ئەوانـەی لـەناو سـنوری سـستمی پەروەردەی هەرێمی کوردستاندا کار دەکەن.

پەروەردە ناتوانێت ئـەرك و کـاری خـۆی بکـات بەشـێوەیەکی سـەرکەوتوو، ئەگەر سایکۆلۆژ پشـتیوان و هاوکاری نەبێت، چونکە سایکۆلۆژیا سیفی و پێناسـی دەروونـی یەکـە بەیەکـەی مرۆڤـەکان دیـاری  دەکـات و دەیخاتـە ڕوو، بـەو هۆیـەوە دەزانرێـت کـە فلانەکـەس کـە تەمـەن و ڕەگـەزی دیـاریکراوە چـۆنە لـە ڕووی دەرونـدروسـتی و هـەر لێـچوونەکانی و هەڵوێـست و ڕەفتارەکانیـەوە، هـەروەها دەروونـزانـی نـاخ و جەوهـەری ڕاسـتەقینەی مرۆڤـەکان بەیـەکتری دەناسـێنێ، لـە ڕوانگەی دەرونزانیەوە هەرگیز تەماشای ڕواڵەتی مـرۆڤ ناکرێت بەتـەنها و بڕیـار لەسـەر بەهاوکەسـێتی ئـەو مرۆڤـە نادرێـت، بـەڵکو کەسـێتی یـە نهێنـی و نادیـارو شـاراوەکەی دەبینـێ و بـەو پێیـە بڕیـار لەسـەر بـەهاو ئاسـت و دەرونـدروسـتی و لێهاتوویی و تواناکانی دەدرێت و لە ڕووی لایـەنی هـەموارو ناهـەموارەوە بـە وردی هەڵدەسەنگێنرێت.

دەروونزانی لە توێژینەوەی ورددا وەڵامی چەندین پرسیارمان دەداتەوە لە بارەی ناخی کەسەکانەوە، بەبێ ئەوەی لایەنگری و پەردەپۆشی بکات و میزاجی تێدا بەکاربهێنێ، ڕاستیەکان وەك خۆیان دەخاتە ڕوو لە بارەی کەسێتی و دەروونی ئێستای ئەو مرۆڤەوە و زۆر ناچێتە قوڵایی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ڕابوردووی و ئایندەی، جگە لە بارە دەگمەن و پێویستەکان.

سایکۆلۆژیا وەڵامی چەندین پرسیارمان بۆ ئامادە دەکات، وەکو :

- ئەو کەسە کێ یە؟ کەسێتی یەکەی چۆنە؟ لە کام جۆرەیە؟
- لایەنی هەموارو نا هەموار لە کەسێتی ئەو مرۆڤە دا کامەیە؟
- بیرو ئەندێشەی چۆنە بەرانبەر بە خودی خۆی و کەسانی تر؟ لەکام ئاست و جۆری هەڵچووندایە؟ چۆن خاڵە لاوازەکانی بەهێز دەکات و دەبێتە کەسێکی کەسێتی بەرزو سەرکەوتوو؟

# تیۆرە پەروەردەییەکان و بۆ چونی زانایانی پەروەردە

پـەروەردە، پێگەوجێگـەوتی تایبـەتی خـۆی هەیـە لەناوجەرگـەی ژیـارو شارستانێتیە دێرینـەکانی گـەل و نەتـەوە جۆراوجۆرەکانـدا، دەرکەوتنی بایـەخی پەروەردە و مـەودا فراوانـەکانی لەسـەر ئاراسـتەی ژیـانی خـەڵکی و هەوڵـدان بـۆ پاراستنی کولتوری وایکردوەکە پەروەردە گەشەیەکی باش بکات و کارلێکی هزری بکات لەگەڵ خودی مرۆڤ دا، لە ئەنجامی ئەمەشدا پەروەردە بوەبەو مادە گرنگـەی کە وەکو هەوێنی ژیان ئاوێتەی هەموو لایەنـەکانی گوزەرانی خـەڵکی بـووە، دیـارە خەڵکیش هەمە جۆرو هەمـە ئاراسـتەن و چەشـنی بیرکردنـەوەکانیان جیـاوازە لـە یـەکتری، کەواتـە تێڕوانینیـشیان بـۆ تێگەیـشتن لـە پـەروەردە جیـاوازبوو، بـەڵام جیاوازیەکانیش لە نێوان بۆ چوونەکانیاندا بەڵگەیە لەسەر فراوانی چەمکی واتای پەروەردە و بەرینی مەوداکەی.

لێرەدا بەنمونە هەندێ لەو بۆچوونانە دەخەینـە ڕوو کـە بـوون بەمایـەی سەرهەڵدان و داڕشتنی تیۆرە پەروەردەییەکان لە چاخە دێرینەکان و نوێیەکاندا.

(کۆنفۆشیوس) ([٢])کە بەبـاوکی ڕۆحی گەلی چین دادەنـــرێت و مـــەودای ژیـانی لـــە نێـوان (٥٥١ – ٤٧٨) پـێش زایـن بـووە، دەربـارەی پـەروەردە دەڵێـت : (سروشـت ئـەو خواوەندانـەی بـە ئێمـە بەخـشیوە ڕێرۆیشتنیـشمان بـەپێی مەرجەکانی سروشت ڕێرویشتنێکی دروستە و بەو جـۆرەش لەسـەرمان پێویـستە، بـەڕێوەبردنی ئـەو ڕێگەیـە و ڕێکخـستنەکەی بریتیـە لەمەبەسـتی پـەروەردە و فێرکردن، (ئەفلاتون) یش کە (١٣١) سـاڵ دوای کۆنفۆشـیوس کۆچی دوایی کـردوە دەربـارەی پـەروەردە دەڵێـت : (پـەروەردە خـستنە سـەری هـەموو جـوانی و

---

[٢] لە بەشێکی ئەم کتێبەدا بەناوی ژیاننامەی پەروەردە ناسێکی جیهانی بە درێژی باسی ژیانی کۆنفۆشیوسمان کردوە.

تەواویەکانە –بەپێی توانا - بۆسەر جەستەمان)، ئەگەر چی لە بنەڕەتدا (ئەفلاتۆن) لەو باوەڕەدایە کە هەرگیز مرۆڤ ناتوانێ بگاتە پلەی تەواوێتی ڕەها، (جۆن ملتۆن) کە سنوری ژیانی لە نێوان (١٦٠٨ – ١٦٧٤) دایە دەڵێت : (پەروەردەی تەواوەکە دەتوانێت وا لە مرۆڤ بکات چاك بێت و شیاوبێت بۆ ئەنجامدانی هەر کارێکی گشتی و تایبەتی بەو پەڕی وردی و سپاردەیی و دەست پاکی و شارەزاییەوە لە کاتی جەنگ و ئاشتیدا بە شێوەیەکی زۆر دادپەروەرەرانەو زرنگانە و هزرو بیرێکی فراوانەوە) بەڕاستی ئەمە تێڕوانین و دەربڕینێکی گەورەیە دەربارەی پەروەردەو هزری پەروەردەیی کە (٣٣٣) ساڵ بەر لە ئەمڕۆ هەستی پێکردوە، دوای تێپەڕبوونی (٣٨) ساڵ بە سەر کۆچی (ملتۆن) دا یەکێك لە گەورە شارەزایانی بواری پەروەردە دەرکەوت کە ئەویش بریتیە لە ژان ژاکڕۆسۆ (١٧١٢ – ١٧٧٨)، ئەم زانا گەورەیە شارەزایەکی ناودار بوە لە بواری هزرو سیاسەت و کۆمەڵایەتیدا.

دەربارەی پەروەردە دەڵێت : (ئەرکی پەروردە ئەوەیە کار بکات بۆ ڕەخساندنی دەرفەتە مرۆڤایەتیەکان تاکو منداڵ لەسەر سروشتی خۆی گەشە بکات و لە ڕوانگەی خواستو ئاواتەکانیەوە سەر چاوەی گرتبێت)، ئەم زانایە گەلێك لێکۆڵینەوەی وردو بەرهەمی گرنگی هەیە دەربارەی پەروەردە، هەلگیرسێنەری بڵێسەی شۆڕشی پەروەردەیی دادەنرێت.

ئەمانۆئێل کانت (١٧٢٤ – ١٨٠٤) بە ئاڕاستەیەکی تردا باسی پەروەردە دەکات و دەڵێت : (پەروەردە سەرجەم) ئەو لایەنانەیە کە شایستەی پەرە پێدانن لە تاکدا، ئامانجی پەروەردەش ئەوەیە کە هەموو ئامادەگیەکانی ئەو تاکە پەرە پێبدرێ – کە لە توانادایە – بۆ گەیشتنی بە تەواوەێتی) ئەگەر چی ئەم بۆ چوونە نوێ یە، بەڵام ڕەگی گەڕانەوەی تێدایە بۆ (١٤٠٠) ساڵ پێش خۆی، واتا بۆ چوون و لێکدانەوە مەزنەکەی (ئەفلاتۆن)، چونکە دیسان پەروەردە دەبەستێتەوە بە هەوڵدانی مرۆڤ و گەیشتن بە تەواوێتی (تکامل)، پستالۆتزی (١٧٤٦ – ١٨٢٧) زانایەکی پەروەردەناسە و ئاماژە بۆ سێ تەوری گرنگ دەکات لە کاری

پەروەردەدا و دەڵێت : (پەروەردە ئامادەکردنی مرۆڤەکانە بۆ ئەوەی بتوانن بەکارو ئەرکە جۆراو جۆرەکانیان هەستن، ئەمەش پەرەپێدانی هەموو توانا عەقلیەکانی دەوێ بە پەرەپێدانێکی تەواو و گونجاو).

(جێمس میل) پەروەردە بە ئاسودوییەوە دەبەستێتەوە و پێناسەی خۆی هەیە بۆ پەروەردە، کە دەڵێت : (پەروەردە ئەوەیە کەوا لە تاك – یان تاکەکان – بکات کە ببنەمایەی ئاسودەیی و خۆشبەختی بۆ خۆی و کەسانی تر) ئەمە رەهەندێکی رەوشتیانەی پەروەردەیە و (میل) زۆر جوان پێکاویەتی، (هەربات) کە دانایەکی پەروەردە ناسە (١٧٧٦ – ١٨٤١) دەربارەی پەروەردە دەڵێت : (پەروەردە بابەتی زانستێکە کەوا لە ئامانجەکەی دەکات بریتی بێت لەوەی تاکێك پێکبهێنێ لە پێناوی خودی خۆیدا – واتە تاکەکە – لە رێگەی گرتنەبەری ئەو هۆکارانەیکە دەبنەمایەی بەهێزکردنەوە و راچەنینی حەزو خواست و ئارەزووەکان).

(فرۆیل) ١٧٨٢- ١٨٥٢ لە روانگەی هەر باتەوە بە گۆشەنیگایەکی تر پەروەردە دەناسێنێ و دەڵێت : (پەروەردە کارێکە بە هۆیەوە کانی توانا شاراوەکانی بواری فێربوونی مرۆڤی پێ دەتەقێت، هەر وەکو چۆن خونچە و چرۆی گوڵ و رووەکەکان دەتەقێت و دەپشکوێت).

گەلێك زانا و پەروەردە ناسی تر هەیە کە هەریەکەیان لە گۆشەیەکی تایبەتیەوە لە پەروەردە تێگەیشتوون و پێناسەیان کردوە، لەوانەش (ستبۆرات میل) ١٨٠٦ – ١٨٧٣، (هەربێرت سبنسر) ١٨٢٠ – ١٩٠٣، (ولیەم جێمس) ١٨٤٢ – ١٩١٠، (ئەمیل دۆرگایم) ١٨٥٨ – ١٩١٧، (جۆن دیوی) ١٨٥٩ – ١٩٥٢ کە هەمیشە دەیگوت (پەروەردە ژیانە.. ژیان).

ئەمانە و چەندین زاناو داناو توێژەری دەروونی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەناس و روناکبیرو مامۆستاو نووسەرو سیاسەتمەدارو ئابوریناس و فەیلەسوف و..... هتد، راوبۆچوون و تێروانین و سەرنج و رەخنەو پێشنیارو تیوری خۆیان هەیە لەسەر پەروەردە، چ وەکو لایەنی تیۆری و چ وەکو لایەنی پراکتیکی، دیارە هەریەکە لەوانە لە وڵات و نیشتمانی خۆیان و بەپێی ئەو

کەلتورو نەریتە باوەی لای خۆیان و لەسەردەم و چاخی جیاجیادا ئەو ڕاو بۆ چوونانەیان دەربڕیوە، دەکرێت هەندێ لەو بۆ چوونانە تایبەت بن بەو گەل نەتەوەو نیشتمانەی تیایدا بوون لەوسەردەمەدا و بۆ ئێستای هەمان گەل و میللەت ناڕاست بن، دەشکرێت هەندێ لەوانە بۆ ئێستا و ئایندەی خۆیان ڕاست بن بەلام نەبونەتە پرەنسیپێکی نێودەوڵەتی و نەگەیشتوونەتە ئاستێکی جیهان فراوانەوە، یاخود گەیشتونەتە ئەوەشی، بەلام دیسان بۆ چاخ و سەردەمی ڕابوردووی هاوچەرخانەی خۆیان بووە و بە کەڵکی ئەمڕۆ نایەن، بە کورتی بۆ چون و تیۆرە پەروەردەییەکان بەپێی نەریت و کولتور، یان (شوێن) و (کات) جۆراوجۆرن و ئاستی جیاوازیان هەیە.

جا لەبەر ئەوەی لەم سەردەمەدا ڕەوڕەوەی گۆرانکاریەکانی ژیانی مرۆڤ و تەکنۆلۆژیا زۆر خێرایە، کەواتە تیۆرە پەروەردەییەکانیش دەبێت زۆر خێرا بن، واتە زوو زوو دەگۆڕێن و نابنە یاسایەکی جیهانی کۆنکرێتیانە و چەسپاو، پێشکەو توو ترین گەل و ولات ئەوەیەکە لەگەڵ گۆرانکاریە خێراکاندا پەروەردەش دەباتە پێشەوە.

# کاری پەروەردەیی پێشەنگی هەموو پرۆژە کارەکانی دەوڵەتە

لــەو ڕوانگەیــەوە کــە پــەروەردە و فێربــوون، یەکێکــە لــە پێویــستیە سەرەکیەکانی ژیانی هاوچەرخ، دەزگایەکی مەعنەویە بۆ ئاڕاستە کردنی هەست و ژیری مرۆڤەکان، دەزگایەکی ماددیشە بـۆ بەرهـەمهێنان، ئەگـەر بـەوردی سـەرنجی هەر کامێك لە وەزارەتەکانی دەوڵەت بدەین، بۆمان دەردەکەوێ کە چەندین گروپ لە جۆری ئاستی جیاوازدا کاری تێدا دەکەن، بەڵام گروپی سەرەکی هەر وەزارەتێك بـریتین لـە کەسـانی شـارەزاو ئـەکادیمی , واتـە ئـەو کەسـە پرۆفیـشناڵانەی هـەڵگی بڕوانامـەی بـوارێکی پـسپۆڕین کـە نزیکـە لـەو پیـشەیەی پێـی سـپێراوە. کارگـە و سەرچاوەی دەرهێنان و دروستکردنی مرۆڤەکان بۆ پۆستە جیاوازەکان بریتیـە لـە وەزارەتی پەروەردە و نۆرگانەکانی، پزیشك و کارمەندانی تەندروستی لە وەزارەتی تەندروستی و ئامار ناس و ژمێریاران لە وەزارەتە جیاوازەکان و کادری ئاسایش و پـۆلیس و پلـەدارانی سـەربازی و پیـشەوەرانی شـارەزاو سـەرجەم کەسـانی تـر دەرچووی ئەو پۆل و قوتابخانەیەن کە سەر بەوەزارەتی پەروەردەن، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کـە هـیچ هاوڵاتیـەك نیـە بەشـێوەیەك لـە شێوەکان نەکەوتبێتـە نـاو بـــوارو کایـــەی پـــەروەردە، هەمووڵایـــەکمان قـــەرزاری وەزارەتـــی پـــەروەردە و مامۆستایانی دڵسۆزین.

لەبەر ئەوەی پەروەردە کارگەی دروستکردنی هاوڵاتی پەسـەندو هۆشـیارە، کەواتـە دەبێـت حکومـەت و دەوڵـەت هەمیـشە پـشت بـەو وەزارەتـە ببەسـتن و سەرچاوەی یەکـەمیان بێـت، کـاری یەکـەمی پـەروەردەش فێربوونـە، کـە قورسـایی فێربـوونیش لـە چـەند خاڵێکـدا کـۆ دەکرێتـەوە، خـاڵی سـەرەکی بریتیـە لـە (هاوتـابونی هـزری مـرۆڤ لەگـەڵ هێمـا گـەرایی زمـانی لێکتێگەیـشتن)، ئەمـەش پێویستی بە لێکدانەوەی لۆژیکی و زانستی هەیە، وەك دەزانـین هـیچ کەسێك بە خوێندەواری لە دایك نابێت، بەڵام ئامادەگی یەکانی فێربوونمـان لەگەڵ خۆمانـدا هێناوە دوای لە دایکبونمان گوێ و چاومان دەکرێتـەوە، واتـە دەروازەی وەرگرتنـی زانیاریەکانمان واڵا دەبێت، لە ڕێگەی چاوەکانمانەوە هەزاران وێنەی ڕەنگاو ڕەنگی

شتەکان بەچەشن و جۆرو قەبارەوە دەگەنە قولایی مێشکمان، لەوێدا کارلێکی هزری بەرپا دەبێت و لە ئاکامدا هەزاران زانیاری نوێی کەڵەکە دەبن، بە هەمان شێوە چەندین دەنگی جۆراو جۆر لە ڕێگەی هەستی بیستنەوە دەگەنە مێشکمان و لەوێدا چارەسەر دەکرێن و دادەنرێن، لێرەدا بایەخی کاری پەروەردە دەست پێدەکات، چونکە وێنە بینراوەکان و دەنگە بیستراوەکان دەبن بە کەرەسەی خاو بۆ دارشتنی زانیاری نوێ، کە پێویست دەکات ئەم زانیاریانە لە بواری رەفتارگەرایدا بەکاربهێنرێن، دیارە ئەوەش میکانیزمێکی ئاڵۆزی هەیە و پەیوەندی بەکاری فەسیولۆژیای مێشك و دەمارەوە هەیە کە وەك وەزارەتی راگەیاندنی حکومەتی لەشی مرۆڤ وایە.

لە زنجیرەی بەدوایەکدا هاتنی چالاکیەکانی کۆئەندامەکانی لەشی مرۆڤدا، کۆئەندامی بیستن دەکەوێتە پێش دەستپێکردنی چالاکیەکانی کۆئەندامی (بینین) ە وە، واتە کۆرپەیەکی تازە لە دایکبوو بەرلەوەی شت ببینێ، شت دەبیستێ، کەواتە بابزانین پەیوەندی نێوان (وێنەی پیت) و (دەنگی پیت) چیە، وەك دەزانین مرۆڤ بونەوەرێکی بوێژە و توانای قسەکردنی هەیە، چونکە شێوەی پێکهاتەی لێوەکان و دەم و قورگی گونجاوە بۆ دروستکردنی چەندین (درکە) و (ورتە)، هەریەکە لەم درکە و ورتاندنانەش لە شوێنێکی تایبەتی یەوە دەردەچن، واتە (سێ دەرچە) ی سەرەکیمان هەیە کە وەك کارگەی دروستکردنی دەنگەکان وانە، دەرچەی قورگ، دەرچەی دەم و زمان، دەرچەی لێوەکان، بەهاوسەنگکردنی پێداتێپەربوونی، تەوژمی هەوا بەناو قورگ و دەم و لێوەکانداو کۆنترۆڵکردنی خۆویستانەمان دەتوانین ئەو دەنگە جیاوازانە دروست بکەین، بەلێکدان و پێکەوە گرێدانێکی خێرای ئەو دەنگانە وشە دروست دەکەین، بەریزکردنی وشەکانیش بەدوای یەکتریدا رستەو دەستەواژەی وا دروست دەکەین کە دەتوانین من و تۆ لەیەکتری تێبگەین و زانیاری ئاڵوگۆڕ بکەین، بەڵام لە بنەرەتدا ئەم بابەتە هەروا سادە و ساکار نیە، چونکە دروستکردنی دەنگ لە چوار چێوەی کارێکی خۆویستانەدا ئیشێکی گرانە، بۆ نمونە تۆ دەتەوێ دەنگێك دروست بکەیت و

لەڕێی ئەو دەنگەوە بەلێکدانی چەند پیتێك وشەیەك دروست بکەیت کە دەتەوێ بە هاوڕێکەت بڵێیت : (بڕۆ) ئەم وشەیە تەنها لە (سێ پیت) پێکهاتووە، کە هەریەکە لەو پیتانە خەڵکی شوێنێکی دەزگای گفتوگۆی تۆن، بۆ دەربڕینی ئەو وشەیە دەبێت لە مێشکی خۆتدا بڕیار لەسەر ئەوە بدەیت کە دەتەوێت بە هاوڕێکەت بڵێیت (بڕۆ) بۆ ئەم مەبەستە پێویستت بەوە هەیە کەسێ پیت دروست بکەیت (ب، ڕ، ۆ) وە پیتەکانیش بە خێرایی لێکبدەیت تاکو وشەی (بڕۆ) دروست ببێت، لێرەدا دەبێت چەند کارێك بکەیت :

١. مێشکت فرمان دەربکات بۆ قوڕگ و دەنگە ژێ یەکان و لێوەکان تاکو ماسولکەکانیان بە جۆرێکی وا کرژو خاو ببنەوە کە ئەو دەنگەپیتانە دروست ببن.

٢. مێشك فرمان دەربکات بۆ کۆئەندامی هەناسە تاکو (سی یەکان) بە جۆرێك پاڵ بەهەوای ناوەوەیان بنێت کە ببێتەمایەی لەرینەوەی دەنگەژێ و لێوەکان بۆ ئەوەی ئەو پیتانە دروست ببن.

٣. دەبێت مێشك فرمان دەربکات بۆ ماسولکە بزۆکەکانی زمان و دەم و لێوەکان تاکو بەجۆرێك کرژو خاوببنەوە کە کارئاسان بکەن بۆ زمان تاکو بەباشی هەڵبسوڕێ وبتوانێت ئەو پیتانە دروست بکات.

٤. مێشك فرمان دەربکات بۆ سستمی لیکەرژێنەکانی ناو دەم تاکو نادەم تەڕو بڕو زمان لوس بکەن بۆ ئەوەی بە تەواوەتی توانای هەڵسوڕانی زمان دروست ببێت و زمان وشك نەبێتەوە و نەنوسێت بەمەلاشووەوە و توانای پێکهێنانی ئەو پیتانەی هەبێت، ئەمانە چوار فەرمانی گرنگن، کە دەکرێت هەندێکیان ئۆتۆماتیکیانە ڕووبدەن، بەلاّم لە هەموو بارەکاندا دەبێت مێشك هاوسەنگی ڕابگرێت لە نێوان چەمکی واتایی ئەو پیتانە و چەشنی دەربڕینەکەیاندا، جگە لەمەش دەبێ بڕی لەرە لەرو درێژی شەپۆلی دەنگەکان گونجاو بن لەگەڵ ئاستی توانای بیستنی گوێی هاوڕێکەت، کاتێك دەتەوێت بەو بڵێیت : (بڕۆ)، دروستکردن و بڕیاردان و دەربڕینی وشەی (بڕۆ) لەلایەن تۆوە (کات و وزە)

یەکی زۆری تێچووە، مێشك و هزرو ئەندامە مادی و مەعنەویەکانی لەشی تۆ زۆر ماندوو بوون تاکو توانیویانە ئەو وشەیە دروست بکەن و تەسلیم بە هاوڕێکەی بکەن، دیارە هاوڕێکەت پشت بە هەمان شێوە زۆر ماندوو دەبێت تاکو ئەو وشەیە لە تۆ وەردەگرێت و لە مێشکی خۆیدا موعالەجەی دەکات و بڕیاری ڕەفتارگەرایی خۆی دەدات، ئەم هەموو فرمان و کارو ئەرکانەی مێشکی مرۆڤ و ئەندامەکانی دەبێت لە ماوەی (١ — ٢) چرکەدا ڕووبدات، دیارە ئەنجامدانی کاری گران لە ماوەی (کات) ێکی کەمدا سەختە، سەختی و قورسایی کارەکەش لەوەدایە کە دەبێت وشە دەربڕەریوەکە مانای تەواوی هەبێت، مەسەلەی (مانا)ش دیسانەوە جیهانێکی ئاڵۆزو پڕ لە هێماو نهێنی و ڕاڤە و ئەگەری جۆراوجۆرە، بۆ نمونە : وشەی (بڕۆ) چەندین ماناو ڕەهەندو ڕوکاری جیا جیای هەیە، شێوازی دەربڕینەکەی و کاتەکەی و بارو دۆخە دەرەکی و ناوەکیەکەی و لایەنی زمانەوانی و جێکەوتی وشەکە لەڕستەکەداو باری دەرونی دەربڕو وەرگر و تەمەن و شێوەی ڕوخسارو هەڵچوونە خودیەکان و گەلێك شتی تر کار دەکەنە سەر گۆڕینی مانای وشەی (بڕۆ)، چونکە جاری وا هەیە (بڕۆ) نیشانەی وەلانان و بەرپەرچدانەوەیە، یان فرمانێکی ئاسایی یە بۆ دەستپێکردن بە هەنگاو هەلگرتنی کرداری، یاخود دەربڕینی نا ئومێدی و بێ ئەنجامی یە، وەیان بۆ ڕاوەدونان و دەرکردنە، یان بۆ هاو سۆزی و پێکەوە ڕۆیشتنەو...... هتد، جا ئایا لە نێو ئەم هەزاران مانایەدا دەربڕ کامیانی مەبەستە و وەرگر بەکام لەو مەبەستانە لێی تێگەیشتووە، پەروەردە لەم شوێنە ناسکەدا ڕۆڵی خۆی دەبینێ، چونکە یەکێك لە کارە سەرەکیەکانی پەروەردە بریتیە لە (ئاراستە کردن)، ئاراستە کردن وەزیفەکەی بریتیە لە وەرگەڕاندنی میلی مەبەستەکان بەرەو ڕووی ئەو خاڵە واتاییەی کەلەناو ئەو هەموو ئەگەرانە دەیەوێت، کەواتە ئێمەی مرۆڤ یەکێك لە کێشە پەروەردەییەکانمان بریتیە لە کێشەی زمان.

منداڵەکانمان لە قوتابخانە فێری نوسین و ناسینی پیتەکان دەبن، دەزانن کە

هەریەکە لە وێنەی پیتەکان هێمایە بۆ دەربڕینی درکەی دەنگێك، واتە منال فێری (وێنەگرتنی دەنگ) دەکرێت هەموو لایەکیشمان ئەو ڕاستیە دەزانین کە (دەنگ) نەبینراوە، وێنەگرتنی شتی نەبینراویش کارێکی زۆر زەحمەتە، کەچی هەر ئەومیشە بڕیار لەسەر هەڵوێست و ڕەفتارەکانمان دەدات، لە کاتێدا لەقولایی نەستمانەوە(اللاشعور) هەڵدەقولێن، هەر بۆیە ڕوناکبیری فەرەنسی (ڕیجز دیبرێ) دەڵێت : (وێنەکان لە ڕێگەی نەستەوە گۆڕانکاری لە بیرکردنەوەماندا دروست دەکات) مامۆستا بەم ئەرکە گەورەیە هەڵدەستێت کە تۆمار کردنی زانیاریە وێنەیی و دەنگیەکانە لە مێشك و یادگەی منالدا بە جۆرێکی وا کە ڕەگوڕیشیەیان بگاتەوە بە کێڵگەی نەست، دواتر ببنە پاڵنەری سەرەکی بزواندنی هەست و بیرو هۆشی منالەکە تاکو لە سنوری کایە ڕەفتار گەراییەکانی ژیانیدا بەکاری بهێنێ، ژیانیش بریتیە لە پەیتا پەیتا دوبارە کردنەوەی هەڵوێست و ڕەفتارەکانمان لەگەڵ خودی خۆمان و دەرەوەی خۆماندا، بەم جۆرە مامۆستا نەخشەیەکی هەنگاوی ڕێ بۆ ژیانی ئاییندە دەبەخشێت بە منالەکانمان، هەموو مرۆڤێکی گەورەش بە قۆناغی منالیدا تێپەڕیوەو لە قوتابخانەکەی خۆیدا ئەم نەخشەیەی وەرگرتوە و لە مێشکی دا چەسپی کردوە و هەتا کۆتایی ژیانی لەسەر ئەو نەخشەیە دەڕوات، خۆ ئەگەر کەسێك خوێندەوار نەبێ و نەچووبێتە قوتابخانە ئەوا ئەو نەخشەیەی لە خێزانەکەیەوە وەرگرتووە، کە (خێزان) یش هەر دامەزراوەیەکی پەروەردەیی کۆمەڵایەتیانەیە. بەم جۆرە (تاك) لە کۆمەڵگەدا لە ڕێگەی پەروەردەوە گۆش دەکرێ و ئامادە دەکرێ بۆ ژیانی کرداریانەی سەرکەوتوو لەناو کۆمەڵگەکەیدا. هەر ئەو کەسانەشن کەسبەینێ دەبنە بەرپرس و کار بەدەست لە دامودەزگاکانی حکومەت و ولاتدا، کەواتە دەبێت بەرپرسانی بالای ولات بەم واتا قووڵەوە لە چەمکو بایەخی پەروەردە تێبگەن، ئەوان چۆن مرۆڤێکیان دەوێت؟ وە دەیانەوێت ئەو مرۆڤە لەکام بواردا شارەزا بێت و کام ئەرکی بەڕێوەبردن و کام پۆستی پێ دەسپێرن با بێن لە پەروەردە داوا بکەن تاکو بەو مواسەفاتانەی خۆیان مرۆڤی وایان بۆ دروست بکات، بەڕاستی ئەمە ئەرکی

دەوڵەت و وەزارەتەکانە کە بەردەوام لە خزمەتی وەزارەتی پەروەردەدا بن و داوای کەسانی پرۆفشناڵ و شارەزای لێ بکەن، دەوڵەت ناتوانێ هیچ کاروبارێکی خۆی بەسەرکەوتویی ئەنجام بدات ئەگەر بە تەواوەتی پشت بە پەروەردە نەبەستێت، پەروەردەکاری یەکەمی دەوڵەتە و نابێ بکرێت بە پرۆژەی دووەم، چونکە گەورەترین پێکهاتەی دەوڵەت بریتیە لە هاولاتیان و جەماوەر، هەروەها جەماوەر خۆشیان خاوەنی یەکەمی دەوڵەتن، جا کاتێك جەماوەری گەل نەخوێندەوارو نا پەروەردەیی و نەشارەزا بێت، ئەوا حکومەتەکەیشیان شکستی دێنێت و ئاسایشی نەتەوەیی و ئابوری و سیاسەتیش گەندەڵی دا یاندەرزێنێ، گەل و جەماوەری نا پەروەردەیی چاك و خراپی ئێستا و ئایندەی خۆی جیا ناکاتەوە، خێزو پێزی دەوڵەتداری نابێت و ئەگەر پێکهاتەیەکیش هەبوو کە بەرواڵەت ناوی حکومەت بوو، تەنها شتێکی رووکەش دەردەچێ و، دەسەلاتە دیکتاتۆریەکانی جیهانیش بە درێژایی مێژوو نەیانهێشتووە میللەت خوێندەوارو چاوکراوە بێت، ئێمەش وەکو کورد ئەگەر بمانەوێت دیموکراسی بین، دەبێت پەروەردەیی بین، لە لوتکەی دەسەلاتەوە تا بنکەی جەماوەریمان.

لە ڕاستیشدا وایە، ئەگەر بمانەوێ خانویەك دروست بکەین ئەوا پێویستمان بە چیمەنتۆو بلۆك و شیش و ئاو و گەج دەبێت، هەروەها پێویستمان بە دوو شتی تر دەبێت کە (وزەی کار) و (شارەزایی کار) ە، خۆ ئەگەر هەموو شتەکان ئامادە بوون بەلام مەرجی تۆکمەیی و پەسەندیان تێدا نەبوو، بۆ نمونە چیمەنتۆ کە خراپ بوو، ئاسنەکە لاوازو دارزاو بوو، ئەوا خانوەکەش دروست بکرێت، بێ کەڵك و بێ سودو لاوازە و لەناکاو دەرمێت.

دروستکردنی مرۆڤیش لە کارگەی پەروەردەدا (ماڵ، قوتابخانە) بە هەمان جۆرە، پێویستە کەرەسە پەروەردەییەکانی تۆکمەو خۆگرو پەسەندو شیاو بن بۆ ئەوەی ئەو مرۆڤەی لە داهاتودا ڕەفتارەکانی لەو کەسانە دروست دەکرێن کەسێتیەکی سەرکەوتووبێت.

# بایەخی تێگەیشتن لە فەلسەفەی پەروەردەیی و پراکتیزەکردنیدا

یەکێك لە هۆکارەکانی دروستبوونی هەندێك لە کێشەو گرفتە پەروەردەییەکان، لەناو چوار چێوەی خێزان و نۆرگان و دامودەزگا فەرمیەکان و کۆمەڵگەدا، بریتیە لە نەبوونی مەرکەزیەتی کاری پەروەردەیی، واتە هەموومان هاوار و یەك ستایلی بەکانگیرمان نیە بۆ سستەم و فەلسەفەی پەروەردەیی نەوەکانمان، بۆ نموونە : تۆ بە جۆرێك لە پەروەردە تێگەیشتویت و هەر بەپێی ئەو تێگەیشتنەی خۆیشت کار بەو پەروەردەیە دەکەیت و بەسەر خۆت و خێزان و منداڵەکانتدا پراکتیزەی دەکەیت، هەروەها منیش بەجۆرێکی تر لە چەمکی پەروەردە تێگەیشتووم و بەپێی ئەو تێگەیشتنەی خۆم هەنگاو دەنێم و خێزان و منداڵەکانم پەروەردە دەکەم، هەمان قسە ڕاستە بۆ (ئەو)، بەم چەشنە هەریەکەمان بەجۆرە ستایلێکی تایبەت پراکتیزەی پەروەردە دەکەین، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبونی جیاوازی نێوانمان لە شێوازی پەروەردەکردندا لە ئەنجامی، ئەوەشدا ڕەفتارگەرایی منداڵەکانمان زۆر لە یەکتری جیاواز دەبن، کێشەکە لەوەدانیە کە جیاوازی هەیە، بەڵکو لەوەدایە کە جیاوازیەکە لەشتە سەرەکیەکاندایە، شتێکی ئاساییەکە دەبێت ڕەفتارگەرایی تاکەکانی کۆمەڵگە لە یەکتری جیاوازبن، هەرگیز ناکرێت لەم گەردوونەدا لە یەك کاتدا دوو کەس هەبن کە کوتومت وەکو یەکتری وابن، ئێمەی مرۆڤ بە جیاوازیەکانمانەوە جوانین، بەڵام کاتێك جیاوازیەکان سنوور دەبەزێنن، ئیتر دەکەوینە بازنە سورەکانی ناکۆکی و دژایەتیەوە، ئەوەش کەشوهەوایەکی شیاوە بۆ گەشە کردنی بەرژەوەند خوازی تاکەکەسی و پاوەنخوازی و قۆرخکردن.

هیچ کاتێك من ناتوانم تۆ بناسم، هەتا ئەو کاتەی ڕەفتارێکی تۆ دەبینم، بەشێوەو قەبارەو جۆری ڕەفتارەکەت کەسێتی تۆ دەناسم، من لەلایەن خۆمەوە کۆمەڵێك پێوەرم داناوە، بەپێی ئەو سەنگ و پێوەرانە ڕاڤەی مەعنەوی دەکەم بۆ ڕەفتارەکەی تۆ، لە ئاکامدا کۆمەڵێك نرخ و بەهام دەست دەکەوێ، بەو نرخانە

هاوکێشەی کەسێتی تۆ دادەڕێژم و دەستەواژەی پێناسەی تۆ لەلای من دروست دەبێت، دیسانەوە ئالۆزی تر دروست دەبێت چونکە تەرازووی پێوانە و هەڵسەنگاندن لەلای من جیاوازە لەگەڵ پێوانە و تەرازوو لە لای تۆ، کەواتە لە بنەڕەتدا تێڕوانینی من و تۆ بۆ یەکتری و بۆ کەسی سێهەمیش جیاوازە، ڕەچەڵەکی ئەم جیاوازیەشمان دەگەڕێتەوە بۆ جۆری ئەو فەلسەفەیەی کە هەریەکەیان پەیڕەوی دەکەین، تۆ هەڵگری فەلسەفەیەکی تایبەتیت، تێڕوانینت جودایە لەگەڵ من، بوون و مان و ژین و ژیان و گەردون و مرۆڤ لەلای تۆ بە جۆرێك لێك دەدرێنەوە و لەلای من بەجۆرێکی تر، کەواتە هەڵوێست و ڕەفتاری تۆش لە هی من جیاوازە، ڕەفتارەکانیشمان لایەنی پراکتیکی ئەو پەروەردەیەن کە پێشتر لەسەری گۆش کراوین و هەریەکەمان پێمان وایە کە ئێمە ڕاستین و بەرانبەرەکەمان هەڵەیە، هەرکاتێکیش مرۆڤ ئەم بۆ چوونەی لەسەر بنەمایەکی نالۆژیکی بۆ دروست بوو، ئەوا سەرەتای عەقڵیەتی دیکتاتۆریانە چەکەرە دەکات و ئەوکەسەش یەکەم کەس دەبێت کە باجی دیکتاتۆریەتەکەی دەدات و ڕۆڵی سەرەکی دەبێت لە سڕینەوەی خۆیدا، بە تێپەڕبوونی کات لەو بارەدا قاڵ دەبێت و ئەو ڕەفتارەیشی تێدا دەبێت بە (خوو).

لە ڕەهەندێکی تریشەوە من و تۆ جیاوازین، ئەویش ڕەهەندی پێکهاتەی فەسلەژیی مێشکمانە، خانەو شانە و دەمارەکانی کۆئەندامی مێشك و دەماری تۆ لەگەڵ هی من کوتومت وەکو یەکتری نین، کەواتە بەرهەمی مێشك و هزرو بیریشمان جیاواز دەبن، بەڵام پێویستە بزانین کە هەرگیز جیاوازی فەسلەژیانەی نێوان دوو مرۆڤ ناگاتە ئاستی دژوەستان و بەرەنگار بوونەوەی توند، ئەگەر شێوازی پەروەردە و ژینگە ڕۆڵی نا هەمواری تێدا نەگێڕن، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لەم ڕەهەندەشیانەوە دیسان پەروەردە پشکی خۆی هەیە و سەر لەنوێ ئەو ڕاستیە دووپات دەکەینەوە کە هەموو جۆرە چاکسازیەکی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤ لە پەروەردەوە دەست پێدەکات و هەر پەروەردەش بەرپرسیاری یەکەمە لە ئاستی دەرکەوتن و سەر هەڵدانی هەموو لادان یاخی

بوونێکی مرۆڤ و تاوانکاری، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە پەروەردەی پەتی و نموونەیی و سەربەخۆ شتێکی دەگمەن و ئەندێشەیە، چونکە پەروەردە بەستراوەتەوە بە فەلسەفەی تاکەوە، فەلسەفەی تاکیش لە فەلسەفەی گشتی وڵاتەوە سەرچاوە دەگرێت، فەلسەفەی گشتی وڵاتیش دووجۆری هەیە : جۆری هەرەمەکی جەماوەرو جۆری دارشتەی دەسەڵاتی باڵای وڵات، کەم جار رێ دەکەوێت ئەم دوو جۆرە فەلسەفەیە کۆك و تەبابن لەگەڵ یەکتریدا، چونکە هەریەکە لە تاکەکانی کۆمەڵگە (جەماوەر) دەیانەوێت لە ئاستی خۆیانەوە سەرکردەی وڵات بن و دنیا لەسەر پەنجەی ئەوان بگەرێ، دەسەڵاتی وڵاتیش ئەگەر هیچ نەبێ لە رووی پراکتیکەوە ئەم خواستەی پێ جێ بەجێ ناکرێت، لەسەر ئەوە دەسەڵات تەکتیکی رازیکردنی جەماوەر دەگرێتە بەر، دیارە هەمیشە جەماوەریش بە نارەزای دەمێنێتەوە، لێرەدا دەسەڵات تەکتیکەکەی دەگۆرێت بۆ شێوەی هەڵچوون و هەرەشە و سەرکوتکردن، یەکەمین پرۆسەی کۆمەڵایەتی وڵات کەلەو ململانێیەدا زیانی گەورەی پێدەگات پرۆسەی پەروەردەیە. سروشتی پرۆسەی پەروەردەییش وایە ئەگەر ئەمرۆ گورزێکی کوشندەی بەربکەوێت، ئەوا دوای (١٠ — ٢٠)ساڵی تر هەست بە ئێش و زامەکەی دەکات و پێوەی دەمردەکەوێت، بۆ نموونە ئەمرۆ بەشێکی زۆری زامەکان بەو پەروەردەیەوەدەمردەکەوێت کە رژێمی عەسکەرتاریانەی حیزبی بەعس لەسەردەمی سەرەتای دەسەڵاتی سیاسی خۆیدا فەلسەفەی پەروەردەکەی خۆی پێ دارشتبوو. بۆ نموونە : تا ئێستاش مامۆستای وا هەیە لەناو پرۆسەی پەروەردەییدا کە بروای بەگرتنەبەری رێگەی زەبرو زەنگ هەیە دژی قوتابیان و خوێندکاران، ئەمەش نەك هەر مامۆستا بەڵکو هەزاران کەسی ئەم وڵاتە هەیە کە وا بیر دەکەنەوە و پێیان وایە پەروەردەو فێرکردن داروتێلای لەگەڵدا نەبێت سەرناگرێت، رەنگدانەوەی ئەم بروایە بە ئاشکرا لە کۆمەڵگەدا دیارە، ئەوەتا دەیان خێزان گرفت و کێشەی خێزانیان هەیە، کە بەشێك لەو کێشانە کۆمەڵایەتین و دەگەرێنەوە بۆ رێکنەکەوتنی دایك و باوك لەسەر یەك ستایلی پەروەردەیی یەکانگیر، خێزانەکانی ئێمە منداڵ بەرهەم

دەهێـنن، بەرهەمهێنانەکـەش تـەنها لـە ڕوی چـەندێتیەوەیە، نـەك لـە ڕووی چۆنیەتیەوە، نەخـشە و سـتراتیژێکی پێـشینەمان نیـە بـۆ دیـاریکردنی سنوری چەندێتی و چۆنیەتی دروستکردنی منداڵ و میکانیزمی پەروەردەکردنیان.

هەموو گرفت و کێشە کۆمەڵایەتیـەکان لەناو خێـزان و دەرەوەی خێزانـدا دەگەڕێنـەوە بـۆ چـۆنیەتی تێگەیـشتنمان لـە چـەمکی واتـای پـەروەردە و پراکتیزەکردنـی ئـەو واتایـە لـە ژیـانی خۆمانـدا، (واتـا)ش چـەند ڕەهەنـدێکی جیـاوازی هەیـە، ڕەهەنـدەکانیش (شـوێن) و (کـات) کاریـان تێدەکـەن، بـۆ نمونـە : پەروەردە لـەلای منێکـی ڕۆژهـەڵاتی واتایـەکی جیـاوازی هەیـە بـە بـەراورد لەگـەڵ کەسـێکی خـۆراوایی یـان ئەفـەریقی، هـەروەها لای ئاینـدارێك و ئاینـدارێکی جیاوازتر، سۆسیالیستێك و لای دیکتاتۆرێك لە وڵاتێکی هـەژارو لـە وڵاتێکـی تـری دەوڵەمەنـدو دامـەزراودا، هـەروەها بنییـەی یـەك تاکـە کەسـیش لـە کاتێکـەوە بـۆ کاتێکی تر جیاوازە، هەرزەکارێك بەچەشنێك لە پەروەردە تێدەگات، کەچی هـەر هەمان هەرزەکار تێڕوانینی بۆ پـەروەردە دەگۆڕێـت لـە تەمـەنی (٤٠) ساڵیدا، یـان دوای ئەوەی دەبێتە باوکی یان دایکی یەکەم منداڵ.

گـەلێك جـار هۆکـاری دروسـتبونی ئالۆزیـەکان دەربـارەی تێگەیـشتنی جیاوازمان سەبارەت بە پەروەردە دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵاو کردنـی چـەمکە واتاییـە جیاوازەکـانی پـەروەردەو پێکنـەرەکانی بـۆ نمونـە : نـاتوانین سـنورەکانی ئـەم چـەمکانە لـە ڕوی پراکتیکـی یـەوە لـە یـەکتری جیـا بـکەینەوە : (پـەروەردە فێرکـردن، گۆشـکردن، بـەخێوکردن، ئاڕاسـتەکردن، ڕێنومـایی، سەرپەرشـتیکردن، چاودێری)، لـە کاتێکدا هەریەکـە لەوانـە نـاوەڕۆکی جیـاوازی خـۆی هەیـە، تێـورو بنەماو ئامانجی تایبەتی هەیە، ڕێگەی پراکتیزەکردن و سیاسەتی جێبەجێکردن و سـتراتیژی دیـاری کـراوی خـۆی هەیـە. بـەڵام ئێمـە هـەموویمان بەسـەریەکدا تێکهەڵشێلاوە و هەویرێکی سەیرمان لێ دروستکردوە، کەلە هەموو شتێك دەچێت لە پـەروەردە نـەبێت، لـەو هـەویرە ترشـاوە پەیکـەری پـەروەردەیی و هـزرو بـیری تیـۆری و پراکتیکـی بـۆ پـەروەردەی نـەوەکانمان دادە تاشـین و دواتـر دەیدەینـە

دەستی کەلتوری باوی میراتیانەمان، ئەو کەلتورەمان بڕیاردەدات لەسەر دروستکردنی کەسێتی نەوەکانمان، هەر لەبەر ئەوەیشە لە ئاکامدا منداڵێکی ترسنۆکی بێ ئیرادەی خەمۆك و نا هاوسەنگ و تووڕە فرێ دەدەینە ناو کۆمەڵگەیەکی نا ڕۆشنبیرو نا پەروەردەیی، کە تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە ڕانەهاتوون لەسەر پەیڕەوکردنی یاساو پەراوەکردنی ژیانی دیموکراسیانە و چێژو وەرگرتن لە گوزەران و بەختەوەری و ئاسودەیی یەکتر قەبوڵکردن و ڕاجیایی، بەڵکو لێمان بووە بە خوو کە پێمان وایە تەنها لە ڕێی ململانێ و ڕق لە یەکتربوونەوەوە دەتوانین ژیانی خۆمان دابین بکەین، وافێریانکردوین کە ژیان تەنها ئانەو ئانیش لە قوڕگی شێردایە، کەواتە ئێمەی ڕێوی بۆ مەرگ خوڵقاوین، بەم جۆرە هەندێ لە نەریتە کۆمەڵایەتیە کەلتوریەکانمان گوژمی سەلبی لە ناخماندا زیاتر دەبوژێننەوە تاکو ئیجابی، مەترسیەکەش لەوەدایە کە زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگە پشتیوانی ڕاو بۆچوونی سەلبی بکەن، لەو بارەدا پرۆسەی پەروەردەیی وەك دەروازەی یەکەمی ئاراستەی کۆمەلایەتی جێی پێ لێژ دەبێت و نەك هەر توانای گەشەکردنی نامێنێ، بەڵکو توانای بەرگیشی نامێنێ، تاکو پەروەردە دەبێتە تۆپێك منداڵان شەق شەقێنی پێدەکەن و باوکان دەیشارنەوەو دایکان دەیتەقێنن و خەڵکانی بیانیش پێیان پێدەکەنن و دەبنەبینەری گۆڵێن و یاریە سەیرەکەی ئێمە.

سەرجەم گرفت و کێشەکان دەگەڕێنەوە بۆ یەك خاڵی سەرەکی، ئەویش بریتیە لە : (نەبوونی فەلسەفەیەکی پەروەردەیی دیاریکراو بۆ وڵات)، کاتێك هاوڵاتیان و دەسەڵاتی باڵای وڵات ڕێك نەکەوتوون لەسەر فەلسەفەیەکی دیاریکراوی پەروەردەیی، لەبەر ئەوە ئامانجە پەروەردەییەکان دیارنین، واتا دەوڵەت و دەسەڵاتی باڵای وڵات شتێکی تایبەتی ناویاری لە وەزارەتی پەروەردە دەوێت و جەماوەرو هاوڵاتیانیش شتێکی تر لە پەروەردەدا دەبینین، هەریەکە لەو دوانەش ئاراستەیەکی تایبەتیان هەیە، دوور نیە ئاراستەکان پێچەوانە بن، واتە زۆرترین وزەی پەروەردەیی وڵات لەو دژە ئاراستەیەدا بەهەدەر دەچێت.

بۆچارەسەری ئەم کێشە گەورەیە، کە دایکی سەرجەم گرفت و کێشەکانی تـرە دەبێـت دەسـەڵاتی بـاڵای وڵات و وەزارەتـی پـەروەردە و پارلـەمان و نۆرگانـە ناحکومیــەکان، نەخــشەیەکی ورد دابرێــژن بــۆ هەڵبــژاردنی فەلــسەفەیەکی پەروەردەیی شیاو بۆ وڵات ـ بەچەشنێك کە ڕەزامەندی هەر دولایانی لەسەر بێت، واتـە (دەسـەڵاتی بـاڵای وڵات و جـەماوەری گـەل)، ئەوسا هـەر دولایـان بـەڕوونی هاوکاری یەکتری بکەن لە پراکتیزەکردنی سستمی پەروەردەیی وڵاتدا.

ئەگەر کاری تێگەیشتن لە فەلسەفەو قوڵبوونەوە بۆ ناخی ئەو فەلسەفەیە کارێکی گـران و زەحمەتـە و بـە هـەموو کەسێك ناکرێت، خۆ کـاری ژیانـداری و گوزەران بـۆ خـۆی پراکتیزەکردنـی گـرانترین فەلـسەفەیە، کـە فەلـسەفەی گـشتی کۆمەڵگەیـە، مـەرجیش نیـە هـەموو تـاکێکی کۆمەڵگـە بـە تـەواوەتی لـە نـاخ و جەوهەری فەلسەفەی پەروەردە تێبگات ئەوسا جێ بەجێی بکا بەڵکو دەبێت ئـەو ئەرکانە دیاری بکرێن بۆ هاوڵاتیان کە دەبێت ئـەنجامی بـدەن لـە پراکتیزەکردنـی فەلـسەفەی پـەروەردەی وڵاتـدا و لـە بەرانبـەر جێ بەجێنـەکردنی هەریەکـە لـەو ئەرکانەشـدا سـزایەك دانرابێـت، ئەوسا بـەپێی یاسـا هـەموو هاوڵاتیـەك سـنوری ئەرکەکانی خۆی دەزانێت و ناچار دەبێ پابەندیان بێـت، هـەر وەکـو چۆن هـەموو شوفێرێکی ئەم وڵاتە بە تـەواوەتی شـارەزای فەلـسەفەی ڕێگـەوبان و هاتوچۆ نیـە لەگەڵ ئەوەشدا یاساکانی هاتوچۆ پـەیڕەو دەکات و ناتوانێت لابـدات، چـونکە لـە بەرانبەر هەموو لادان و سەرپێچی یەکدا سزایەکی یاسایی دانراوە.

کەواتـە دەبـێ فەلـسەفەی پـەروەردەمان دیـارو ڕوون و داڕێـژراو بکـەین، پاشـان بـە یاسـا پابەنـدی بکـەین و لـە بەرانبــەر لادان و سەرپێـچی یەکانیـشی بەدواداچـوون و سـزای جۆراوجـۆر هـەبێت، ئەوسـا چـۆن ئەگـەر ماڵێـك کرێـی کارەبای مانگانە دوا بخات سـزا دەدرێـت بـە هـەمان شێوە ئەگـەر منداڵەکەشیان لـە پەروەردە لایدا سزای خێزانەکە دەدرێت.

# میزاجگەرایی لە پرۆسەی پەروەردەدا جێگەیەکی نیە

مرۆڤ هەرکارو چالاکیەکی جوڵەیی لەش و لار بکات، یان هەر چالاکیەکی بیرو هزرو هۆش بکات بریتیە لە (ڕەفتار)، ڕەفتاریش دوباری هەیە (ڕەفتاری وەستاو) کە پێی دەگوترێت (هەڵوێست) وە جۆری دووەمیش (ڕەفتاری جوڵاو) ە، کە بریتیە لە (کردار)، بۆ نمونە : کاتێك تۆ بەڕێگایەکدا دەڕۆیت، شێوازی رۆیشتن و هەنگاونان و ڕوانین بۆ دەوروبەرت بارێکی نیمچە هاوسەنگی وەرگرتوە و ڕاهاتوە لەسەر ئەو ستایلەی لەسەری بەردەوامیت، بەڵام ئەگەر لەناکاو منداڵێك یان گیانەوەرێك هاتە سەر ڕێگاکەت، ئەوا یەکسەر ستایلی کارەکەت شلۆقە دەبێت و ڕەفتارەکەت لە کردارێکی جوڵاوەوە دەگۆڕێ بۆ ڕەفتارێکی وەستاو، واتە (هەڵوێستەیەك دەکەیت)، لە ڕاستیدا ئەم هەڵوێستەکردنە هەر خۆی ڕەفتارێکە بەڵام لە چەشن و جۆرێکی ترەو بەبارێکی تردایە، مرۆڤ بەردەوام لە کارلێکدایە لەگەڵ ژینگەکانی دەوروبەریدا و پەیتا پەیتا وەڵامی دەوروبەری دەداتەوە، وەڵامدانەوەکانیش لە شێوەی ڕەفتاری جۆراوجۆردا دەردەبڕێت.

لەبنەڕەتدا هەموو ڕەفتارێك بەرەنجامی زنجیرەیەك هەڵچوونە، هەردەم مرۆڤ و گیانەوەرانی زیندوو لە باری هەڵچوونی گۆڕاودا دەژین، بۆ نمونە : تۆ بەردەوام تەماشای یەك شت ناکەیت، بەردەوام گوێ لە یەك جۆرە دەنگ ناگرێت، هەمیشە هەریەك جۆرە خواردن ناخۆیت، کەواتە هەڵوێست و ڕەفتارەکانت بەردەوام لە شێوەیەکەوە دەگۆڕێت بۆ شێوەیەکی تر، ئەم گۆڕانکاریە بەردەوامانەش بە دەست و خواستی خۆت نیە، بەڵکو پێویستی ژیان وا دەخوازێت، کارلەیەککردنی عەقڵ و هەست و ژیری تۆ لەگەڵ شتەکانی دەوروبەرتدا نا چارت دەکات بیر بکەیتەوە، وردبیتەوە، نەخشە بۆ کارو هەڵوێستەکانت دابنێیت ئەم جۆرە چالاکیانەش ئیشی مێشك و هەستەکانە، هەرگیز مێشك وبیر ناتوانێت هیچ چالاکیەك بکات هەتاکو نەوروژێنرێت و پاڵنەرەکان نەیبزوێنن، بزواندن و پاڵ پێوەنان و وروژاندن ئیشی هەڵچوونە، یاخود ئەو شتانە خۆیان بەشێکن لە

پێکهاتەی هەڵچوون. لە سایکۆلۆژیادا هەڵچون تەنها بریتی نیە لە بەرزبوونەوە، بەڵکو هەموو بەرزبوونەوەو نزمبونەوەیەك کەلە باری ئاسایی هەورازتر یان ئەوی تر بێت هەڵچوونە، جا ئەگەر هەڵچوونە کە هەموار بوو ئەوا بەرهەمەکەیشی هەموارو پەسەند دەبێت و ڕەفتاری چاکی لێ دەکەوێتەوە، وە ئەگەر وانە بوو ئەوا بەرهەمەکەیشی نا هەموار دەبێت و ڕەفتاری خراپی لێ چاوەڕوان دەکرێت.

هەڵچوون هەر جۆرێك بێت کاریگەری هەیە بۆ سەر گەلێك لایەنی ژیانی مرۆڤ، بەڵام ئەوەی ڕادەی کەمو زۆری هەڵچوونەکە دیاریدەکات بریتیە لە بڕی تەوژمی هەلچوونەکە، تاکو بڕەکەی زیاتر بێت تەوژم و تینی پاڵپێوەنانەکەی زیاتر دەبێت بۆ ئەوەی ڕەفتارێك بەو مرۆڤە ئەنجام بدات. گوتمان ڕەفتاریش لەخۆیەوە لە مرۆڤدا دروست نابێت بەڵکو زۆرینەی ڕەفتارەکان وەڵامدانەوەی وروژێنەرەکانن، وروژێنەرەکان دەریای هێمنی هەڵچوون دەشڵەقێنن، بەمەش شەپۆلەکان هێڵ و بازنەی فراوانتر دروست دەکەن و سنوری مەودای ڕوودانی ڕەفتارەکان فراوانتر دەبێت، لە ئەنجامدا کۆمەڵێك ڕەفتاری نوێ دروست دەبن، دواتر بەرژەوەندیەکانی مرۆڤ ئەو ڕەفتارانە دابەش دەکات بەسەر ڕەفتاری چاك و ڕەفتاری خراپدا، چونکە لە بنەڕەتدا هیچ ڕەفتارێك نیە خراپ بێت، نەژادی بنەڕەتیانەی مرۆڤ بێگەردو بێ تاوانە و مرۆڤیش بونەوەرێکی ئاشتی خوازە و ماکی شەڕەنگێزی تێدانە نیە، جێی خۆیەتی بپرسین ئەی بۆچی هەندێ مرۆڤ ئاژاوەگێڕن و هەندێکی تر وانین؟ چ شتێك جڵەو گیری مێشك و ڕەفتارگەرایی مرۆڤ دەکات؟ ژیانی مرۆڤ لە نێوان دوو هێزی زۆر گەورەدایە : یەکەمیان هێزی لۆژیکیانەی ژیری و دووەمیان هێزی هەڕەمەکیانەی سۆز، سۆزوژیری لەگەڵ دروستبونی مرۆڤدا دروست دەبن، هەر لەیەکەمین ساتی دروستبوونیشانەوە دەکەونە ململانێ و بەر بەرەکانی و جەنگەوە، جەنگە بەردەوامەکەشیان لە گۆڕەپانی (هەڵچوون) دایە، هیچ کام لە سۆزو ژیری ناتوانن بەیەکجارەکی ئەوی تریان لەناوبەرێت، ڕاستە هەرجارەو یەکێکیان ئەوی تریان بێ هێزو لاواز دەکات

و بۆ خۆی دەبێتە دیکتاتۆرێکی کاتی بۆ حوکمڕانی کردنی مرۆڤ و ئاراستەکردنی ڕەفتارەکانی.

سۆزو ژیری، وەك بارگەی کارەبایی گەردیلەیەك وانە، کەموجەب و سالبن، ئەگەر لە یەکتری دوور بکەونەوە یەکتری ڕادەکێشنەوە، ئەگەر بەتەواوەتیش لە یەکتری نزیك بوونەوە ئەوایەکتری دەخۆن و ناکۆکن، سۆزو ژیری بەردەوام لە ململانێدان جالەو ماوەیەداکە ژیری زاڵە ئەوا بەو مرۆڤە دەگوترێ مرۆڤێکی ژیر، دیارە ئەم بارەش ناو بەناوە، ساتێك هەیە و ساتێکی تر دیارنامێنێ، پێشینانمان گوتویانە (عەقڵ میوانە)، وە لەو ساتەشدا کە سۆز زاڵە دەگوترێت (فلانەکەس کەسێکی بەسۆزە)، هەردوو بارەکەش پێویستن بۆ ژیانی مرۆڤ، چونکە گرفت و کێشەی وا دێتە ڕێگەی مرۆڤ کە تەنها بە ژیری چارەسەر دەکرێ و سۆز دەوری نیە، بەڵام جاری واش هەیە ژیری دەورێکی ئەوتۆی نیە و سۆز ڕۆڵی سەرەکی دەنوێنێ.

کاتێك بڕی ژیری و بڕی سۆز یەکسان دەبن بە یەکتری ئەوە بارێکی دەگمەن و نمونەیی یە و لەوساتانەدا پێکهاتە ساخەکەی مرۆڤ دەردەکەوێ و هیچ هێزێك کاریگەریەکی ئەوتۆی لەسەری نابێ.

(میزاج) کە تێکەڵەیەکە لە ژیری و سۆزو هێشتا باری هاوسەنگی نێوانیان شلۆقە و یەکلانەبوەتەوە ترسناکترین باری دەروونیەکە ڕەفتارگەرایی تیایدا مەترسیدارە، لەبەر ئەوە پێویستە لەوبارەدا مرۆڤ هیچ ڕەفتارو کردارێك ئەنجام نەدات، چونکە وەك ئەوە وایە کە کارێك پراکتیزە بکەیت بەر لەوەی کە پێشتر بڕیاری لەسەر بدەیت، واتە جێبەجێکردن پێش بڕیاردان بکەوێت، ئەوەش پێچەوانەی سروشتی ژیانە، هەمیشە بڕیاردان دەکەوێتە پێش جێبەجێکردنەوە، ئەمە هەڵەیەکە و زۆر دەمێکە مرۆڤایەتی دوبارەی دەکاتەوە، تەنانەت ڕۆژانە خۆشمان ئەو هەڵەیە دەکەین و دەیکەینەوە. نابێت میزاجمان حوکممان بکات، چونکە شتی شلۆق ناتوانێت شتی چەسپاو ئاراستە بکات بە ئاراستەیەکی یاسایی و بەجێ، بەڵکوئەگەر ئاراستەیشی بکات ئەوا ئەو ئاراستەکردنە بێ سەروبەرەو

هەڕەمەکیانەیە.

وەك دەزانـین یـەکێك لـەو کارانـەی کـە پـەروەردە ئـەنجامی دەدات ئاراستەکردنە (التوجیە) کە بەپاڵنەری سۆزو ژیریەکی پێویستە وە دەکرێت، خۆ ئەگـەر کەسـی ئاراسـتەکار بـە پاڵنـەری میـزاج ئـەو کـارەی کـرد، بێگومـان ئاراستەکردنەکەی چەوت و بێ بەرنامەیە. پەروەردەکار (مامۆستا بێت یان دایك و باوك یان هاولاَتی) ڕۆژانـە دەیـان جـار پـەراوەی ئاراسـتەکاری دەکات لـە بـواری پەروەردەکردندا، خۆ ئەگەر (میـزاج) پاڵنـەری سـەرەکی ئاراسـتە کردنەکە بێت، ئـەوا لەلایەکـەوە ئاراسـتە کردنەکـە هەڵەیـەو لـە لایـەکی تریـشەوە کەسـە ئاراسـتەکراوەکە بـەرەو ڕێگەیـەکی هەڵدێرو ترسـناك دەبـات، واتـە نـەك شێوازی پەروەردەکردنەکەی سوودی نابێت، بەڵکو زیانێکی زۆریشی لێ دەکەوێتەوە.

کاتێك کەسێك ژیری و سۆزی لـە بـارێکی هاوسـەنگدانین مانـای وایـە ئـەو کەسە میزاج حوکمی دەکات، کەسی میزاجگەریش قسەو کـرداری لێ وەرناگیرێـت و ڕەفتارەکـانی پەسـەندو بـەجێ نـین، ئێمـەی مـرۆڤیش واراهـاتوین کـە قـسەو ئامۆژگاری و ئاراستەکردن لە کەسێك وەرناگرین کە ئەو کەسە خۆی پێچەوانەی ئاراستەی خۆی بێت، کە دوورنیە جاروبار ڕێ بکەوێت ئاراستەی میزاجیانـەش تـا ڕادەیەك لۆژیکی بێت، بۆ نمونە : منالێك بەگوێی مامۆستاکەی ناکات کاتێك پێـی دەڵێـت : (ڕۆڵە جگـەرە مەکێشە!) لـە کاتێکـدا خـودی مامۆسـتا کـە جگەرەیـەکی بەدەمەوەیە، ئەگەر چی خـودی دەستەواژەیئاراسـتەی مامۆسـتاکە جوانـە، بـەلاَم لەوبارەدا جوان نیەو وەرگیراونیە لەلای قوتابیەکەی.

پـەروەردەکردن پرۆسـەیەکە سیاسـەت و سـتراتیژی خـۆی هەیـە، کـە هـەنگاوەکانی لەسـەربنەمای زانـست و لۆژیـك دامـەزراون و مرۆڤـی پـەروەردەکار دەبێت بە هۆشیاریەکی بـەرزو شـارەزاییەکی پـڕ لـە ئـەزموون و دانایيـەکی وردەوە کاری پەروەردەکردن ئەنجام بدات و کەسێتیەکی هاوسـەنگی هـەبێت، نابێـت هـیچ شتێك هاوسەنگیەکەی لەق بکات. چونکە هەموو لەقبونێکی ڕەفتاریانە و هزریانە لە ڕاستە ڕێگەی کارەکەی لایدەدات و دەیخاتە هەڵەیەکەوە، (میزاج) یش بۆ خۆی

بارێکی شلۆق و دانەمەزراوە و لە هەموو کاتەکاندا نا هاوسەنگی و بێ بەرنامەیی بەسەریدازاڵە، کەواتە هەرگیز ناکرێت پرۆسەی دروستکردنی مرۆڤی ئایندەو ئاراستەکردنەکەی لەسەربنەمای شلۆقی و دانەمەزراوی بێت، ئەو کەسەی کە میزاجیانە بیر دەکاتەوە و بڕیار دەدات و هەنگاو دەنێ مرۆڤێکی نا ئارام و ترسنۆك و بێ بار دەردەچێ، ناتوانێت کەسێتی خۆیشی بدۆزێتەوە و کارو پیشەی شیاو بۆ خۆی هەڵبژێرێت و پەیوەندی ڕاست و دروست و هاوسەنگ و دۆستانە لەگەڵ کەس و کارو دۆست و هاوڕێ و دراوسێکانیدا دابمەزرێنێ، هەرساتە و جۆرە سروشتێکی هەیە، هەر ڕۆژەی جۆرە کارێك دەکات، هەر هەفتەیە و دۆستایەتی و تێکەڵاوی کەسێك دەکات و دواتر لەو زیرز دەبێت و دژایەتی دەکات و لەگەڵ یەکێکی تردا پەیوەندی گرێ دەدات، هەرمانگەی جۆرە ئایدۆلۆژیاو جۆرە ئاینێکی تایبەتی هەڵدەگرێ، متمانەی بەخۆی کەمە، کەسێکی هەمیشە تورەو ناڕازیە، خەڵکانی، دەوروبەری نازانن بە کام شێوە و شێواز هەڵسوکەوت و ڕەفتاری لەگەڵدا بکەن، لەبەر ئەوە زوربەی کاتبێ هاوەڵ و هاوسێ و هاوڕێ یە، تەنها و دابڕاوە، کەسێکی ڕۆح سوك و خۆشەویست نیە لە کۆمەڵگەدا، لە مانەوە بۆمان دەردەکەوێ کە مرۆڤ میزاجی شیاو نیە بۆ کاری پەروەردە و فێرکردن.

مامۆستا ئەو کەسەیە کە وانەی دروستکردنی کەسێتی قوتابی دەڵێتەوە، خۆی چۆن بێت قوتابیەکەیشی وا دەبێت. خۆ ئەگەر مامۆستا کەسێکی میزاجی بێت، ئەوا مەترسیەکە زۆر گەورەترە، چونکە مامۆستا نەك هەر یەك کەسی وەکو خۆی دروست دەکات، بەڵکو تەنها لە یەك پۆلدا نزیکەی (٢٥) قوتابی تێدایە، بەم پێیە تەنها (لە (٤) پۆلدا (١٠٠) کەسی وەکو مامۆستا دروست دەبن، ئەمەش ڕوونکردنەوەیەکی ترسناکە و گەورەترین نەخۆشی کۆمەڵایەتی و دیاردەی دەرونی لێدەکەوێتەوە، ئەم نمونەیە کەم تا زۆر بۆ هەموو کەسێك ڕاستە، جا ئایا ئەو کەسە لە چوار چێوەی پەروەردەی خێزاندا بێت وەك دایکو باوك و کەسانی سەروو تەمەنی هەژدە ساڵ،یاخود پەروەردەکارێك بێت لەناو ئۆرگانە پەروەردەییە فەرمی و نافەرمیەکان وەك (ڕابەری پەروەردەیی، مامۆستا، توێژەر،

سەرپەرشتیارو.... هتد).

پوختەی باس گەیشتینە ئەوەی کەلە ناو کارو پرۆسەی پەروەردەییدا شوێنێك نیە کە جێگەی میزاج و میزاجگەرایی بێت، نەك هەر ئەوە بەڵکو یەکێك لەکارو ئەرکەکانی پەروەردە ئەوەیە کە نەهێڵێت مرۆڤی میزاجی دروست ببێت لە کۆمەڵگەدا، وە نابێت هیچ کەسێکی پەروەردەیی هیچ جۆرە بڕوبیانویەك بهێنێتەوە بۆ ئەوەی کە میزاجی بێت، جا ئەگەر بارودۆخی بۆ نەڕەخسا، ئەوا باش وایە لە پرۆسەی پەروەردەیی دووربکەوێتەوە،نەبادا بە میزاجەکەی پرۆسەی پەروەردە بشوێنێ.

ئەگەر تەنها میزاج حوکمی مرۆڤ بکات، ئەوا هیچ جۆرە پێوەرێکی ڕاستەقینە لەبەر دەستی مرۆڤدا نابێت بۆ ئەوەی لایەنی هەموارو ناهەمواری پێ لە یەکتری جیا بکاتەوە، یاخود پلە و ئاستی چاکی و خراپی هەڵوێست و قسەو ڕەفتاری کەسەکانی پێ پلە بەند بکات، لەبەر ئەوە مرۆڤێك چەندە چاك و باش بێت ئەگەر ئەو کەسە میزاجی نەیگرت ئەوا هیچ چالاکیەکی ئەو کەسە نابینێ، یاخود بە پێچەوانەوە، میزاجگەرایی وەکو لە رزوتا وایە، مرۆڤی توشبوو کە سەرمای بوو، هەر چەندە دایپۆشیت و گەرمی بکەیتەوە هیچ سودی نیە و هەست بەگەرمبوونەوە ناکات و هەر چۆقەی ددانی دێت، وە ئەگەر گەرمایشی بوو چەند فێنکی بکەیتەوە هەر گەرمایەتی و جوانا و دەردەدات.

کاری پەروەردە کردن کارێکی هاوسەنگ و ژیرانە و پڕ لە حیکمەتی بەردەوامە، نابێ پچڕ پچڕ و جۆراو جۆرو میزاجیانە بێت، بەڵکو ئەوکارە بە بەردەوامی و زرنگی و دانایی و هاوسەنگی دەکرێت و سەرکەوتوو دەبێت.

# مەرجە هەموو پەروەردەکارێك پەروەردە ناس بێت

پەروەردە، بوەتە یەکێك لە سیما سەرەکیەکانی کۆمەڵگەی مرۆیی، ئەم سیمابوونەیشی تازە نیە، بەڵکو مێژووی پەروەردە لە پێش مێژووی فەلسەفەیەوە، مرۆڤ بەرلەوەی بزانێت بۆچی دەژی، پێویستە بزانێت چۆن بژی، ئەمەش سەلماندنی ئەو ڕاستیەیەکە پەروەردە لە فەلسەفە لە پێشترە، لە زنجیرە باسەکانی ئەم بابەتە پەروەردەییانەدا ئاماژەمان بە گەلێك لایەنی گرنگی پەروەردەکرد، یەکێك لەو ڕاستیانە ئەوە بوو کە هەریەکە لە ئێمەی مرۆڤ لەناو کایەو سنوری بازنەی پەروەردەداین، ئەوەش بە خواستی خۆمان نیە، چونکە هەریەکەمان ئەرکێکی پەوەردەییمان لە ئەستۆدایە، جا یان (پەروەردە دەکەین)، یاخود (پەروەردە دەکرێین)، لەم ڕوانگەیەوە پێویست دەبێت لەسەرمان کە پەروەردەناس بین، یان بەلایەنی کەمەوە خەسڵەتە سەرەکیەکانی پەروەردەبناسین، هەموو کەسێك لە ئێمە هزروبیرێکی خۆی هەیە، واتە کەرەسەی خاوی، بەمرۆڤبونی تێدایە، بەلام چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو هزرەو پەروەردەکردنی جۆری ئەو مرۆڤە دیاریدەکات، ئەگەر چی هەموومان لە خاوەنداریێتی هزرو بیردا یەکسانین، لە ئاستی تێگەیشتن و چۆنیەتی هەڵوێست و ڕەفتاری ڕۆژانەماندا، چونکە لە بنەڕەتدا شێوازی پەروەردەکردنی ژیریمان جیاواز بووە، (من پەروەردەکەمم) واتە من چۆن پەروەردەکراوم، ئاوەهاش دەردەچم، ناسنامەکەمان پەروەردەکەمانە، هەریەکەمان نوێنەری پەروەردەکەی خۆمانین، تەنها پەروەردەکە دەتوانێت سروشتی ڕەفتارگەرایی مرۆڤ بگۆڕێت، بۆ نمونە : ئەگەر مناڵێکی ساوای یابانی بە خێزانێکی ئەمریکی بسپێرێت، کاتێك مناڵەکە گەورە دەبێت دەبێتە کەسێکی ئەمریکی و جگە لە ڕەنگ و ڕوخسارەکەی هیچ شتێکی تری لە یابانی ناچێت، تەنانەت گەلێك مناڵی کورد هەیە کەلە خێزانی ڕەوەندی کوردی لەولاتانی بیانی لە دایك بوەو پەروەردەکراوە، ئەگەر چی لەگەڵ دایکو باوکی خۆیشیدا بووە لە و وڵاتە، بەڵام ڕەفتارو شێوازی ژیانی ئەو وڵاتەی

زیاتر پێوە دیارە، بە بەراورد لەگەڵ شێوازی ژیانی کوردەواری، کەواتە پەروەردە مرۆڤ بەو شێوەیە دروست دەکات کە دەیەوێت و ڕەگەزو بنەچە و تۆخم دەورنابینێ، ئەگەر سەردانی کارگەیەکی شیرەمەنی بکەیت، بۆت دەردەکەوێ کە لەو کارگەیەدا جۆرەها بەرهەم دروست دەکرێت، وەك (ماست، قەیماخ، شیر، کەرە، پەنیر، دۆ،..... هتد) هەریەکە لەبەرهەمەکان لە ڕوی ڕەنگ و شێوە و تامەوە لەوانی تر جیاوازە، بەڵام هەمووشیان لە بنەڕەتدا لە یەك مادەی سەرەکی دروست کراون، کە شیرە، پەروەردەش بە هەمان شێوە، کارگەیەکە بۆ دروستکردنی مرۆڤی گونجاو لە هەمان مادەی سەرەکی هاوبەش کە لە هەموویاندا هەیە، ئەو مادە هاوبەشەش (هزرو بیر) ە.

ئێمە وەك پەروەرەکارێك لە خۆمان دەپرسین، یاخود کەسێك لێمان دەپرسێت : (ئەرێ پەروەردە مانای چیە؟) بێگومان هەقە وەڵامی زانستیانەمان بۆ ئەو پرسیارە لەلا بێت، چونکە ناکرێت لە پرۆسەیەکدا کار بیکەین کە نایناسین، لەبەر ئەوە جێی خۆیەتی بەخۆی و خەسڵەتەکانیەوە بیناسین.

زانایانی پەروەردە ناس لەسەر ئاستی جیهانی هەریەکەیان لەسەردەم و چاخ و وڵاتێکدا ژیاون، لەبەر ئەوە هەریەکەیان بە جۆرێك پێناسەی پەروەردەی کردوە، ئێمە لێرەدا ناچینە ئەو باسە دوورودرێژەوە، بەڵکو ئەو پێناسە گشتیە دەخەینە ڕوو کە زوربەی زانایانی بواری پەروەردە لە جیهاندا لەسەری کۆك و هاو دەنگن، کە دەقەکەی بەم جۆرەیە : (کرداری کارلێکردنی بەردەوامە، کە جۆرەها چالاکی کاریگەر دەگرێتەوە، بۆ سەرتاکی کۆمەڵگە بەهەموارو ناهەموارەوە، کار دەکات لە بواری ئاراستە گەرایی ژیاندا، لەگەڵ ئەو ڕووکارانەی بەهۆیەوە شێوازەکانی گوزەرانی دەستگیر دەبێت، هاوکات فێری ڕێگەکانی هاو گونجاندنی دەکات لەگەڵ ئەو ژینگە سروشتی و کۆمەڵایەتیەی ئەو تاکەی تێدا دەژی)

لەمەوە تێدەگەین هەر وەکو چۆن کارلێکردنی بەردەوامی نێوان تیشکی خۆرو دوانۆکسیدی کاربۆن و ئاو دەبێتە مایەی گەشەکردنی ڕوەکەکان، ئاوەهاش

کارلێکردنی عەقڵی مرۆڤ و ژینگەکانی دەوروبەری دەبنەمایەی پەروەردەکردنی تاکی کۆمەڵگە، جا هەر وەکو چۆن گەشە کردنی ڕوەك گەلێك جۆرە چالاکی لێدەکەوێتەوە، پەروەردەش بەهەمان جۆر، لە ڕوەکدا پەروەردە و گەشەکردن گەورەبوونی ڕوەکەکەو بەرو تۆو و گەڵاگرتنی لێدەکەوێتەوە، دواتر سێبەرو شنە شنی دەبێت و (هەوا) لە دوانۆکسید پاك دەکاتەوە، ئەمانە هەموویان ئەو چالاکیە جۆراوجۆرانەن کە لە ئەنجامی پەروەردەکردنی درەختێکەوە دەست دەکەون، مرۆڤیش هەروایە، دەتوانێت بەشێوە پەروەردەیەکی خراپ مرۆڤی خراپ دروست بکەیت و بە پەروەردەی پەسەندیش مرۆڤی چاك دروست بکەیت، چونکە کاری سەرەکی پەروەردەکردن بریتیە لە پەراوە و مەشق و ڕاهێنانی مرۆڤ بۆ خۆ گونجاندن لەگەڵ ژینگە جۆراو جۆرەکان لە ڕێگەی ئاراستەکارییەوە.

لەبەر ئەوەی ئامانجە پەروەردەییەکان زۆرن، کەواتە خەسڵەتە پەروەردەییەکانیش زۆرن و بەئاسانی ناتوانین ئەو هەموو ڕێگە و شێوازانە ئەژمار بکەین، لەبەر ئەوە خەسڵەتەکان لەم چەند خاڵە سەرەکیەدا کۆ دەکەینەوە :

١. بەگران کرداری پەروەردەکردن سنورەکانی دیاریدەکرێت.

٢. پێش هەموو شتێ پەروەردەکردن، کرداری گەشەکردنە، واتە ئەو بوارەی پەروەردەکار ئیشی تێدا دەکات بوارێکی گەشە پێدانی مرۆیی یە لەڕوی جەستەیی و ژیری و سۆزو زانیاری و شارەزایی یەوە، واتە کرداری گەشە پێدانی کەسێتی مرۆڤە، بەشێوە گشتیەکەی.

٣. بەردەوامی : کاری پەروەردەکردن کارێکی نەپساوەو بەردەوامە، لەگەڵ دروستبونی مرۆڤدا لە زگی دایکی دا دەست پێدەکات تا دواهەمین ساتەکانی ژیان، بەردەوامە لە ڕوی کۆمەلایەتی و مادی و مەعنەویی و ڕەوشتی و شارستانێتی یەوە، هەر کاتێك پەروەردە وەستا، ئەوا شارستانێتیش دەوەستێت. کەواتە لە دایکبونمان، مانەوەمان، خەوتنمان، گوزەران و هەڵسوکەوتمان، کاسبی و کارو پیشەمان، لەشساخی و

نەخۆشیمان، منالی و لاوی و پیریمان، سیاسەت و ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیریمان، ئاشتی و جەنگمان هەر هەمووی یان ڕاستوخۆ پەروەردەیە، یان بەرهەمی پەروەردەیە، بۆ نمونە، ئەگەر سیاسەتمەدارێکی گەورەی وڵاتێك کەسێکی شارەزای بواری پەروەردە نەبێت، یاخود لە بنەڕەتدا بە پەروەردەیەکی نایاب پەروەردە نەکرا بێت، نازانێت بە شێوەیەکی لۆژیکی و هاوسەنگ پەراوەی کاری سیاسیانەی خۆی بکات، لەبەر ئەوە بەردەوام کاروبارەکانی کرچ و کاڵ و شلۆق و بێ بنەمان، ئەم بارە ڕاستە بۆ هەموو کەسێك کە لەبوارە کۆمەڵایەتی و دەرونی و ئابووری و ڕۆشنبیریەکاندا کار بکات، بەواتا فراوانەکە دەبێت هەموو مرۆڤێك بەرهەمی کارگەیەکی پەروەردەیی نایاب بێت، ئەوسا مرۆڤێکی تەواو و هاوسەنگ و سروشتی یە.

ئەمڕۆش کە هەرێمی کوردستان چەندین قەیرانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسی و ئابووری هەیە، زوربەی هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خاڵەی سەرەوە، واتە کاربە دەست و بەرپرسەکان زوربەیان پەروەردەیی نین، یاخود پەروەردە ناس نین، چونکە دروستبونی هەموو قەیرانێك دەگەڕێتەوە بۆ کەمتەرخەمی پەروەردە، وە چارەسەرکردنەکەیشی هەر لە ئەستۆی پەروەردەدایە، پەروەردە مرۆڤەکان بۆ شوێنی شیاوی خۆیان دروست دەکات، ئەگەر وانە بوو ئەوا کەسانی نەشیاو ئەو شوێنانە پڕ دەکەنەوە و ئاکامێکی قەیراناوی بەرپا دەبێت و وڵات لە گرەژەنە دەچێت و ئالۆزی باڵ بەسەر هەموو شتەکاندا دەکێشێ و کەسیش چارەسەری ڕاستەقینە نادۆزێتەوە.

٤. نەخشە بەندی : پەروەردە، کارێکی ئامانجدارو ئامانج دیارە، واتە بەرلەوەی بەشێوەی پراکتیکی کاری پەروەردە بکەین، دەزانین کە ئامانج و ئاکامەکەی چی دەبێت و چۆن دەبێت، دەمانەوێ کەسی پەروەردە کراو چۆن بێت و کێ بێت بە واتایەکی تر پەروەردە کارێکی هەڕەمەکی و بێ بەرنامە نیە، کارێکی ژیرانەیە، هەر کارتێك پەروەردە لەسەربەرنامە و

نەخشەیەکی ڕوون نەبوو، ئەوا بەوەناوترێت پەروەردە، بەڵکو تەنها نەریتێکی خوو پێوە گیراوی کۆمەڵایەتیانەی میراتیە، ئەگەر لێرەدا سەرنجێك لەو شێوە پەروەردەکردنانە بدەین کە ئێمەی کورد لە چوارچێوەی خێزان و کۆمەڵگە و قوتابخانەکاندا پەیڕەویان دەکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە پەروەردەی ئێمە بە پەروەردەیەکی ڕاست و دروست دانانرێت چونکە هیچ کام لە ئەندامانی خێزان نازانن بۆ چی منداڵ دەخەنەوە؟ ئامانج لە بەخێوکردنی منداڵدا چیە؟ بۆچی دەینێرین بۆ قوتابخانە؟ ئایا دوای تەواو کردنی خوێندن سوود لەو خوێندنە وەردەگیرێت؟ ئێمە وەڵامی ئەم پرسیارانەمان نەداوەتەوە منداڵەکانیشمان بەتێگەیاندن و پێگەیاندنێکی ڕاست و دروستەوە سازو ئامادەنەکردوە کەشیاو بن بۆ چوونەناو پرۆسەی پەروەردەی فەرمی یەوە، ئەمە جگە لەوەی کە پەروەردەی فەرمی خۆیشی وەك پێویست تۆکمە و داڕێژراونیە کە بتوانێت کە لەبەری ئەو پەروەردە هەڕەمەکیەش پڕ بکاتەوە کەلە کۆمەڵگەدا پەیڕەو دەکرێت، بەمانا ڕاستەقینەکەی تاکو ئێستا کۆمەڵگەی کوردەواریمان خاوەنی پرەنسیپ و پەروەردەیەکی بەرنامە ڕێژی یەکانگیرنیە نەلە ستایلێکی میللی کۆمەڵایەتیدا و نەلە ستایلی فەرمی دە[illegible]ەتدا، هیچ کام لە خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵگە بەرنامە و پەیڕەو و [illegible]ڕۆگرامێکی پەروەردەیی دامەزراویان لەبەردەستدا نیە کە منداڵەکانی لەسەر گۆش بکەن. بەڵکو ئێمە و منداڵەکانیشمان خۆمانداوەتە دەست ڕۆژگار.

٥. کارلێکردن : پێویستە پەروەردەکارو پەروەردەکراو کارلێکی ژیری و سۆزو ویژدان لە نێوانیاندا بەردەوام بێت، لەوەرگرتن و بەخشینی زانیاری و ئاڵوگۆڕی زانستدا، هەرگیز پەروەردەکار سەرکەوتوو نابێت لەکارەکەیدا ئەگەر لەو باوەڕەدا بێت کە تەنها خۆی سەنتەری سەرەکیە و سەرچاوەی زانیاریە و بەردەستەکانی گێل و نەزانن، بەڵکو دەبێت

دڵنیابێت لەوەی کە وەرگر و بەخشەر ئەو دوکەسەن کە کارلێکی ژیری و ئاڵوگۆڕی زانیاری بەردەوام لە نێوانیاندا هەیە، مەرج نیە پەروەردەکارو مامۆستا هەمیشە هەر خۆی بەخشەر بێت، بەڵکو مامۆستاو قوتابی هەر جارەی یەکێکیان بەخشەرەو ئەوی تریان وەرگرە.

٦. گونجاندن : پەروەردە کرۆکو جەوهەری گونجاندنە، گونجاندنی مرۆڤ لەگەڵ خۆی و خێزان و تاکەکانی دەروبەری و خاك و وڵات و ژینگەی سروشتی دا، کەواتە پێش هەموو شتێ دەبێت پەروەردەکار خۆی کەسێکی گونجاو بێت، گونجاو بێت لەگەڵ خودی خۆی و کارو پیشەکەی و کەسانی دەوروبەریدا، مرۆڤی نەگونجاو دەگمەن و ناوێزەیە و وەك دەنکەنۆکی ناو نیسك بە ئاسانی دەردەکەوێ، خەڵکیش وەك مرۆڤێکی ئاسایی سەیری ناکەن، بەڵکو وەك کەسێکی توشبوو بەنەخۆشیە کۆمەڵایەتیەکان تەماشای دەکەن و مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن.

ئەم شەش خاڵە سەرەکیە خەسڵەتەکانی پەروەردەن و دەبێت هەموو مرۆڤێکی پەروەردەکار بەوردی بیانناسێت و لێیان تێبگات و پراکتیزەیان بکات.

(پەروەردە ناسی) جگە لەوەی کە زانستێکە و بەوردی لە زانکۆکاندا دەخوێنرێت، هاوکات پرۆسەیەکی مرۆیی و کۆمەڵایەتی گرنگە و دەبێت هەموو تاکێکی کۆمەڵگە کە تەمەنی لە سەرووی تەمەنی هەژدەساڵەوە بە تەواوەتی تیایدا شارەزا بێت، لێرەدا ئێمەی کورد دیسانەوە گرفت و کێشەمان هەیە، چونکە زوربەی کەسانی بەرپرس لە کاری پەروەردەیی، پەروەردەناس نین، بگرە لەبەر نەزانی و کەم ئاستی خۆیان پەروەردە و پرۆسەی فێرکردنیان تێکداوە و کاتی ئەوە هاتوە ئەم قەیرانە چارەسەر بکرێ.

بیر لە هەر گۆرانکاریەکی کۆمەڵگەو گەل و وڵاتمان بکەینەوە دەبێت لە پەروەردەوە دەست پێ بکەین، چونکە هەموو گۆرانکاریەك پرۆژەیە، هەموو پرۆژەیەکیش پێویستی بە (بودجە، کات، شارەزایی) هەیە، ئەمانەش تەنها لە لای پەروەردە دەست دەکەون، بودجە بەرەنجامی کارو کۆشش و ماندووبوونە،

پەروەردەیە فێرمان دەکات چۆن خۆمان ماندوو بکەین بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوت و دەرامەت، پەروەردەی خێزان و کۆمەڵگە فێرمان دەکات چۆن ڕێزی کات بزانین و بەباشی سوودی لێ وەربگرین، شارەزایی لە ئەنجامی فێرکردن و فێربون و مەشق و خوێندن و ئەزمون و ڕاهێنانەوە دەستمان دەکەوێت، کە ئەمەش کوت و مت کارێکی سەرەکی و ئەرکێکی فەرمی پەروەردەیە.

# خەسڵەتەکانی مامۆستای سەرکەوتوو لە پرۆسەی پەروەردەییدا

ئەرکی سەرەکی مامۆستا بریتیە لە (فێرکردن)، بەڵام لەبەر ئەوەی قۆناغی تەمەنی ئەو کەسانەی دەخرێنە بەردەستی مامۆستا، ئەو قۆناغەیە کە پێویستی بە (پەروەردەکردن) هەیە، بەناچاری کاری پەروەردەش بوە ئەرکێکی تری مامۆستا، ئەمەش نەك هەر لە هەرێمی کوردستان بەڵکو لە هەموو جیهاندا تا ئێستاش (پەروەردە و فێرکردن) پێکەوە دراون بە مامۆستا، لە هەندێ وڵاتدا (پەروەردە و خوێندنی باڵا) و زانکۆیش پێکەوە لەیەك وەزارەتدان، ئەمە لەباری ئاساییدا.

بەڵام لە بارێکی نائاسایی وەك بارودۆخی ئێستای هەرێمی کوردستاندا حاڵەتەکە جیاوازە و دەیان ئەرکی لابەلایی تر دراون بەسەر شانی مامۆستایاندا، لەوانەش (چاودێری تەندروستی و دەرونی منداڵ) وریاداری و پاراستنی، ڕێنومایی خۆی و خێزانەکەی، فێرکردن، بەخێوکردن، ئاراستەکردن، پەروەردەکردن و..... هتد، تەنانەت لە دێهاتە دورە دەستەکاندا مامۆستای قوتابخانە دەوری پزیشك و فریاگوزایش دەبینێ، دەرزی و تەداوی دەکات، وەك مەلای ئاوایی نوێژی هەینیش بۆ خەڵکی دەکات، هەر کۆمەڵە و ڕێکخراو و کەسێکی نامۆ بێتە گوند، میوانی ماڵی مامۆستایە، کەواتە ئەرکی پێشوازی و خزمەتگوزاری میوانەکانیشی لە ئەستۆدایە، سەردانی ماڵی خەڵکی گوند دەکات و چارەسەری گەلێك کێشەی کۆمەڵایەتی پەروەردەیی دەکات، ئەمە شیان دوو ڕۆڵی ترە، یەکەمیان ڕۆڵی توێژەری دەرونی و کۆمەڵایەتی، دووەمیان دەوری ئەنجومەنی گوند و بگرە دادوەری گەرۆك، هاوکات گەلێك ڕێنومایی ئاژەڵداری و کشتوکاڵی بە دانیشتوان ڕادەگەیەنێ، واتە وەك پزیشکی ڤیرتێرنەری و ڕابەری کشتوکاڵی وایە و..... هتد،

بەکورتی مامۆستای گوندەکان لە هەموو جۆرە چالاکیەکانی دێهاتەکاندا بەشدارن و ئەتوانن دەوری خۆیان بنوێنن، ئەم کارانە جگە لەوەی بۆ خەڵکی بە سوودن هاوکات وەك خولێکی ڕاهێنان وایە بۆ خودی مامۆستاکە، بەتایبەتی بۆ مامۆستایانی تازە.

لەناو شارو شارۆچکەکانیشدا مامۆستایان گەلێك ئەرکی گرانیان لە ئەستۆدایە، ئەگەر هیچ نەبێ دوو هۆکار بە تەواوەتی مامۆستایانی شەکەت و ماندوو کردوە :

١. زۆری ژمارەی قوتابیان، کە زووربەیان یاری ئەلکترۆنی و کەناڵەکانی TV و پەروەردەی کۆڵان بوە بە مۆرێکی کوشندە بە پەروەردەکەیانەوە.
٢. ئامادە نەبون و لێنەپرسینەوەی دایکان و باوکان لە منالەکانیان.

ئەمانە هەموویان ئەرکی گرانن لەسەر شانی مامۆستایان لەشارو گوندەکاندا، بەڵام دوای پێزانین بەو ئەرکە و دەستخۆشی لێکردنیان، پرسیارێك دێتە ئاراوە : ئایا مامۆستایان تا چەندێك شارەزاو ڕۆشنبیرن و چەند خەسڵەتی مامۆستای سەرکەوتویان تێدایە؟

دیارە وەلامدانەوەی ڕاستەقینەو پراکتیکیانەی ئەم پرسیارە لە هەموو ئەرکەکانی تر گرانترە، بێگومان خەسڵەتەکانی مامۆستای سەرکەوتوو قسەی باخەڵی من و تۆ نیە، بەڵکو لە دوای دەیان ساڵ لێکۆڵینەوەی زانستی و مەیدانی زانایانی جیهانی لە بواری پەروەردە و فێرکردندا ئەو خەسڵەتانەی دۆزراونەتەوە و ڕیزبەندکراون، هاوکات بوونەتە پێوەرێك بۆ هەڵسەنداندنی مامۆستایان.

لەبەر ئەوەی کە پەروەردە و فێرکردن بەر لەوەی کارێکی پراکتیکی بن، کارێکی هزرین، کەواتە پەروەردە فەلسەفەیە، ئەو کەسەی کە کاریشی پێدا دەکات دەبێت فەیلەفسوف بێت، لە لایەن خۆتەوە کام داتات لەبەر دەستدایە کە ڕێژەیەکی دیاریکراوت بداتێ دەربارەی ئەو مامۆستایانەی فەیلەسوفن و ئێستا لە پرۆسەی پەروەردەدا کار دەکەن؟ دەچینەوە سەر وەڵامی پرسیارەکەمان.

زانایانی پەروەردەناس خەسڵەتەکانی مامۆستای سەرکەوتوو لە دوو تەوەردا پۆلێن دەکەن :

١. خەسڵەتە زانستیەکان.
٢. خەسڵەتەکەسێتیەکان.

خەسڵەتەکانی تەوەرەی یەکەم پەیوەندی بە لایەنی مەعریفی مامۆستاوە هەیە، واتە ئەو خەسڵەتانەی کە بەڵگەن لەسەر پڕبوونی مێشکی مامۆستا بە زانیاری و زانست و شێوازی سەرکەوتوانەی وانە وتنەوەو گەیاندنی زانیاری بە قوتابیەکانی و شێوازو تەکتیکی و هونەری لە ستراتیژی بەرنامەگەری گواستنەوەی زانیاری لە مێشکی خۆیەوە بۆ مێشکی قوتابیەکانی، بەبێ بەکار هێنانی هیچ جۆرێکی توندو تیژی جەستەیی و دەروونی، واتە گەیاندنێکی سادە و سروشتی، کە دواتر بە خاڵ باسیاندەکەین.

تەوەری دووەمی خەسڵەتەکان پەیوەندی بەکەسێتی خودی مامۆستاوە هەیە : واتا ئەو کەسە وەك مرۆڤێکی فێرکار دەبێت خەسڵەتە مرۆیی و پیشەییەکانی چۆن بێت، ئەمەشیان دیسان هەر لە چەند خاڵێکی سەرەکیدا کۆ کراوەتەوە.

دەربارەی خەسڵەتە زانستیەکانی مامۆستا، چوار خەسڵەتی سەرەکی هەیە، کە هیچ بیانوویەك نیە، بۆ نەبوونی ئەو خەسڵەتانە، کە ئەمانەن :

١. ئامادەییەکی ئەکادیمیانە : واتە دەبێت مامۆستا خۆی بە شێوەیەکی ئەکادیمی بو بێتە خاوەنی بڕوانامەیەکی شیاو بۆ بوارێکی پسپۆڕی دیاریکراو لە پیشەی مامۆستاییدا، بەخواست و هیوایەت و ئارەزووی ئازادانەی خۆی کاری مامۆستایی هەڵبژاردبێت، نەك نمرە و باری ئابووری و حاڵەتی ناچاری و زەروری ڕۆژگار کردبێتی بە مامۆستا، کە زوربەی مامۆستایانی ئەم سەردەمە ئەو مەرجەیان تێدانیە، هەروەها دەبێت خۆیشی هەربە شێوەیەکی ئەکادیمی قوتابیەکانی پەروەردە بکات و بەپێی میزاجی خۆی کار نەکات، هەموو بەڵگەیەکی لەبەردەستابێت کە بیسەلمێنێ خۆی کەسێکی ئەکادیمیەو بە شێوەیەکی ئەکادیمیانەش

پەراوەی کارو پیشەی پیرۆزی خۆی دەکات.

٢. بازنە و سنوری مەعریفەی زۆر فراوان بێت، مێشکی بانکێك بێت لە زانست و زانیاری هەمە جۆر، ئاستی شارەزایانی زۆر زۆر زیاتر بێ لەو زانیاریانەی لە کتێبە مەنهەجیەکانی بەردەستیدا هەیە، زۆر بایەخدەر بێت بە پێگەیاندنی خۆی و قوتابیەکانی، بەردەوام خەریکی فێربونی زانست و زانیاری نوێ بێت و خۆی ڕۆشنبیر بکات، بەلایەنی کەمیەوە ڕۆژانە (٢) کاتژمێر خەریکی خوێندنەوەی بەسوود بێت لە بواری پسپۆڕیەکەی خۆیدا.

٣. هەموو زانیاریەکی تەواوی لەبەردەستدا بێت دەربارەی یەکەبەیەکەی قوتابیەکانی، واتە قوتابیەکانی بە تەواوەتی بناسێت لە ڕووی جەستەیی و دەرونی و کۆمەڵایەتی و داراییەوە، ڕادەی توانای ژیری و ئاستی زیرەکی و جیاوازیە تاکەکەسیەکانیان بزانێت، ئاشنایەتی و پەیوەندی تەواوی هەبێت لەگەڵ دایك و باوکیاندا و سروشتی خێزان و ماڵ و گوزەرانیان بزانێت، وا باشە ئەم زانیاریانە بەوێنەوە، بە ئەدرەسەوە لە تۆمارێکی تایبەتی دا تۆمار بکات (شادمان بووم کاتێك ئەم تۆمارەم بۆ یەکەمجار بەدەستی مامۆستا تەهابیلا لەومبینی لە ژوری پۆلدا، لە کاتێکدا ئەم مامۆستایە زیاتر لە (٣٠) ساڵە مامۆستایە).

٤. هاندانی قوتابیان بۆ خوێندن و خوێندنەوەی کتێب و سەرچاوەی دەرەکی و چالاکی جۆراو جۆری دەرەوەی پۆل، بەبێ ئەوەی ئەمانە لەسەر حیسابی وانەکانی پرۆگرامی خوێندن بێت.

دەربارەی تەوەری دووەمیش (٤) خەسڵەتی سەرەکی هەیە، کە پەیوەندی بە کەسێتی خودی مامۆستاوە هەیە، کە ئەمانەن :

١. هاوسەنگی و دەربڕینی سۆزو خۆشەویستی : دەبێت مامۆستا بە شێوەیەکی هاوسەنگ گفتارو ڕەفتار بنوێنێ، هەرگیز جیاوازی نەکات لە نێوان منداڵەکانی خۆی و قوتابیەکانیدا، سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆیان

دەربڕێت، نابێت هەر ڕۆژەو میزاجی بە جۆرێك بێت، بەڵكو دەبێت لە هەموو كاتێكدا یەك جۆرە كەسێتی نەگۆڕی هەبێت. ئەگەر ڕۆژێك گرفت و كێشەیەكی وای هەبوو كە كاری كردە سەر تێكدانی كەسێتیەكەی، ئەوا با ئەو ڕۆژە دەوام نەكات، چونكە تاكو قوتابی لە ناخی دڵیەوە ماموستاكەی خۆی خۆشی نەوێت گوێی بۆ ناگرێت، گوێ نەگرتنیش سەرەتای داخستنی دەروازەكانی فێربوون و گۆڕانكاریە، ناشیرینترین دیمەن بەلای قوتابیەوە دیمەنی ڕوخساری ماموستاكەیەتی لە كاتی هەڵچون و توڕەبوندا.

٢. گوڕوتین : دەبێت ماموستا بەگوڕوتین بێت لە كارەكەیدا و هەمیشە گەشاوەو چالاك بێت، خاوەنبێتەوە و تین و تواناكانی سارد نەبێتەوە، چونكە چەندە ماموستا چوست و چالاك و بەگوڕبێت قوتابیەكانیشی هێندە بەگەرم و گوڕییەوە دەچنە ناخی وانەكەوەو ئاوێتەی هزرو بیریان دەبێت، بەم جۆرە پەروەردە و فێركردن لای منداڵ دەبێتە خواست و ئاوات و كارێكی هزری و هەمیشەیی.

٣. مرۆڤایەتیبوون : ماموستا بەرلەوەی هەرشتێك بێت، مرۆڤە، كەواتە دەبێت هەموو خەسڵەتێكی مرۆڤانەی تێدا بێت، توانای خۆگونجاندنی هەبێت لەگەڵ هەموو جۆرەكانی مرۆڤدا، خۆی بەبێ هاوتا نەزانێ و لوت بەرز نەبێت، عەقڵیەتێكی كراوە و فراوان و ئازادی هەبێت، هاوكات خۆی بەسەنتەری سەرەكی بزانێت و نەبێتە پاشكۆ، پرۆژەی پەروەردە و فێركردن بكاتە پرۆژەی ژیانی، چونكە پەروەردە خۆ ئامادەكردن نیە بۆ ژیان، بەڵكو ژیان خۆی پەروەردەیە، یاخود پەروەردە خۆی ژیانە.

ئەمانە هەندێ لە خەسڵەتە سەرەكیەكانی ماموستای سەركەوتوو بوون، كە دوای چەندین ئەزموون و لێكۆڵینەوەی جیهانی گەلالە كراون، لەوانەش لێكۆڵینەوەكانی زانا (سیمان و نەشیر) لەساڵی ١٩٦٤ دا، وە لێكۆڵینەوەكانی ساڵی ١٩٧١ و ١٩٦٦ ی (تۆرانس و پارتن) و (ڕیانز لە ساڵی ١٩٥٩) دا و گەلێكی تر، كە لە

کتێبی (علم النفس التربوی) – الدکتور عبدالمجید نشواتی – لاپەڕە (٢٣٣) دا بە کورتی ئاماژەیان پێ کراوە.

ئەوە ماوەتەوە بڵێین کە مامۆستایانی ئەمڕۆی ئێمە زوربەی خەسڵەتەکەسێتیەکانیان تێدایە، لێبڕاوو خۆبەخش و دڵسۆزن، بەڵام ئەمانە بەس نیە بۆ کاری پەروەردە و فێرکردن، بەڵکو پێویستە مامۆستایان هۆشیاریەکی پەروەردەی فراوانیان هەبێت، ڕۆشنبیرو خوێنەری بەردەوام بن، بوێرو کارامە و دیموکراسی بن / داهێنەر بن لە بواری کارەکەیاندا و لە هەوڵی بەردەوامدا بن بۆ ئەوەی ژینگەی پەروەردەیی بۆ منداڵەکەنمان دروست بکەن، ماڵ و قوتابخانە و بازاڕو ڕێگەو بان و گەڕەك و کۆڵان و گوند بکەنە قوتابخانە، چونکە چەندە مامۆستا لە چوار چێوەی قوتابخانەکەی خۆیدا، خۆی بە قوتابیەکانیەوە ماندوو بکات بێ هودەیە، ئەگەر ژینگەی کۆمەڵایەتیانەی قوتابیەکان ژینگەیەکی پەروەردەیی نەبێت، پەروەردە کردنی نەوەکان پرۆسەیەکی گشتگیرانە و بەردەوامە و هەموو هاوڵاتیەکیش بەشێك لە کاری پەروەردەی لە ئەستۆدایە، کە ئەمەش بەرپرسیاریەتیەکی مرۆیی و ویژدانی و نیشتمانی یە.

# لە پرۆسەی پەروەردەدا دایکان و باوکان ئەندازیاری کەسێتی نەوەکانمانن

خێزان، کەیەکەی بنچینەیی کۆمەڵگەیە، بەکارگەیەکی بەرهەمهێنان و پەروەردەکردنی مرۆڤ دادەنرێ، ئۆرگانێکی کۆمەڵایەتی گرنگە بۆ پەراوەو ڕاهێنانی ژیانی ئایندەی نەوەکان.

کاری پەروەردەکردن لەگەڵ کاری بەخێوکردندا بە شێوەیەکی تەریب دەڕوات، بگرە گەلێك جار پەروەردەکردن دەکەوێتە پێش بەخێوکردنەوە، چونکە هێشتا مرۆڤ لە دایك نەبوەکە مشوری پەروەردەو چاودێری تەندروستی دەخورێت، واتە بەباشی چاودێری باری تەندروستی و دەروونی دایکە کە دەکرێت.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەوڵی مرۆڤەکان بەردەوامە بۆ پەراوە پێکردنی نەوەکان لەسەر ژیانی ئایندە و پێشهاتەکانی و چۆنیەتی ڕووبەڕووبونەوەی ئەگەر وشیمانەکانی ژیان و چارەسەرکردنی گرفت و لەمپەرەکان.

کاتێك دایك منالی دەبێت، وەك ئەوە وایە پارچەیەك لە لەش و گیانی لێکرابێتەوە، لەبەر ئەوە هێڵی پەیوەندی تێلباسی بەردەوام دەبێت، تەنانەت دایك لە کاتی خەوتنیشیدا دابڕاو وبێ ئاگا نیە لە کۆرپەکەی، هەتا منالەکە زیاتر ساوا بێت، پەیوەندیەکە پتەوترە.

بە پلەی یەکەم دایکان ئەو کەسانەن کە نزیکترین کەسن لە منال و جگەر گۆشەکانیانەوە، تەنانەت جۆری پێکهاتەی ئەو شیرەی کە ئەمڕۆ دایك [illegible] دەیدات بە کۆرپەکەی جیاوازە لەگەڵ جۆرەکەی هەفتەی ڕابوردو، هەروا [illegible] هەفتەی داهاتوو، کەواتە لە ڕووی فەسلەجیەوە کۆرپەی مرۆڤ بەردەوام لە گۆڕاندایە، گۆڕانی بەردەوامی لەش و ژینگە و جۆری خۆراك و چەشنی پەروەردەی خێزانی

ئەبێتە مایەی دروستکردنی گۆڕانی بەردەوام لە باری دەروونی منداڵەکەدا، ئەمەش لە لایەن خۆیەوە کارێکی گەورە دەکاتە سەر چۆنیەتی پێکهێنانی جۆری کەسێتی، زانایەك دەڵێت : پێم بڵێ چی دەخۆیت و چۆن بە منداڵی پەروەردەکراویت، پێت دەڵێم تۆ کێیت و چۆنیت.

دایك ئەو بوونەوەرە مرۆییە مەزنەیە کە سەرچاوەی مەعریفی و ڕەفتاریە بۆ نەوەکانمان، لە کاتێکدا کۆرپەی مرۆڤ لە دایك دەبێ یەکسەر دەکەوێتە ناو تۆڕێکی پەروەردەی کۆمەڵایەتیەوە، ئیتر هەتاکو تەمەنی (٥) ساڵ تەنها وەرگری ئەو کەرەسە خاوانەیە کە بۆ بونیادی دروستکردنی کەسێتی خۆی بەکاریان دەهێنێ، تەنانەت کۆمەڵێك لە زانایانی دەروونزانی لەو باوەڕەدان کە سنوری پەروەردەی کەسێتی منداڵ تاکو تەمەنی (٥) ساڵیە و لەو تەمەنە بە دواوە ئیتر دەستی لێ بەربدە و بیدەرە دەست ژینگە و دەوروبەر.

دیارە هەریەکە لە مرۆڤەکان سروشت و کەسێتی و تایبەتمەندێتی خۆی هەیە، لەم گەردوونەدا و لە یەك کاتدا نابێ دوو کەس هەبن کە بەتەواوەتی لە یەکتر بچن، هەر دەبێ (من) من بم وتۆش (تۆ) بیت. ئەگەر من وتۆ کوت و مت وەکو یەك وا بین کەواتە بێگومان لەمن و تۆ یەکێکمان زیادەین، گەردوونیش لەیەك کاتدا پێویستی بە دوو شتی لە یەکچوو نیە، کەواتە (دایك) خۆیشی خاوەنی کەسێتیەکی تایبەت بە خۆیەت، میزاج و هەڵچوون و سروشت و شێوازو هزرو بیرو بۆ چوونی خۆی هەیە، واتە پرۆگرامێکی تەواو سەربەخۆی هەیە بۆ تێڕوانین لە ژیان و پەروەردەکردنی منداڵەکانی، لە بنەڕەتیش دا هەموو دایکێك لە هەوڵی ئەوەدایە کە منداڵەکانی کوت و مت وەکو خۆی لێبکات، یان وەکو ئەو کەسەی کە بوەتە مایەی سەرسامی لەلای لە ڕوی کەسێتیەوە، ئەو کەسەی کە لەلای دایك کەسێتیەکی نایاب و پەسەندی هەیە بە زۆری بریتیە لە براکانی خۆی، لەبەر ئەوە زوربەی ئەو منداڵانەی کە هێزی پەروەردەی دایك زاڵە بەسەریاندا لە ڕەفتارو کرداردا دەچنەوە سەر خاڵەکانیان.

بێگومان هەمیشە شێوازی پەروەردەیی دایك زاڵترو کاریگەرترە لە شێوازی

پەروەردەیی باوك، هۆكاری ئەمەش زۆرە، لەوانەش.

١. دایك كەسێكی نەپچڕاوە لە منالەكەی و هەمیشە ئامادە بوونی هەیە، لە پرۆسەی پەروەردەی منالیش دا مەرجە دابڕان نەبێت لە نێوان پەروەردەكارو پەروەردەكراودا، واتە بەخشەرو وەرگر، بە تایبەتی لە قۆناغەكانی تەمەنی خوار (٥) ساڵەوە.
٢. لە ڕووی ئاوێتەی جەستەییەوە زۆرینەی پێكهاتەی منال لە لایەن دایكەوە دابین ئەكرێ، چونكە مرۆڤ لە سپێرمی باوك و هێلكۆكەی دایك دروست دەبێت، قەبارەی هێلكۆكەش زۆر زیاترە لە قەبارەی سپێرم.
٣. سەرچاوەی پێدانی خۆراكی منال دایكە، نەك باوك، هەر لەو ساتەوەكە منالەكە كۆرپەلەیەكەلە زامالی دایكدا، تا ئەو كاتەی كە قۆناغی لەشیر بڕینەوە دەست پێدەكات.
٤. پەیوەندی تێلباسی و دەروونی و ڕۆحی دایك بۆ منالەكەی زۆر پتەوترە لە پەیوەندی نێوان باوك و منالەكەی، تەنانەت هەندێ لە زانایان دەڵێن : هەموو دایكێك بۆ نێكی تایەتی خۆی هەیە، تەنها منالەكەی خۆی ئەو بۆنە دەناسێتەوە چێژی لێ دەبینێ، هەروەها زوربەی ئەو دایكوباوكانەی بەهۆی كێشەی نەگونجاندنیان لە یەكتری جیا دەبنەوە منالەكانیان دەچنە لای دایكیان، ئەمەش لە ڕووی یاسا و دادگایشەوە مافی منالەكەیە. ئەمانە و گەلێك بەلگەی تر هەیە كە دەیسەلمێنێ دایك زۆر نزیكە لە منالەكەیەوە، ئەم نزیكەیش وای كردوە كە گەورەترین كاریگەر بێت بۆسەر ئاراستەی بیركردنەوەی منالەكەی و ئەنجامدانی ڕەفتاری ڕۆژانەی و هەلگرتنەوەی ڕەوشتە پەروەردەییەكانی.

بەواتا سایكۆلۆژیەكەی دایك بەردی بناغەی بینای كەسێتی منالەكەی دادەنێت، هەر دایكە كە ئەتوانێت منال بەو شێوەیە پەروەردە بكات كە دەیەوێت، تەنانەت گەشەی زانست و زانیاری ئەم چاخ و سەردەمە لەو كاتەوە دەستی پێكرد كە دایكان بوون بە مامۆستا لە قوتابخانەكاندا، هەمیشە ئەو پەروەردەیەش

سەرکەووتو دەبێت کە ڕەگەزی مێ تیایدا زۆرینەیە.

لەم ڕووەوە دایك ئەندازیارە، ئەگەر چی خوێندەواریشی نەبێ، چونکە ئەو ڕێوشوێن نەخشەی ڕەفتاری منداڵەکانی دەکێشێ و هەنگا و شێوازەکان دیاری دەکات، هەموو منداڵێك قوتابی و شاگردی بەردەستی دایکیەتی، بەرلەوەی کەسانی تر بناسێت.

هەر ئەو کردارو ڕەفتارانەی کەمنداڵ لە دایکیەوە فێریان دەبێت لەگەڵ خۆیدا گەورەیان دەکات و بە شێوەو شێوازی جیاواز دوبارەیان دەکاتەوە، بۆ نمونە : ئەو دایکەی لە ساواییەوە منداڵەکەی بە (پشیلە) دەترسێنێ، کاتێك منداڵەکەی گەورەش بوو لە (پڵنگ) دەترسێ چونکە (پڵنگ) لە چاوی ئەودا گەورە کراوێکی (پیشلە) یە، یان ئەو کەسە کە گەورە بوو لەو پیاوانە دەترسێ کە سروشتی پشیلە و پڵنگ و دڕندەیان تێدایە.

سۆزو بەزەیی و میهرەبانی و نەرمونیانی دایك لە شێوازی پەروەردەکردنی لە لای منداڵ بە بەراود لەگەڵ شێوازی زبری باوك تەواو جیاوازن، ئەم جیاوازیەیشە دەبێتە پارسەنگی هاوسەنگ کردنەوەی دروستبوونی کەسێتی هاوسەنگی منداڵ، خۆ ئەگەر باوکیش هەمان شێوازی نەرم و پڕ لە سۆزی دایکی هەبێت، ئەوا کەسێتی منداڵەکە جۆرێکی تر دەردەچێت، پێویستە لێرەدا ئەوە ڕوون بکەینەوە کە مەبەست لە پەروەردەی زبر، توندو تیژی و سەرکوتکردن نیە، بەڵکو مەبەستمان چەمکی فەلسەفە پەروەردە گشتیە جەوهەریەکەیە، لە ڕوی شێوازی پراکتیکیانەی پەروەردە.

ئەو ڕۆڵەی کە باوك دەیبینێ لە پرۆسەی پەروەردە کردنی منداڵدا لە سنوری خێزاندا، زۆر جیاوازترە لە ڕۆڵی دایك : دەتوانین بڵێین ئەوەی بە باوك ناکرێت، دایك ئەتوانێ بیکات، لەبەر ئەوە هەمیشە شوێنەواری زامی بێ دایکی دیارترە بە منداڵانەوە وەك لە شوێنەواری زامی بێ باوکی.

بەکورتی هەریەکە لە دایك و باوك مەوداو سنوری کاری پەروەردەییان دیاریکراوە، هەریەکەیان لەلایەن خۆیانەوە خەریکی کاری خۆیەتی لە پێگەیاندن

و بەخێوکردنی منـاڵ و ئاراسـتەکردن و پـەروەردە و فێرکردنـدا، ئەمانـەش بـە واتایەکی تر هۆکارن بۆ دروستکردنی کەسێتی مناڵ.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هەریەکە لە دایك و باوك لە جێگەی خۆیانەوە ئەندازیارن لە دروستکردنی کەسێتی نەوەکانیانـدا، بـەڵام دەبێـت ئـەو ڕاستیەمان لـەبیر نەچـێت کـە ئەنـدازیاریش هەڵـە دەکـات، بـەڵام گـرنگ ئەوەیـە کـە ئەندازیارێکی ورد بێت، زوو هەست بە هەڵەی خۆی بکات و چارەسـەری بکات، چونکە بنیاتنانی کەسێتی مرۆڤ کارێکی زۆر هەستیارو پڕ لە وردەکاری یە، ئەمە وەکو دروسـتکردنی بینایـەك، یـان پردێـك نیـە، بەڕوخانـدن هەڵەکـە چارەسـەر بکرێـت، بـەڵکو بینـای کەسـێتی مـرۆڤ ناڕوخێـت، بگـرە زووربـەی جـار بـواری چاککردنەوەو چاکسازیشی نیە، مرۆڤ خاوەنی یەك کەسێتی خۆیەتی تا کۆتـایی تەمەنی، هەرگیز نـا بـێ مـرۆڤ لەیـەك کاتـدا خـاوەنی دوو جـۆرە کەسـێتی خۆی بێت، خۆ ئەگەر کەسێك لەیەك کاتدا دوو جۆرە کەسـێتی هـەبێت، ئـەوا لـە ڕووی زانستیەوە پێی دەگوترێت (شیزۆ فرینی) و لـەڕووی ئـاینی یـەوە گـەلێك جـار بـە (دوو ڕوو) ناو دەبرێت.

تا ئێستا لە کۆمەڵگەی کوردەواریـدا خێـزان هەڵـنەوە شاوەتەوەو پەیوەندیـە مرۆییـەکانی نـاو خێـزان تۆکمـە و گـەرم و گـوڕن، تـا ئێـستاش دایـك و بـاوك لێپرسـراوی یەکـەمی خێـزانن و هـەر ئـەوانیش ڕەنگرێـژی کەسـێتی ئاینـدەی مناڵەکانیانن، کەواتە تا ئێستاش ئەوان ئەندازیاری کەسێتی مناڵەکانمانن.

بێگومان ئەوەی لە مرۆژەدا پێویستمانە ئەوەیە کە دەبێت دایکان و باوکانمـان کەسـانێکی ڕۆشـنبیرو شـارەزا بـن لـە بـواری ئەنـدازەی پـەروەردەیی کەسـێتی نـەوەکانی گەلەکەمانـدا، یەکـەمین هـەنگاویش لـەو کاتـەوە دەسـت پێـدەکات کـە گەنجەکانمان چۆن پرۆسـەی پێکـەوەنانی ژیـانی هاوسـەری پێـك دەهێـنن؟ چۆن دووکەسی ڕەگەز جیاواز دەبنە بنەمای دروستکردنی خێزانێکی تۆکمـە و نـوێ کـە عەقڵیەتێکی پەروەردەیی و لۆژیکی کۆیانبکاتەوە...؟

ئەگـەر سـەردانێکی دادگاکـانی بـاری کەسـێتی بکـەیت بـۆت دەردەکـەوێت کـە

رێـژەی لێـك جیابوونـەوەی دوو هاوسـەرەکان لـە خێزانـە تازەکانـدا زۆرە، هۆکـاری ئـەوەش هـەمووی هەرناگەڕێتـەوە بـۆ بـاری ئـابوری بـەڵکو بەشـێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ کەمی ئاستی هۆشیاری کۆمەلایەتی و دەروونی و پەروەردەیی تاکە کەسەکانی کۆمەڵگەکەمان، ئەو هۆکارانەش کەم نین کە بوونەتە مایەی تێکدانی شێوازەی پەیوەندیـە کۆمەلایەتیـە کوردەواریـەکانمان و ئـەمڕۆ لـە خێزانەکانـدا سـەری هەڵداوە، ئـەوەی ئێـستا پێویـستە کـاری بـۆ بکـەین بەرزکردنـەوەی ئاسـتی هۆشـیاری پـەروەردەیی تاکـەکانی کۆمەڵگەیـە، بەتایبـەتیش دایکـان و باوکـان و گـەنجان، بـۆ ئـەوەی ئەنـدازیارێکی سـەرکەوتوبن لـە بونیادنـانی کەسـێتی منداڵەکانماندا کە بەرپرسی سبەینێی ئەم گەل و وڵاتەن

# دەسەڵاتی سیاسی کوردو ڕەوشی پەروەردە

پەروەردە، چـــەندین ڕەهەندی هەیە، ئەوەی ئێمە لە ئەمڕۆی هـەرێمی کوردســـتاندا زیــاتر مەبەســتمانە و دەبێـت کـاری بـۆ بکـەین، دوو ڕەهەنـــدە : ڕەهەنــدی زانــستی و ڕەهەنـــدی پراکتیکـی، یەکـەمیان پەیوەســـتە بـــە پـسپۆڕو بیرمەنـدانی بـواری پـەروەردە و ڕونـاکبیرو نووســـــەرە پەروەردەییـەکان، بـەڵام ڕەهەنـدی دووەمیـان پراکتیزەکردنـی پەروەردەیـە و زیـاتر دەسـەڵاتی سیاسـی و ئیدارەی باڵای هەرێم دەگرێتەوە، پێویـستە لێرەدا زۆر جەوهەریانـەدا بـە کـورتی هەردوو ڕەهەندەکە شی بکەینەوە : -

## یەکەم : ڕەهەندی زانستی پەروەردە :

ئەگەر لە چاخ و سەردەمە بەراییەکانی ژیـانی مرۆڤـدا، پـەروەردە تـەنها چەند نـەریتێکی لاسـاییکردنەوەی گـەورەکان بـوە لەلایـەن منـاڵان و گەنجانـەوە، بـەڵام لەگـەڵ تێپـەڕبوونی کـات چـەمکی پـەروەردەش هاوگەشـە لەگـەڵ گەشـەی کۆمەڵگـەدا بـەرەو پێـشەوە چـووە، بـۆ نمونـە (٤٧٠) سـاڵ پ. ز (کۆنفوشـیوس) ی چینی کە زانایەکی ڕۆحی و پەروەردە ناسی ئەو وڵاتە بووە، پەروەردەی پەیوەست کردوە بە ئایین و بت پەرستی ئەو سەردەمەوە، ئـەم پەیوەسـتکردنە مەبەسـت و واتـــای قـــووڵ دەگرێتـــە خـــۆی، چـــونکە نـــاوبراو ویـــستویەتی کـــاری پـــەروەردەو فێرکردن لە نەریتێکی باوی ناسەقامگیرەوە بکاتە (زانـستێکی پێویـست) بـۆ نمونـە دەڵێت : (سروشت ئەو خواوەندانەی بە ئێمـە بەخـشیوە، ڕێڕویشتنیـشمان بـەپێی مەرجەکانی سروشت، ڕێڕۆیشتنێکی دروستە و بەو جۆرەش لە سـەرمان پێویـستە، بـەڕێوەبردنی ئـەو ڕێگەیـەو ڕێکخـستنەکەی بریتیـە لـە مەبەسـتی پـەروەردە و فێرکـــردن)، ئـــەم ڕاڤەیـــەی کۆنموشـــیوس کـــاری بـــۆ کراوپـــەرەی پـــێ درا، تـــاکو پەروەردەی چینی گەیشتە ئاستی مەزنی و ناوبرایش وەك ڕەمزێکی پیرۆز سـەیر

دەگرا، بە ئاراستەیەکی تر (١١٥) ساڵ دوای کۆچی ناوبراو لەیۆنانیش (ئەفلاتون) بەرمویەو شێوازێکی دیکیەوە پەروەردەی لەبۆتەی فەلسەفەدا بوژاندەوە، کە زیاتر لایەنی پراکتیزەی پەروەردەی دەگرتەوە، پێی وابوو کە (پەروەردە خستنەسەری هەموو جوانی و تەواکاریەکانە بۆ سەرجەستەمان - بەژێریشەوە)، ئەم ئاراستەیەی پەروەردە بوو بەشێوەیەکی نوێی هەوڵو چالاکیە هزریەکانی مرۆڤ، بەتایبەتیش روناکبیرو بیرمەندەکان، بەدرێژبونەوەی مێژووی نوێ رەوتە پەرودەییەکەش گەشەی زیاتری بەخۆیەوە بینی کەسانی وەك (جۆن ملتۆن، پیاجێ، جان جاك رۆسۆ..... هتد) تونیان کە پەروەردە ئامادە بکەن تاکو وەك زانستێکی رەسەن و بنەڕەتی تەماشا بکرێت، قورسایی کارەکەش تاکو ئێرە بوو، چونکە هەر کاتێك مەرج و بنەماکانی زانست لە مەعریفەیەکدا هەبوو مانای وایە ئەو مەعریفەیە هەڵدەگرێت زانستێکی بنەڕەت و سەربەخۆ بێت.

بەکۆششی بەردەوامی زانایانی بواری پەروەردە و سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و بیرمەندو سیاسەتمەدارانی جیهان سەلمێنرا کە (پەروەردە) نەك هەر زانستە، بەڵکو زانستێکی زۆر دێرین و کاریگەرە بۆ سەر زانستەکانی تریش، لەو ساتەوە (پەروەردە) وەك زانست لە جیهاندا دانی پیانرا، ئیتر کرا بەمادەی خوێندن لە زانکۆ و پەیمانگەکاندا و تاکو ئێستاش لە پەرەسەندنێکی خێرادایە.

کرۆکی باسەکەمان لێرەوە دەست پێدەکات، کە ڕەهەندی یەکەمە، کاتێك سەرنج لە قەیرانی پەروەردەیی هەرێمی کوردستان دەدەین، بۆمان دەردەکەوێت کە زوربەی گرفت و کێشەکانی پەروەردە و هزری پەروەردەیی و سستمی پەروەردە و گرفتە ئیداری و مەنهەجی یەکان و نائارامی باری دەرونی قوتابیان و خوێندکاران دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنی پێویست لە (چەمکی پەروەردە) وەك زانستێك چونکە ئەوانەی کە بەرپرسن لە هزرو سستمی پەروەردەی هەرێم زوربەیان چانسی حیزبایەتی پۆستی بەرپرسیارێتی پێبەخشیون نەك ئاستی زانستی و ئەکادیمەت و بڕوانامەی باوەڕپێکراوی دروست، کاری پەروەردەش لە هەموو جیهاندا کاری پەروەردەناس و شارەزایانە، نەك کەسانی حیزبی ئەوتۆ کە

هیچ شارەزاییەکیان لەسەر پەروەردە نیە، هیچ گرفت و کێشە نیە ئەگەر زاناو شارەزایەکی بواری پەروەردە هەڵگری ئایدۆلۆژیایەکی تایبەتی یان پەیامێکی حیزبی بێت، ئەوەیان مافێکی سروشتی ئەو زانایەیە وەك مرۆڤێك، بەڵام کاتێك پەروەردە لە خزمەتی حیزبدا بەکاربێنێ یان کاروباری پەروەردە بئالۆزکێنێ و بڕیاردەر بێت بەبێ ئەوەی ئیشی ئەو بێت، ئەمەیان مەترسیدارە.

کاتێك کە دەزانین (پەروەردە) زانستە، کەواتە بنەماو چەمك و فەلسەفە و ئامانج و شێوازی کاری خۆی هەیە، هەموو کەسێك توانای نیە لەو بوارەدا کار بکات و ڕەخنە بگرێت، ڕاستە هەموو کەسێك ئازادە کە ڕەخنە بگرێ و بنوسێ و دەربڕێ، بەڵام مەرج نیە ئەو ڕەخنانە بابەتی بن و بەکەڵکی مەیدانی کاری پەروەردە بێت، بەڵکو کاری پەرەپێدانی پەروەردە ڕەخنەگرتن و چاکسازیە ئەوەش شارەزایانی بواری پەروەردە و بیرمەندان و ڕوناکبیرانە.

دیسانەوە لێرەوە کێشەی تر بۆ ئەو زاناو بیرمەندو ڕوناکبیرانە دروست بووە، چونکە سەنتەرێکی دیاریکراوی هەمیشە کراوە نیە لە وەزارەتی پەروەردە یان شوێنێکی تر کە کۆیان بکاتەوە و تیایدا بەوردی توێژینەوەی زانستی لەسەر پەروەردە بکەن و کێشەکان یەکلایی بکەنەوە، ناچار پەنا دەبەنە بەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان و مایکی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، ڕاستە بەم کارە نوسەرەکە تۆزێ بەتاڵ ئەبێتەوە لەو خەمانەی لە ناخیدا جینگڵیان داوە و کەڵەکە بون، بەڵام لە ڕووی سوودەوە هیچ سودێکیان نیە و زیاتر شڵەقاندنی گۆمەکەیە و دەرگا والآکردنە بۆ خەڵکی نەشارەزا کە بە ئارەزوی خۆیان شت لەسەر پەروەردەی بنوسن و بڵێن.

ڕاستە کۆنگرەی پەروەردەیی ئەنجامدرا، بەڵام ئەندامانی ئەوێش هەموویان هەر شیاوی ئەوێ نەبوون، دەکرێت ناوی شارەزایانی بواری پەروەردەی جیهانی و کۆمپانیاکانی پەروەردە و فێرکردن و پەرەپێدانی بکرێن بە لیستێك و لەگەڵ چەند شارەزایەکی خۆماڵی کۆبونەوەیەکی درێژ خایەن بکەن و ڕێوشوێنی دروست و بابەتیانە بۆ سستمی پەروەردەی هەرێم و دواتر هەڵمەتێکی ڕاپرسی

فراوانـی بـۆ بکـەن و دوای ئـەوە سـەر لـە نـوێ سـنوقی پێشنیارەکان لـە هـەموو شـارەکان دابنـرێ و بـەو شێوەیە لـە لایـەن زانایـانی پـەروەردە ناسـەوە گرفتـەکان چارەسەر بکرێن و ئەنجامەکان لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە پەخش بکرێن.

کەواتە لە بنەڕەتدا وەزیفە و ئەرکی چاکسازی جەوهەریانـەی پـەروەردە، ئـەرکی زانایـانی پـەروەردە ناسـەو حیـزب و حکومـەت لـە مەیانـدا هێـزی بڕیاردەرنین، بەڵکو هێزی پشتیوانن، ئەگەر چی مافی قسە و پێشنیارو پرۆژەیـان هەیـە، بـەلام بڕیـاری کۆتـایی بـۆ دەسـتەی زانایـان و پـەروەردە ناسـانە، پێویـستە ئەوەش بزانین کەلە هەرێمی کوردستاندا زاناو شارەزایانی بواری پـەروەردەمان لـە ژمارەی پەنجەکانی دەست تێپەڕناکات، واتە ئەوانەی کە بتوانن لە ئاستی جیهانیدا قسە لەسەر پەروەردە بکەن.

## دووەم : ڕەهەندی پراکتیزەکردنی پەروەردە :

دوای ئـەوەی (پـەروەردە) وەك زانـست و وەك پـرۆژەی فێرکردنـی وڵات یەکلایی دەکرێتەوە، هێڵە سەرەکی و وردە هەوداکانی بە تـەواوەتی لێکۆڵینـەوەیان لەسەر دەکـرێ، فەلـسەفەی پـەروەردە و ئامـانج و مەبەسـتەکان ڕون دەکرێنـەوە و خاڵبەنـد دەکـرێن، هـەموو لایەنـە تیۆرییـەکان بـە تـەواوەتی سـاخ دەکرێنـەوە، (پـەروەردە) دەکرێتـە پـرۆژەی یەکـەمی کابینـەی حکومـەت، ئـەم پرۆژەیـە بـە تـەواوەتی دەخرێتـە بەردەسـتی پارلـەمان و دوای تـاوتوێکردن بـە حکومـەت دەسپێردرێت بۆ جێ بەجێکردن.

لێـرەوە پراکتیزەکردنـی پـەروەردە دەسـت پێـدەکات، دیـارە سـەرجەم پێویستیە مادی و مەعنەویەکان کە بۆ (٥) ساڵی ئاینـدەی پـەروەردە پێویـستن لـە ڕاپـۆرتی کۆتـایی لیژنـەکانی پـەروەردە و زانایـانی پـەروەردەوە بەرزکراونەتـەوە، (لیژنـەی پـەروەردە)ش لـە پارلـەمانی وڵات و ڕاوێـژکارە شـارەزاکان گفتوگـۆی تێروتەسـەلی لەسـەر دەکـەن و ئـیتر پرۆژەکـە بـە حکومـەت دەسـپێرێت تـاکو

پراکتیزەی بکات لە ڕێی وەزارەتی پەروەردە و وەزارەتە پەیوەندیدارەکانەوە.

ئەمڕۆکە دەسەڵاتی سیاسی کورد ناوێتەکەیە لە نوێنەرانی حیزبەکان و شێوە دابەشکردنێکی دەسەڵاتە، سروشتی کاری پەروەردەش جۆرە پشێویەکی پێوە دەردەکەوێت، ئەگەر چارەسەر نەکرێت.

لە بنەڕەتدا پارلەمانی وڵات کە نوێنەرانی خەڵکن (ئەگەر چی ئەمەشیان لە هەرێم بەو شێوە پەتیە نیە) دەبێت (سیاسەتی پەروەردەیی) دابڕێژن و وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە :

١. ئەوەی ئەمڕۆمان چۆن پەروەردە بکەین؟

٢. بۆ ئەوەی سبەینێ چۆن کەسانێك بن لە ڕوی مرۆیی و نەتەوەیی و زانستی و ڕۆشنبیری و سیاسی و ژینگەیی و کۆمەڵایەتیەوە؟

٣. سروشتی تاکی کورد بۆ ئایندە دەبێت چۆن بێت؟

٤. بەکام بەرنامە و ستراتیژ دەتوانین ئامانجەکانمان بێنینەدی کە پێشترئامانج و مەبەستە پەروەردەییەکانمان دیاری کراوە؟

تا ئێستا ئێمە لەسەر کەلتوری پەروەردەیی ڕژێمی ڕوخاو دەژین، گۆڕانکاریەکانمان سەرکێڵانەن و جەوهەری نین، گۆڕانکاری جەوهەریانەش دەبێت بەپێی خواستی زۆرینەی توێژەکانی گەل بێت کە شیاو بێت لەگەڵ کەلتوری ڕەسەن و سازێنراو و هەڵقوڵاوی فەلسەفەی کۆمەڵایەتی نەتەوە بێت، ئەمەش کاری دەسەڵاتی سیاسی ئەمڕۆی کوردە، دەبێت دەسەڵاتی سیاسی کورد (پەروەردە) بەهەند وەربگرێت و زوربەی بودجەی وڵاتی بۆ تەرخان بکات، گۆڕانکاری لە گۆڕینی ژیری و هۆشیاری پەروەردەیی تاکی کۆمەڵگەوە دەست پێدەکات، هەر کاتێك عەقڵیەتی زوربەی تاکەکانی کۆمەڵگە عەقڵیەتێکی پەروەردەیی بێت، ئەوا ڕێژەی هەرە زۆری کێشەکانی تر لە جێی خۆیانەوە چارەسەر دەکرێن.

بەڕاشکاوی بڵێم هیچ گرفت و کێشەیەکی ئەم وڵاتە نیە کە سەرچاوەکەی نەگەڕێتەوە بۆ پەروەردە و سستمی پەروەردەی وڵات، بۆ نمونە : بڵاو بونەوەی پەتاو نەخۆشی دەگەڕێتەوە بۆ نەبونی هۆشیاری تەندروستی تاك، واتە نزمی

ئاستی هۆشیاری پەروەردەیی. هەروەها کۆچکردنی گەنجان بەرەو هەندەران، دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارە ئابوری و کۆمەڵایەتی و کەلتوریەکان، چونکە (پەروەردە) نەیتوانیوە (ئینتیمای نیشتمان) لە ناخیاندا بنێژێت و کەلتوری ڕاست بکاتەوە و پەروەردەی کۆمەڵایەتی نەوەکانی بکات و بەرپرسەکانیش نەخشەیەکی ورد بۆ پەروەردەی ئابوری و چارەسەری ئابوری بکەن، بەکورتی ئەگەر نەڵێم هەموو کێشەکانی وڵات لە پەروەردەوە چارەسەر دەکرێن، ئەوا بێگومان زوربەی هەرە زۆریان، دیارە مەبەستم لە پەروەردەیەکی تۆکمەیە کە حکومەت و پارلەمان بە ماڵی یەکەمی خۆیان و نەتەوەکەیانی بزانن.

سیاسەت ناتوانێ هەموو کێشەکانی وڵات چارەسەر بکات، چونکە هەموو جۆرە چارەسەرێك بۆ هەموو جۆرە کێشەیەك پێویستی بەوە هەیە کە (مرۆڤ) ڕەگەزی سەرەکی بێت لە هەنگاوەکانی چارەسەر کردندا، مرۆڤیش بە مرۆڤی تەواو و ڕەسەن و ئاسایی نەژمار ناکرێت تاکو بەشێوەیەکی دروست پەروەردە نەکرا بێت.

واتە مرۆڤی سروشتی و ئاسایی ئەو مرۆڤەیە کە بە پەروەردەیەکی نایاب و شیاو پێگەیەنراوە و ئامادەکراوە بۆ هەموو بارودۆخەکانی داهاتوو و ئەگەرە جۆراوجۆرەکانی ژیان، بەرەوشە ئابوری و سیاسی و ڕۆشنبیری و ئاشتیەکەیەوە تا دەگاتە بەرەوشە پڕ لە قەیران و ئاڵۆزی هەژاری و جەنگیەکەیەوە.

واتە مرۆڤی باش پەروەردە کراو لە هەموو بارودۆخەکاندا هاوسەنگ و ژیرو بە حیکمەتەو کەمترین هەڵە دەکات و کەمترین باج دەدات و کەمترین کات بەفیرۆ دەدات و زۆرترین بەرهەم پێشکەش دەکات.

# دیموکراسیەتی پەروەردەیی و بەڕێوەبردنی قوتابخانەکان

کاتێك دەمانەوێت وڵاتمان بگۆڕین و بەرەو پێشەوەی ببەین، دەبێت لە هەموو بوارو ئاستەکانەوە دەست پێبکەین، دیارە وڵاتێك کەلە سەر کەلاوەیەکی وێرانەی دوای چەند جەنگێك بە میراتی بەجێماوە بۆ نەوەکان، ژێرخانی ئابوری ڕوخاوە، هاوکات ژینگەیەکی تەندروست و کەسانی لەشساخ و دەروونتدروستی زۆر کەمە.

لەمەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کە دەبێت کاروئەرکی دەسەڵاتی سیاسی و جەماوەری (حکومەت و پارلەمان) بریتی بێت لە ئاوەدانکردنەوەی وڵات و بوژاندنەوەی دامودەزگاکان، بە دوای ئەوەشدا پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی و دەروونی و بوژاندنەوەی باری دارایی و دەرامەتی خەڵك، لە دوای ئەمانەوە هیچ شتێکی تر نیە کە لە (پەروەردە) لە پێشتر بێت، چونکە دوای ئەو کاوبارانە چالاکیە مرۆییەکان دەست پێدەکەنەوە، واتا ئەو چالاکیانەی کە تاکەکانی کۆمەڵ و ڕۆڵەکانی گەل وەك بونەوەرێکی مرۆیی ئەنجامیان دەدەن.

ئەنجامدانی هەموو کاروبارێکیش واتە پیادەکردن و پراکتیزەکردنی (ڕفتار)، ڕەفتاریش هەر کارێکی هزری و جەستەیی یە کە زیندەوەران بە ئاگامی دەگەیەنن، هەموو ڕەفتارێکی مرۆڤیش پاڵنەرەکەی بڕوایەکی هزریە، واتە ئەو کەسەی کە دەیەوێت کارێك بکات دەبێت لە ناخی خۆیدا باوەڕی بە ئەنجامدانی ئەو کارە هەبێت، ئەوسا دەتوانێت ئەو کارە بکات.

بڕوا بوون، یان دروستبوونی بڕوا لە ناخی مرۆڤدا کاری پەروەردەیە، پەروەردەش فەلسەفەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، کە لە بنەڕەتدا لە فەلسەفەی کۆمەلایەتی وڵاتەوە (فەلسەفەی گشتی) سەرچاوەی گرتوە.

بەکۆی (نەریت، خوو، ڕەوشت، ئایین، کەلتوری مادی و مەعنەوی، هزروبیر، بەرهەمە مادی و مەعنەویەکانی بیر، مێژوو، زمان و..... هتد) هەر

گەلێك، شتێك دێتە ئاراوە بۆ ئەو گەلە کە پێی دەگوترێت فەلسەفەی کۆمەڵایەتی، ( فەلسەفەی گشتی) ئەو گەل و وڵاتە، دواتر لەو فەلسەفە گشتییەوە فەلسەفەکانی تر دەردەهێنرێن، وەك فەلسەفەی شارستانێتی، فەلسەفەی ئابوری، فەلسەفەی پەروەردەیی و....... هتد.

کەواتە ناکرێت فەلسەفەیەکی گشتی گەل و نەتەوەیەك بەشێوەیەکی پەتی بگوازینەوە بۆ گەل و نەتەوەیەکی تر، کە لە ڕوی زمان و کەلتورو بنەماجیوگرافی و پیشەیی و سیاسی و مێژووییەوە جیاوازە، ئەم کارە لەهەر شوێنێکی جیهان و لەناو هەرگەل و نەتەوەیەکدا پەیڕەو بکرێت هەڵەیە، هەر ئەمەیشەکە بوە بە ڕەخنەیەکی زەق و بەرەنگاری عەولەمە دەبێتەوە، چونکە لە بۆتەی عەولەمەدا کەلتورو نەریت و زمانی زوربەی گەلانی جیهان دەتوێتەوە و کەمینەکان دەبنە زلهێزی بواری عەولەمە.

باسەکەمان دەربارەی دیمەکراسیەتی پەروەردەیە و نامانەوێ بچینە باسی لابەلاییەوە، بەڵام کاتێك (پەروەردە) بەشێکە لە دارێژەری سستمی فەلسەفەی کۆمەڵایەتی گشتی نەوەکانی ئایندەی گەل، ئەوا پێویستە جێکەوت و پێگەی ئەو پەروەردەیە لەناو جەرگەی گۆرانکاریە نوێیەکاندا دیاری بکەین. لە هەڵەمەتی ئاوەندانکردنەوەی هەرێمی کوردستاندا، ناچاری وایکردوە کە کارکردن بۆ بوژاندنەوەی پەروەردە و فێرکردن بەپلەی چوارەم بێت لە ڕیزبەندی کارەکانی دەسەڵاتی سیاسی ئەمڕۆی کوردستاندا و بەپلەی شەشەم بێت لە دیاریکردنی ڕێژە و بڕی بودجەی ساڵانەی وڵات دا، بەڵام لە ڕاستیدا شایستەی پلەی دووەمە، چونکە وێرانترین وەزارەتی میراتیانەی ڕژێمی بەعس بۆ ئێمەی کورد پەروەردەیە.

کێشەکەش هەر لە وەدانیە کە زمانی کوردی و فەرهەنگەکەی فەرامۆش کرابوو، بینای قوتابخانە نەبوو، بەڕێوەبەرەکان بەعسی بوون، سستمی پەروەردەیی سستمێکی پۆلسیانە بوو بۆ دروستکردنی عەقڵی سەربازی و هێرشبەری لە ناخی نەوەکاندا، بەڵکو کێشەکە لەوەدایە کە فەلسەفەی پەروەردەی

بەعس فەلسەفەیەکی بەعسیانە بوو، مرۆڤی ڕادەهێنا بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ یەك تاکە هزری یەك تاکە حیزبی دیکتاتۆردا، قوتابخانە و پەیمانگە و زانکۆکان ناوەندێك بوون بۆ سیاسەت , پێگەیاندنی سەربازی گوێڕایەڵ بەر لەوەی کە ناوەندێك بن بۆ پەروەردە و فێرکردن و زانست، قوتابخانەکان دەواجنێك بوون بۆ بەرهەمهێنانی جوجەڵەی بەعساوی و بە پرپۆڵەی سیاسەتی دیکتاتۆریانە گەورە دەکران و ئاوی گوێڕایەڵیەکی کوێرانە بە قورگیاندا دەکرا، تالە ئاکامدا دەرچوانی پەیمانگەو زانکۆکان دەکران بە بەعسی بەرلەوەی کە بکرێنە مرۆڤ ئەگەر چی ئەم سیاسەتە لە هەرێمی کوردستاندا بەهێندی ناوەڕاست و باشوری عێراق کاریگەر نەبوو، بە حوکمی هەبوونی تاسەیەکی نەتەوەیی و شۆڕشێکی پشتیوان و جیاوازی کەلتوری گەلی کورد لە گەلانی تری عێراقدا.

کەلتوری بەعس و فەلسەفە پەروەردەییەکەی تا ڕادەیەك لە کوردستانیش کاریگەری خۆی بەجێ هێشت، هیچ نەبێ فێری کورسی پەرستی و خۆ بەزلزانی و ڕاسەپاندنی کردین، چەند بەرەیەکی لە نەوەکانمان گۆش کرد لەسەر ئەوەی کە دەبێت هەمیشە لایەنگری یەك حیزب بین، (من دەمەوێ هەبم، کەواتە دەبێ تۆ نەبیت، یان وەك من بیت، بۆیە پێویستە گوێڕایەڵ و بەردەست و ئەڵقەلە گوێی من بیت) فێری کردین کە حیزب هەموو شتێکە : (نانە، ئاوە، هەوایە، دەسەڵاتە..... هتد)، ئەمانە و چەندین ڤایرۆسی پەتای کوشندەی لە مێشکو بیری زوربەماندا چاند، کە تاکو ئێستاش زوربەمان هەر بە و پێوەدانگە بیر لە دەکەینەوە و ڕەفتار ئەکەین، تەنانەت تا ئەمرۆش نەخۆمان دەزانین پەراوەی ژیانی دیموکراسی و پێکەوە ژیان بکەین و نەدەشتوانین منداڵ و نەوەکانی خۆمان فێر بکەین، بووین بە مرۆڤی دووفاق بەحیساب هەموومان گەل و نیشتمان و کەلتوری نەتەوەیی کوردانەی خۆمان خۆش دەوێ، کەچی تاکو تەرامان ئامادەی خزمەتکردنین، هەر کامێکمان دەممان بکەینەوە کۆڵێك نا ڕەزایی و قسەی سوك و سەلیم و بەردە ڕەخنە دەگرینە حکومەتەکەمان و پارلەمان و بەرپرسەکان، بەڵام زوربەشمان لە جێی خۆمان و لەناو بازنەی دەسەڵاتی خۆماندا گەندەڵ و فێڵباز و

بەرژەوەندخوازین بۆ خودی خۆمان، کەم کەسمان ڕاستگۆین لەگەڵ خێزان و کەس و کاروبگرە خودی خۆشماندا، تەنانەت تا ئێستاش کەسی وامان هەیە کە ئەگەر ڕاپەڕینێك دژی حکومەتەکەی خۆشمان بکەین ئامادەن فەرهود بکەن و فەرمانگە و دارو دیوارو شەقامەکان بسووتێنن، کە موڵك و ماڵی خودی خۆمانە (وەك میللەت و جەماوەر)

ڕاستە بارودۆخی ئابووری و ئەمنی تا ئێستا دامەزراونیە، گەندەڵی و حۆدزینەوە لە ئەرکەکان بوونی هەیە، بەڵام پێویستە ئێمە قووڵتر بەدوای دۆزینەوەی ڕەگوڕیشەی ئەو شتانەدا بچین، هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ جێماوەی عەقڵیەتی پەروەردەیی بەعس لە ناخی تاکەکانماندا، ئەو بەو فەلسەفەیە نەوەکانی سەردەمی دەسەڵاتی خۆی پەروەردە کردو ئێستا ئێمە و نەوەکانمان باجەکەی دەدەین.

لەگەڵ ئەو هەموو بارودۆخانەدا ڕاپەڕینی ۱۹۹۱ وەرچەرخانێکی گەورە بوو بۆ هەرێمی کوردستان، بوین بە خاوەنی ئیرادەو دەسەڵاتێکی ئیداری و سیاسی نیمچە سەربەخۆی خۆمان، گەلێك شتی نوێ و خزمەتگوزاری پێشکەش بەخەڵکی کران، بەڵام مەخابن زوربەی بەڕێوەبەروکار بەدەستانی بواری پەروەردە و فێرکردن لەو جۆرە کەسانەن کە بە پەروەردەی فەلسەفەی ئەو سەردەمە پەروەردە کراون و توانای بەڕێوەبردنی ئۆرگان و قوتابخانە و خوێندنگەی ئەم سەردەمەیان نیە، کە چی لەگەڵ ئەوەشدا دەرفەت بۆنەوە تازەکان دروست ناکەن و واز لە کورسیەکانیان ناهێنن، خزمایەتی و حیزبایەتی زۆربەی ئەوانەی بەو کورسیانە شاد کردوە، خۆشیان کە مێك ویژدانیان ناجوڵێت، بۆچی دەبێت لەم وڵاتەدا کورسی تا مردن بۆ ئەو کەسە بێت کە یەکەم جار پێی دراوە، بۆچی دەبێت واز لە عەقڵیەتی دیکتاتۆریانە مان نەهێنین؟ تاکو ئێستا کێ بیستویەتی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەڕێوەبەری قوتابخانەیەك وازی لە پۆستەکەی خۆی هێنا بێت بۆ یەکێك لە مامۆستاکانی قوتابخانەکەی؟ لە کام قوتابخانەیەدا بەڕێوەبەر بەپێی زۆرینەی دەنگەکانی مامۆستایانی قوتابخانەکەی دانراوە؟ ئەو فلتەرو

پێوەرە پەروەردەییە دیموکراسیە کامەیە کە کەسێکی پێ گراوە بە بەڕێوەبەر؟ تا ئێستا چەند جار بەڕێوەبەرێتی پەروەردەکان فۆڕمی ڕاپرسی بەناو مامۆستایاندا بڵاو کردۆتەوە دەربارەی وەرگرتنی بیروڕای ئازادانەی مامۆستایان لە بارەی بەڕێوەبەرەکانەوە؟ ئەدی خۆ پۆستی بەڕێوەبردنی قوتابخانە پۆستێکی ئیداری و پەروەردەییە، نەك پۆستێکی تر!

ڕاستە لە هەندێ قوتابخانە هیچ گرفت و کێشەیەکی ئەو تۆ لە نێوان بەڕێوەبەرو مامۆستایاندانیە، بەڵام ئەی پەروەردە وەرە زۆر بەوردی بەدوای ئەم بێدەنگیە ترسناکەی مامۆستایاندا بگەڕێ و بزانە تا چ ئاستێك دیموکراسیەتی پەروەردەیی لە ئیدارەی قوتابخانەکاندا ڕەنگی داوەتەوە؟ بۆچی بێدەنگی بوەتە سیمای مامۆستایان؟ ئایا کێشەیان نیە یان دەرفەت؟ ئایا هەستی پێ ناکەن یان نازانن سکاڵاکانیان بۆ کوێ بەرن؟ لەکام قوتابخانەدا سنوقی سکاڵای مامۆستایان دانراوە؟ یان نامەیەکی تێدایە بۆ جەنابی بەڕێوەبەر؟

چی ئەبێت ئەگەر لە جیاتی یەك بەڕێوەبەر ستافێك لە مامۆستایان بەڕێوەبەر بن؟ بەشێوەی خولی مانگانە؟ چی ئەبێ ئەگەر بەڕێوەبەر هەر ڕۆژە و یەکێك لە مامۆستاکانی خۆی بکاتە بەڕێوەبەر؟ تاکو ئەو مامۆستایە سڵ نەکاتەوە و فێری دیموکراسیەتی پەروەردەیی بێت؟ بۆچی توانرا بەڕێوەبردنی خوێندنگەیەکی کچان بە تەواوەتی بۆ ماوەی یەك ڕۆژ بدرێتە دەست دوو خوێنکاری خوێندنگەکە؟ بۆچی لە یەکێك لە قوتابخانەکانی قەراخی شار بە شێوەی ستافی مامۆستایان قوتابخانەکەیان بەڕێوە ئەبەن و بەڕێوەبەرە سەرەکیەش بەبێ پرس و ڕای مامۆستاکانی دەست ناکات بە ئاودا؟ کارەکەش زۆر سەرکەوتوە.

بۆچی لەوڵاتە پێشکەوتوەکاندا دایکوباوکی قوتابی بەخۆبەخش دەبنە بەڕێوەبەری قوتابخانەی گەڕەکەکەیان؟ کاتی ئەوە هاتوە بەڕێوەبەرەکان پێشنیار بکەن کە دانانی بەڕێوەبەرەکان لە ساڵی نوێدا بە هەڵبژاردن و دەنگدانی مامۆستایان بێ، جا ئەگەر سەرکەوتوو نەبوو دوای چەند مانگێك تازەی بکەنەوە،

خۆ کەعبەکە چ نابێ؟!

ئـەمرۆ لـە هـەموو شـتێك زیـاتر، پێویـستمان بـەوە هەیـە کـە خـودی مامۆستایان و بەڕێوەبـەری قوتابخانـەکان و یاریـدەدەرو مامۆسـتاکان و قوتابیـان و خوێندکاران و دایکان و باوکان فێری دیموکراسیەتی ژیان بکرێن، ئامـادەبکرێن بـۆ چـۆنیەتی پراکتیزەکردنـی دیموکراسـیەت، دەبـێ تـاکی کۆمەڵگـە و ئەنـدامانی خێـزان و کۆمەڵگە فێـری شـێوازی دیموکراسـیانە بکـرێن، منـداڵان و گـەورەکان و هەرزەکاران و گۆش بکەین لەسەر ئازادی ڕادەربڕینی دروست و چۆنیەتی گفتـارو ڕەفتاری هاوچەرخانە و نوێ و دیموکراسیانە، دەبێ پەروەردەکاران و کاربەدەستان خۆیان ببنە سەر مەشق و پێشەنگی پەیڕەوکردنی دیموکراسی هاوچەرخ لە نـاخی خـودی خۆیـان و خێـزان و کۆمەڵگـەدا، دیموکراسـیەت (کـار) ە نـەك (کاردانـەوە)، (ڕەفتـــار) ە، نـــەك دروشـــم و قـــسەی ڕازاوە، (کۆشـــش) ە، نـــەك داخـــوازی و فرمانـدەرکردن (پراکتیزەکـردن) ە، نـەك قـسەکردن (واقـع) ە، نـەك ئەندێـشە و خەیاڵ (شۆڕش) ە، نەك پاڵدانەوە و ڕەخنەگرتنی بێ سەروبەرە، بـەم پێیـە بـۆ ئەوەی ژیانێکی دیموکراسیانە دەستەبەر بکەین دەبێ کاروڕەفتارمـان مەیـدانی بـێ بۆ خستنەگەڕی کۆششەکانمان و جێبـەجێ کردنـی کرداریانـەی واقعیانـەو بـەرپا کردنـی شۆڕشـێکی گۆڕانکاریانـەی مـەزن، هـەموو ئەمانـەش مـرۆڤ لـە ئـەنجامی فێربوون و ڕاهێنانەوە فێریان دەبێت، واتە لە (پەروەردە) ە وە، کلیلی پـەروەردەی ڕەسـەنی نەوەکانمانیـشمان لـەم سـەردەمەدا بەدەسـتی مامۆسـتایانەوەیە لـە چوار چێوەی پۆل و قوتابخانەکانیدا.

# نووسەرو وەرگێڕانی کورد بەرپرسیارن لە ئاستی بەشێك لە قەیرانی پەروەردەی هەرێمی کوردستان

پەروەردە ئەو سستمە سەرتاسەریە گرنگەیە کە هەریەکە لە تاکەکانی کۆمەڵگە لە جێگەی خۆیەوە بەجۆرێك لە جۆرەکان پێویستی پێی دەبێت، بە واتایەکی تر هیچ هاوڵاتیەك نیە کە نەکەوێتە ژێر کاریگەری پەروەردەوە، هەڵبەت لێرەدا مەبەستمان لەوکایە ڕەفتاریە کۆمەڵایەتیانەیە کە تاکەکانی کۆمەڵگە بە شێوەیەکی کرداری پەیڕەوی دەکەن، ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە کە هەموو ڕەفتارو هەڵوێست و گوتارێکی مرۆڤ بەرەنجام و ڕەنگدانەوەی ئەو جۆرە پەروەردەیەیە کە پێشتر لەسەری ڕاهێنراوە و بەپێی پرەنسیپەکانی ئەو فەلسەفە پەروەردەیە گۆش کراوە.

هەریەکە لە تاکەکانی کۆمەڵگە لە جێگەی خۆیانەوە وەکو کارەکتەر ڕۆژانە ئەو هەنگاوانە جێ بەجێدەکەن کە پێشتر لە ڕووی هزری و پەروەردەییەوە لە قاڵبێکی تیۆریدا وەریانگرتوە لە ڕێگەیەك لە ڕێگە زۆرەکانی پەروەردەوە، جایان لە ڕێگەی گواستنەوەی کولتوری کۆمەڵگەوەیە، یان لە ڕێگەی پەروەردەی خێزانیەوە یە، یاخود زادەی هزری خودی خۆیەتی وەك پێویستی و پاڵنەرێکی بەگوڕ لە پاراستنی خودی خۆی و گەشە بە خۆداندا.

بەکورتی ئەگەر پەروەردە سەربانگەیەك بێت ئەوا هەریەکەمان لە جێگەی خۆمانەوە سەربازێکین تیایدا، ئەو سەرباز بوونەشمان تەوزیمی و تۆبزیەو بە دەست خۆمانەوە نیە، چونکە لایەنی کەم هەریەکەمان دایکێکمان هەبووە کە لە ئەو کەوتوینەتەوە، بەخێوکارێکیشمان بووەکە بەخێوی کردوین و ئاراستەی کردوین، کەواتە خاوەنێکی پەروەردەییمان هەبووە، ئەگەر چی دەکرێت لە دوای تەمەنی هەژدەساڵیمانەوە خۆمان خاوەنی یاسایی خۆمان بین.

لە بنەڕەتدا قەیرانی پەروەردەیی لێرەوە دەست پێدەکات چونکە بەخێوکار بەشێوەیەکی ئوتۆماتیکی دەبێتە خاوەنی پەروەردەیی بۆ ئەو کەسانەی

که بەخێویان دەکات، جا ئایا ئەو بەخێوکارە خۆی کەسێکی پەروەردەیی یە؟ لە کام ئاستدایە؟ ئایا بەڕاستی خەمخۆری ئەو منداڵانەیەکە بەخێویان دەکات؟ ئایا بۆ خۆی زانیاری و شارەزایی تەواوی هەیە لە بواری پەروەردە کردنی نەوەکاندا؟ یان بەخێوکردن و پەروەردەکردن هەر لە کۆنەوە لێبکەستراون و بەناچاری کراونەتە یەك کارو یەك ئەرك؟ ئەوەش بەشێوەیەکی میراتی و کولتوری پشتاوپشت لە باوباپیرانمانەوە بۆ مانگواستراوەتەوە؟

لە ناخی هەموو پەروەردەیەکدا جەوهەرێکی ڕەسەن هەیە، کە ئەو جەوهەرەش بەستراوە بە فەلسەفەیەکی بنەڕەتیەوە، ئەم فەلسەفەیە بە فەلسەفەی پەروەردەکە ناسراوە کە سەرچاوەکەی فەلسەفەی گشتی کۆمەڵگەیە، فەلسەفەی گشتی کۆمەڵگەش بە بەرگێك داپۆشراوە پێی دەگوترێت ژیار یان شارستانێتی. گەشەی فەلسەفەی کۆمەڵایەتی گوشار دەخاتە سەر ژیارو فراوانی دەکات، بەم فراوانکردنە دەگوترێت (گەشەی شارستانێتی) هیچ کاتێکیش گەشەی شارستانێتی ناوەستێ.

ئەمڕۆش ئێمە لە هەرێمی کوردستان، وەك بەشێك لە گەلی کورد لە سەرەتایەکی چارەنووس سازی گەشەی شارستانێتیماندایین، بە دەیان گرفت و کێشە و قەیرانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئابوریمان ڕووبەڕوو دەبێتەوە، ئەمانەش هەندێکیان ئاسایین و لە ڕەوتی سروشتی گەشەی شارستانێتی دا نامۆ نین . بەڵام هەندێکیان بەرەنجامی کەمتەر خەمی خۆمانن و هەموو پێکهاتە مرۆییەکانی گەلەکەمان لە جەماوەرەوە دەگرێتەوە تا بەرپرسەکانی دەسەڵاتی سیاسی و ئیداری هەرێمەکەمان، بەشێك لە کەمتەرخەمیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی هۆشیاری پێویست لە تاکەکانی کۆمەڵگەدا، بە ڕادەیەك کە ئەو تاکەی کۆمەڵگە نازانێت ئەرکو مافەکانی چین؟ دەبێت هەڵوێستی چۆن بێت بەرانبەر بەگەل و وڵات و کولتوری ڕۆشنبیری میللەتەکەی؟ لەم بارەشدا تاکی کۆمەڵگە نازانیت چۆن بیر بکاتەوە، بیر لە چی بکاتەوە؟ چۆن ڕەفتار بکات؟ چی بڵێت و چی بکات؟ واتە چەواشەو سەرگەردان دەبێت لە ڕووی چۆنیەتی ڕەفتار

گەرایی مرۆییەوە.

بێگومان (پەروەردە) ش بەرپرسی یەکەمە لە چۆنیەتی چاکسازی ڕەفتار گەرایی تاکی کۆمەڵگە و ئاراستەکردنی و پەروەردەکردن و فێرکردن و ڕاهێنان و پەراوە پێکردنی لە بوارە جۆراو جۆرەکانی ژیان و هەڵکردنی لەگەڵ ژینگە هەمە چەشنەکانی دەوروبەریدا.

پەروەردە و هزری پەروەردەییش سامانێکی گشتی مرۆڤایەتین و بە تەنها موڵکی هیچ وڵات و میللەت و حیزب و دام دەزگایەك نین، لەبەر ئەوە دەرگا والایە لە بەردەم کارلێکردنی هزرە جۆراوجۆرەکانی پەروەردەدا لەناو هەموو گەلانی جیهاندا، کە ئاکامەکەی بریتیە لە پێکهێنانی فۆرمێکی یەکانگیری شارستانێتی مرۆیی، بەبێ لێکدانەوەی ڕەنگ و ڕەگەزو زمان و نەتەوەو ئاراستەی سیاسی و ئایدۆلۆژی و جیوگرافی و..... هتد

دوای ئەو هەموو گۆرانکاریانەی بەسەر باروودۆخی هەرێمی کوردستاندا هاتن، جۆرایەتی بیرکردنەوەی تاکەکانی کوردیش گۆرانیان بەسەردا هات، بێگومان بیرکردنەوەی لاوێکی ئەمڕۆی کورد زۆر جیاوازە لە بیرکردنەوەی لاوێکی کوردی ساڵی حەفتاکان، کەواتە ڕەفتارەکانیشیان زۆر جیاوازن، بە واتایەکی تر جیاوازی جۆری پەروەردە و گۆرانی ئاستی ڕۆشنبیری گشتی خەڵکی یەکەم هۆکار بووە بۆ گۆرانی ڕەفتاری کەسەکانیش.

ئێمە ئەمڕۆ بە پێوانە لەسەر چەند دیاردەو دەرکەوتەیەك هەست بەوە دەکەین کە پەروەردەکەمان تووشی قەیران هاتوەو پێویستە هەمووومان لە خەمی چارەسەرکردنیدا بین، یەکێك لەو دیارانەش بەدیکردنی ڕەفتاری سەلبی یە لە زوربەی لاوان و هەرزەکارانماندا، کە دەرهاتە و گۆشکراوی پەروەردەی ڕابوردوون، جا بۆ ئەوەی نەوەی داهاتووش وەکو ئەمانە نەبنەوە، دەبێت چاکسازی لەو سستمی پەروەردەیەدا بکەین کە ئەمڕۆ کاری پێدەکرێ و سبەینێ نەوەی تازەی لەسەر پێدەگات، سستمی پەروەردەش مەبەست تەنها لەو پرۆگرامانەی خوێندن نیە کە وەزارەتی پەروەردەو خوێندنی باڵا پیادەی دەکات، بەڵکو هەموو کارێکی

هونــەری و ڕۆشــنبیری و هــزری دەروازەیــەکی پــەروەردەیین و کاروبارەکانیــان دەڕژێنە سنوری بەرژەوەندیەکانی پەروەردەوە.

لێرەوە ئەرکی بەرپرسانەی توێژی ڕوناکبیران دەست پێدەکات بە تایبەتی نووسەرو وەرگێڕەکانمان، چونکە وەرگێڕەکان وەزیـری دەرەوەی حکومـەتی هـزرو بیرن، دەتوانن باشترین کتێب و سەرچاوەی پەروەردەیی جیهانی دەستنیشان بکەن و بیخەنەسەر زمانی کوردی هەقە وەرگێڕەکانمان بەوردی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو حاڵەتە بکەن کە تاکی کورد لە ئێستا دا تیایدا دەژی، ئایا تاکی کوردی ئەمڕۆ چی پێویستە؟ کام بابەت یەکەمە؟ کام بابەت پێویستە بۆ نـەوەکانمان و بـۆ زۆرینـەی جـەماوەری گەلەکـەمان؟ چ کتێـب و سەرچـاوەیەك مرۆڤـی کـورد هـان دەدات بـۆ ئەوەی کەسێکی ئیجابی بێت و لە بیری بونیاتنان و ئاوەدانکردنـەوە دا بێـت، نـەك پڕ فرۆشی بکەنە پێوەری وەرگێڕان، دەبێـت وەرگێـڕان لـە دەزگاکـانی ڕاگەیاندنـدا ڕێك بخرێ.

پێکهاتەکانی کۆمەڵگەکەمان ئـەمڕۆ پێویـستیەکی زۆریـان بـەوە هەیـە کـە ئاراستە بکرێن، ڕێنومایی بکـرێن، شـارەزا بکـرێن دەربـارەی تێگەیـشتن لـە ژیـان و چۆنیەتی پەروەردەکردن و چاودێری کردنی منداڵەکان لـە ڕوی هـزری و زانـستی و تەندروستیەوە، پێویـستە فێـری دیموکراسیەت و پاراستنی مـافی مـرۆڤ و ئـازادی ڕادەربـڕین بکـرێن، نابـێ ئەمانـەش تـەنها دروشمـی سیمینار و کۆبونـەوەکان بـن، بەڵکو دەبێت سەدان کتێب و سەرچاوە و ناميلکەی هەمـە جـۆر لـەو بارانـەوە بـە زمانی کوردی لەبەر دەستی خەڵکیدا بێت، دەبێت تاکی کورد سـوود لـە ئـەزموونی شارستانێتی و کولتورو ڕۆشنبیری و شۆڕشی گەلان وەربگرێ، کەواتـە دەبێـت تـاکی کورد ئاشنا بکرێ بە نەریت و یاساو کولتورو شارستانێتی ئـەو گەلانـە، لـە ڕێگـەی وەرگێڕانی دەیان کتێبەوە کـە باسـی گـەلان و ئەزمونـەکانیان دەکـەن و دەزگاکـانی میدیاش هاوکاریەکی باش بن.

هاوکات تاکی کورد زۆر کەم شارەزایی هەیە دەربارەی یاسا ناسی و ئـابوری و مومارەسەی حیزبایەتی و ژیانی دیموکراسیانە، تەنانـەت تـا ئێـستاش وابەسـتەی

عەقڵیەتی سەرۆك هۆزو تیرەگەرایین و شەیدای كوتلەین، هێڵی بەرژەوەندیە گشتی و تایبەتیەكان جیا ناكەینەوە، پلەداری لە ئەركوماف و كارەكانماندا بەدی ناكرێ، بەڕای من زوربەی ئەم حاڵەتانە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئاستێكی پێویستی ڕۆشنبیری هاوچەرخ لە تاكی كورددا، بەرپرسیاری یەكەمیش وەرگێرو نوسەرەكانمانن، كە ئەوەندەی سەرقاڵی سیاسەتن، ئەوەندە گوێ نادەنەداڕشتنی پلانێكی ڕۆشنبیركردنی پراكتیكیانەی كۆمەڵگە و پرەنسیبەكانی گەشە پێدانی پەروەردەیی.

دەبێ نوسەرو وەرگێڕەكان، بیرمەندو دانایان، ڕوناكبیرو هونەرمەندان، تێكڕا لە هەوڵی یەكانگیرو كاری هەرەوەزیانەی بەردەوام دابن بۆ پێشكەشكردنی نمونەی باش لە بەرهەمی بیستراو، بینراو، نوسراو، هەموو دام و دەزگا و شێوازو ڕێگە پەسەندەكان بگرنە بەر بۆ ئەوەی باشترین ڕێنمایی و بەرچاو ڕوونی پێشكەش بە نەوەی نوێ بكەن، بۆ نمونە : نابێت هونەر (مۆسیقا، نواندن، وێنە) تەنها لە پێناوی خزمەتێكی هونەریانەی پەتی دا بێت، بەڵكو دەبێ هونەر لە پێناوی هونەر دابێ و دواتریش ئەو هونەرە لە پێناوی پەروەردەیەكی دروستی نەوەكاندا بێت، بە هەمان شێوە بۆ پیشە و زانست و سەرجەم لایەنەكانی تری ژیان.

دەبێ كەناڵەكانی ڕاگەیاندن و چاوی كامێراكان و مایكی ڕادیۆكان و تەختەی شانۆگەریەكان و قەڵەمی نوسەرو وەرگێڕەكان و زمانی وتاربێژەكان و وتاری سیاسیەكان و چالاكی ڕۆشنبیرەكان هەموویان یەك مەبەستیان هەبێت، ئەویش خەباتكردنی بەردەوام و هەرەوەرزیانەی نێوانیان بۆ پەروەردەكردنێكی ڕاست و دروستی نەوەی نوێ و هاندانیان بۆ چێژ وەرگرتن لە تامی ژیان و ئاسودەیی و ئاسایشی تاك و كۆمەڵ و هێنانەدی مافی مرۆڤەكان و گەیشتن بە ژیانێكی بەختەوەرو دیموكراسیانە و چارەسەركردنی قەیرانە جۆراوجۆرەكان، كە زوربەی چارەسەرەكان لە ڕێگەی (پەروەردە) ە وە دەكرێت، چونكە لە بنەڕەتیشدا بە هۆی كەمتەرخەمی لە (پەروەردە) دا ڕوویانداوە.

# پشوی هاوین و پەروەردەی نەوەکانمان

لە وڵاتی ئێمەدا، تاکو ئێستاش ئۆرگان و دەزگاکانی پەروەردە و فێرکردن تەنها ئەوانەن کە لە شێوەی باخچەی ساوایان و قوتابخانەو خوێندنگەکاندان، کە سەر بە وەزارەتی پەروەردە و وەزارەتەکانی ترن، کەواتە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفەو هۆشیاری پەروەردەیی و فێرکردن و ڕاهێنان و ئاراستە کردن تەنها قوتابخانەکانن، قوتابخانەکانیش بەستراونەتەوە بە سستم و دەسەڵاتی مەڵبەندی وەزارەتی پەروەردە، زوربەی کاروبارو شێوازی بەڕێوەبردن و پرۆگرامەکانی خوێندن تا ئێستاش جێماوەو شوێنەواری پەروەردەی ڕژێمی پێشوویان پێوە دیارەو کاریگەرییان هەرماوە، ئەو کاریگەریەش ئەگەر لەسەر قوتابیان و خوێندکاران کەم بێت، ئەوا لەسەر مامۆستایان زۆرە، چونکە خودی مامۆستایان بەرهەمی ئەو سستمە کۆنەن و بە ئاسانی ناتوانن دەستبەرداری بن، هۆکاری ئەوەش زۆرن.

کەواتە مامۆستایان کە کەسی یەکەمی ناو پرۆسە و سستمی پەروەردەیی وڵاتن، زوربەیان خۆیان پەروەردە کراوێکی هاوچەرخانەنین، هاوکات پرۆگرامە نوێیەکەش هێشتا نەکەوتوەتە سەر پێی خۆی، بینای قوتابخانەکان خەسڵەتی قوتابخانەی مۆدێرنیان نیە، لە ڕاستیش دا سێ ڕەگەز، بە ڕەگەزی سەرەکی پەروەردە و فێرکردنی فەرمی دادەنرێن (پرۆگرام، مامۆستا، قوتابی)، دیارە قوتابیانیش منداڵ و نەوەی ئەم کۆمەڵگەیەن کە لە هەموو ڕوکارەکانەوە لاوازە (ئابوری، کۆمەڵایەتی، کولتوری.... هتد)، کەواتە هیچ کام لە ڕەگەزەکانی پەروەردە دروست و سروشتی نین، بە واتایەکی تر بەرەنجامەکەیشی پەروەردەیەکی نا تەواو و منداڵێکی شکست و نا دروستە، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ڕۆژانە لە هەموو ماڵە نا ئاساییەکانمانەوە منداڵێکی نا ئاسایی بەناو کۆمەڵگە و ڕێگەو بانێکی نا ئاساییدا بەجانتایەك کتێبی زل و گران و

ناناسایییەوە بەرەو قوتابخانەیەکی نا ئاسایی دەڕوات بۆ ئەوەی تێکەڵەیەك لە مامۆستایانی نائاسایی و ئاسایی بە شێوازێکی نائاسایی وانەی نا ئاسایی بەمناڵەکانمان بڵێن، چاوەڕوانی چی بکەین لەم ئەوەیەمان لە کاتێکدا خۆمان وەك پێویست و وەکو دایکو باوك هیچ ڕۆشنبیری و زانیاریەکی ئەو تۆمان نیە دەربارەی پەروەردەی خێزانی..؟

ئێمە مناڵێکی ئامادە نەکراوی ترسێنراوی تێر نەکراو لە یاری و چێژی ژیانی مناڵێتی بە قوتابخانەی گەڕۆکو گوند دەسپێنرێن و ئیتر گوێی پێ نادەین، وەك ئەوەی مناڵەکەمان سپارد بێت بە مەڵبەندێکی نەهێشتنی نەخوێندەواری...!
واش چاوەڕوان دەکەین کە مامۆستای داماو بۆمان بکاتە ئەو کەسەی کە خۆمان دەمانەوێ نەك ئەوەی کە خودی مناڵەکەی خۆی دەیەوێ.

دەبێت مامۆستا جگە لە کاری فێرکردن دەوری دایکو باوك و مامۆستاو چاودێرو ئاراستەکارو پزیشك و توێژەری دەرونی و کۆمەڵایەتی ببینێت، ئەوسا کۆنترۆڵی مناڵەکەی ئێمەی پێ دەکرێت ئەمەش نەك بە تەنها بۆ مناڵەکەی ئێمە بەڵکو بۆ سەدان مناڵی هاوشێوەی مناڵەکەمان، لە کاتێکدا ئێمە خۆمان لەناو ماڵی خۆماندا تەحەمولی یەك مناڵی خۆمان ناکەین!

تەحەمول نەکردنی ئێمەی دایکوباوك دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك لەوانەش (کەمی ئاستی ڕۆشنبیریمان، نەزانینی هونەری خێزانداری و گرتنە ئەستۆی بەرپرسیارێتی، کەمدەرامەتی و هەژاری، لانەبردنی عەقڵیەتی خێڵەکی و کەلتوریانەی نەشیاو.... هتد).

بەکورتی کۆمەڵگە و خێزان و قوتابخانە، نەبەتەنها و نە پێکەوە نەیانتوانیوە ببنە ژینگەیەکی پەروەردەیی دروست بۆ نەوەکانمان، بەڵکو تاکو ئێستاش مناڵەکانمان بەشێوەیەکی هەڕەمەکی لە دایك ئەبن، فێرۆ ئەبن، گۆش و پەروەردە ئەکرێن، کەلتورو نەریت و میزاجی خەڵکی بۆمان لە قاڵب دەدەن.

لە وڵاتی ئێمەدا منداڵ دەکەوێتە ناو تۆڕێکی خواستەمرێن و توانا کوژەوە، شێوازێکی پەروەردەیی ستاندارو یەکانگیرنیە بۆ نەوەکانمان، خێزان بە جۆرێك

پەروەردەی دەکات، کۆڵان بەجۆرێکی تر، قوتابخانەش بەجۆرێکی تر، جگە لەوەی کە دیسان شێوازی خێزانێك و خێزانێکی تریش جیاوازە، سستمی پەروەردەیی کۆڵانێك و کۆڵانەکەی تریش جیاوازە، بگرە لەناو هەمان خێزاندا شێوازی پەروەردەکردن لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر جیاوازە. تاکەکانی ناو خێزان بەپێی تەمەن و میزاج و سروشت شێوازی پەروەردەکردنیان جیاوازە، لەناو ئەم سەرگەردانی و جەنجاڵیەدا منالّ ڕوو لە کوێ بکات؟ کێ خاوەنیەتی؟ کێ ئاراستەی دەکاتن؟

نامەوێت زۆر لە تەوەری سەرەکی باسەکە لابدەین، بەو پێیە منالّ نا هەقی نیە کە وەك بەندیخانە سەیری قوتابخانە بکات، چونکە هیچ کام لە خواستەکانی خۆی تێدا نابینێ، مەگەر تەنها ئەو تۆزە گەمەو یاریەی کە لە پشوەکورتەکاندا لەگەڵ هاوتەمەنەکانیدا ئەنجامی ئەدات، ئەمەشیان گەلێك جار کارەساتی خوێناوی و دەستو پێ شکانی لێ دەکەوێتەوە لە نێو منالاّندا، چونکە منالاّنمان تەنانەت فێری شێوازی یاریکردنیش نەکراون، بەلاّم مەرج نیە هەموو قوتابخانەکان بەو جۆرە بن.

منالّ کە دەچێت بۆ قوتابخانە لە ترسی دایکوباوکێتی و وەك سزا دانێك سەیری دەکات و بەدوای تۆڵە سەندنەوە دا دەگەرێ لە دایکوباوکی، منالّەکە ئەو شتانە دەکات کە دژی دایکو باوك و خێزانەکەیەتی وەك ( یاخی بوون، بیانووگرتن، خۆ دەرنەچاندن و..... هتد)، هەر بۆیە کاتێك منالّەکە دەگاتە تەمەنی هەرزەکاری، خێزان ناتوانێت بە تەواوەتی زالّ بێت بەسەریدا ئیتر واز لە قوتابخانە دەهێنێ، ئەگەر سەرنجی بازاڕ بدەین زوربەی شاگردەکان ئەو منالاّنەن کە لە قۆناغی هەرزەکاریدا لە قوتابخانە ڕایانکردوە.

ئەم بارودۆخانە بەو جۆرەن، زوربەی مندالاّن هەست بە ئامێزێکی گەرم و ئەوایەکی حەوانەوە ناکەن، هەموو کەسێك لە لایەن خۆیەوە سەرکوتیان دەکەن، بەبێ ئەوەی ئەو سەرکوتکارانە شارەزای بواری پەروەردەو ئاراستە کردن بن.

ئەوانەی سەرەوە حاڵی ژیانی کەمێك لە ڕۆژێکی خوێندنی زستانەی منداڵەکانمان بوو، خۆ ئەگەر بکەوینە سەر باسی ژیانی هاوینەی منداڵەکانمان ئەوا دنیایەك گرفت و کێشە و کڵۆڵییان هەیە.

ئێستا منداڵان ڕۆژان دەژمێرن، بەو نیازەی کە زوو خوێندن تەواو بێ و پشووی هاوینە دەست پێبکات، ئەو پشووەی کە کۆڵێك ئازار و ناخۆشی یە بۆ ژیانی منداڵە هەژارەکان، بەڵام هێشتا بەلایانەوە خۆشە، چونکە هیچ نەبێ ئەرکو ئازاری مەکتەبیان لە کۆڵ دەبێتەوە، ڕاستە منداڵی هەژاران ناتوانن بچنە پارکەکانی یاری و گەشت و سەیران، ناتوانن بچنە خولە هاوینەکانی ڕێکخراوەکانەوە، ناتوانن بچنە کتێبخانەی منداڵان، ناتوانن خەڵات و پارە پولێك ببەنەوە، تەنها دوو ڕێگەیان لەبەرەدایە :

١. لە ماڵەوە دابنیشن بۆ هاروهاجی و هەراسانکردنی دایکو باوك و خوشك و براکانیان، سەرقاڵی یاریەکانی کۆڵان بن و هەر ڕۆژەی شەڕێکی نوێ لەگەڵ دراوسێکاندا دروست بکەن، تاکو کارەبا دێتەوە، هەرکە کارەبا هاتەوە ئیتر دەبن بەبت بە دیار پلەیستەیشن و یاری ئەلکترۆنی و شاشەی کەناڵەکانەوە، تا گێژو وڕ دەبن و چاویان ماندوو دەبێ، ئیتر خەو دەیانمرێنێ تا سبەینێ بەیانی، ئیتر سبەینێ هەمان قاوەن لێدەدەنەوە.
٢. بچنە دەرەوە و بکرێن بە شاگردی چێشتخانە و فیتەر، یان جگەرە فرۆش و بۆیاخچی فۆنەرە و عەلاگە فرۆش، تالە ئاکامدا لەو بازاڕە جوانەدا ببنە چەقاوەسوو، بە جۆرێك کەلە ساڵی نوێی خوێندندا قوتابخانە و خێزان و کۆمەڵگە دەرەقەتی نایەن و بۆیان ناکرێتەوە بە منداڵەکەی ساڵی پار.

لێرەدا هەقی خۆیەتی وەزارەتی ناوخۆو ڕۆشنبیری و پەروەردە و پیشەسازی پێکەوە مشورێکی ئەو کارەساتە بخۆن و بەر لە ڕوودانی ڕێوشوێنی پێویست بگرنە بەر.

چونکە ئەگەر حسابێك بۆ پشووی هاوین نەکرێت ئەوا زوربەی منداڵەکانمان لە دەست دەچێت و داریش کە پیربوو دانایا. هاوکات زوربەی پەیمانگە ئەهلی

یەكان و ڕێكخراوەكان دەست دەكەن بەكردنەوەی جۆرەها خولی پیشەیی و فێربوونی زمان و كۆمپیوتەرو مەلە و بەرگدرون و..... هتد، بە پارەیەكی خەیاڵی، پارەیەك كە هەرگیز لە توانای خێزانی هەژاردانیە، بۆ نموونە خێزانێكی كرێنشینی پێنج كەسی كە سێ منداڵی هەیە، كوا دەتوانێت، یەكێك لە منداڵەكانیشی بنێرێت بۆ ئەم خولانە؟

بەڵێ ئەم خولانە بە سوودن، مەسرەفیشیان تێدەچێت، بەڵام هەرگیز بۆ منداڵانی هەژار نابن، كەلە هەموو منداڵێك زیاتر پێویستیان بەم خولانە هەیە، ئەوەی سوودی لێ وەردەگرێ منداڵی دەوڵەمەندەكانە، پێویستە وەزارەتە پەیوەندیدارەكان نرخ بۆ ئەو خولانە دیاری بكەن و تەنها بۆ باج خۆیان خۆش نەكەن، هاوكات پێویستە خۆیان بە پرۆژەوە بێنە پێشەوە بۆ خزمەتی هاوینەی منداڵان، بۆ نمونە با وەزارەتی پەروەردە بیناو مامۆستا خۆبەخشەكانی بەكاربهێنێ بۆ خولی هاوینە لە هەموو قوتابخانەی گوندو شارەكاندا بەبێ بەرانبەر یان بەنرخێكی ڕەمزی، دەكرێت وەزارەتەكانی تری وەكو شارەوانی و ژینگە و تەندروستی و پارێزگاش هاوكاری ئەم خولانە بكەن و خەرجیەكان بگرنە ئەستۆ.

ئەگەر فریای منداڵە هەژارەكان نەكەوین مانای وایە بە دەستی خۆمان پەروەردە یان تێك دەدەین و بۆ ساڵی داهاتووی پەروەردە و فێركردن ئەركی زیاتری مادی و مەعنەویمان دەوێت.

چی دەبێت ئەگەر وەزارەتی وەرزش و لاوان لە گوندەكان و گەڕەكانی شاردا، بەتایبەتی گەڕەكە هەژار نشینەكاندا چەندین تیپ و خولی وەرزشی بكاتەوە؟ بەهاوكاری لیژنەی ئۆلۆمپی؟

وەزارەتی ڕۆشنبیری چەندین خولی هونەری و مۆزیكی و شانۆیی لەو گەڕەكانە بكاتەوە؟ وەزارەتی گەشت و گوزار هەر ڕۆژە و منداڵانی گەڕەكێك بەرێت بۆ سەیران و گەشتێك؟

ئەگەر وەزارەت و بەڕێوەبەرێتیەكان بیانەوێت خزمەت بە منداڵان بكەن لە

وەرزی هاویندا ئەتوانن و کەسانی زۆر زانا ترو ژیر تریان تێدایە تاکو پرۆژەیان بداتێ و نەخشەی پراکتیکیان بۆ دابرێژێ، هەر کەس و دەزگا و لایە نێکێش لەسەر پرۆژەی هاوینەی منالان پەکی کەوتوە بابێت تاکو دەیان پرۆژەی کەم مەسرەفی پێشکەش بکەین.

هەر چیەکمان کردوە نابێ پشووی هاوین وەرزی ئازاردانی منالە هەژارەکان بێت و نەهێڵین منالەکانمان کەرەسەی بازرگانی ئەم و ئەو بن.

# بە ناوی خزمایەتییەوە پەروەردەی خێزانەکەم مەشێوێنە!

ڕاستە، لە وڵاتی ئێمەدا وا باوەکە دروستکردنی ژیانی هاوسەری وەك مۆدێلێکی لاسایکردنەوەی باپیرانمان پشتاوپشت بۆمان ماوەتەوە، بەپێی ئەو نەریتە دەبێت هەموو نێرو مێیەکی کۆمەڵگە لە تەمەنی پێگەیشتنیاندا ژیانی هاوسەری دروست بکەن، بەبێ ئەوەی کە ئەو دوو هاوسەرە پێشتر هیچ ئامادەکارییەکی مادی و مەعنەوی دەستەبەر بکەن، کیژۆڵەیەك کەلە خێزانە نەخوێندەوارو کەم ئاستەکەی خۆیدا بەکوێرەوەری و کولەمەرگی و حاجەت شۆری و خزمەتکاری و کارەکەرێنی براکانی گەیشتۆتە تەمەنی باڵق بوون و هیچ چێژێکی لە ژیانی خۆی نەدیوە و نەیتوانیوە بخوێنێت، هاوکات براکەیشی بە هەمان باردا ڕۆیشتوە و وازی لە خوێندن هێناوە و شانی داوەتەبەر کاروکاسبی، بەڵام لەبەر ئەوەی سەرمایەیەکی باشی لەبەردەستدا نەبووە جۆرەها ئیشی کردوەو لە هیچیاندا سەرکەوتوو نەبووە، ئێستاش هەریەکە لەم دوانە بیر لەوە دەکەنەوە کە ببنە خاوەنی ماڵ و خێزانی سەربەخۆی خۆیان و ماڵی باوکیان بەجێ بهێڵن، هیچ کامێك لەم دوانە هیچ شارەزاییەکیان نیە دەربارەی ژیانی هاوسەری و هەڵبژاردنی هاوسەری گونجاو و پەروەردەکردنی مناڵ و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و هاوسەنگی دارایی خێزان و نەخشەکێشان بۆ ئایندە، ئیتر لێرەوە ئەم خێزانە تازەیە دەبێتە هێلانەیەکی دۆزەخی بۆ سەرگەردانبوونی خێزان و مناڵەکانی و تێکچونی پەیوەندی خزمایەتی نێوان بنەماڵەی کوڕەکە و بنەماڵەی کچەکەو لێکجیابوونەوەی دوو هاوسەرەکە. ئەم دوو هاوسەرە بە جۆرێك ڕقیان لە ژیانی هاوسەری دەبێتەوە کە بۆ هەتا هەتایە بیر لە هاوسەری تر نەکەنەوە دوای ئەوەی لە یەکتری جیابونەوە، ڕۆژانە چەندین لێکجیابونەوەی لەم جۆرە لە دادگاکاندا بەدی دەکەین، کە هەندێ لەوانە دوای مناڵ کەوتنەوە ڕوودەدات، مناڵێك کە چارەنووسێکی نادیارو تاریك چاوەڕوانی دەکات و سبەینێ دەبێتە کەسێکی شەڕخوازو لادەرو گێچەڵبازو تێکدەر، چونکە هەر لە مناڵیەوە

دابڕاوە لە سۆزی خێزانی و پەروەردەیەکی ڕەسەن و هاوچەرخانە. هۆیەکانی جیابوونەوەی هاوسەران لە یەکتری زۆرن، لەوانەش هۆکاری کۆمەڵایەتی، ئابووری دەرونی، تەندروستی، هۆکاری دەرەکی و ناوخۆیی تر، هەر کاتێك دوو هاوسەر بەر لە گرێدانی بڕیار نامەو گرێبەستی هاوسەرێتی نێوانیان، بە تەواوەتی یەکتریان نەناسی چاوەڕوانی لێکجیابونەوەیان لێدەکرێت، یەکێك لە هۆکارەکان هەژاری جیاوازی هزری و ڕۆشنبیری یە لە نێوانیاندایە، بۆ نموونە کوڕێکی عەشیرەت سەرگەم و دەوڵەمەند و هەرزەکار کە تاکو پۆلی سێهەمی ناوەندی خوێندەوە، لەسەرەڕێداو هەر بە ڕێبواری شەیدای کچێکی گەڕەکەکەیان دەبێت، کە کچەکە دەرچووی کۆلیژەو بە ڕووکەش و ڕوخسارو باڵا جوان و دلگیرە، بەبێ ئەوەی ئەم دوانە بە تەواوەتی یەکتری بناسن دەکەونە داوی دڵدارییەوە و لە ئاکامدا یەکتری دەخوازن، دوای ماوەیەك پێکەوە ژیان و تێربوونی چێژی سێکسی ئیتر بۆیان دەردەکەوێت کە ئەم دوو کەسە زۆر لە یەکترییەوە دورن و هەرگیز خاڵی هاوبەشیان نیە، ئیتر ئاژاوەو ناکۆکیەکانیان دەست پێدەکات، جا یان خۆیان دەخۆنەوە و لە ناخی دەرونیاندا کەڵەکەی دەکەن و ناهێڵن هیچ کەسێك پێیان بزانێت تا ئەو دەمەی مەسەلەکە لەوێزەدا نامێنێ و دەتەقێتەوە، یاخود هەر زوو ناکۆکیەکانیان دەردەکەوێ و خزم و کەس و کار هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانیان دەدەن، ئەوەش یان سەر دەگرێ یان سەرناگرێت، گەلێك لە خێزانەکان بەم جۆرە دروست دەبن و بەم دەردو ناکۆکیانە دەتلێنەوە، جگە لەوەی خۆیان چێژ لە ژیان ناکەن، هاوکات کەس و کاری هەردوولاشیان گیرۆدە دەبن بەدەستیانەوە و گەلێك جار هەردوو بنەماڵەکە لە یەکتری دەترازێن و بگرە خزمایەتیەکەش دەگۆڕێت بۆ شەڕە جنێو و کوشت و بڕی و شکایەتکاری، ئەمە بوو ئاکامی پێکەوەنانی ژیانێکی هاوسەر گیریانەی بێ بنەما و بێ ئەزموون و بێ ڕاوێژو وردەکاری.

وا باوە هەر کە کوڕ ژنی هێنا، ئیتر وا دەزانێت هیچ پێویستیەکی بەماڵی باوکی و خزمەکانی نابێت، بەڵکو ئەو باوەڕەی بۆ دروست دەبێت کە ماڵی

خـەزورانی هـەموو پـشتیوان و هاوکـارێکن بـۆی، ئەمـەش لـەو ڕوانگەیـەوە کـە کچەکەی خۆیان پێشکەشکردوەو بە خزمایەتی ئەو شانازی دەکەن، ئەمـە دەبێتـە مایـەی دروسـتکردنی پەیوەندیـەکی گـەرم و گـوڕ لەگـەڵ مـاڵی خەزورانـدا لەبەرانبەر ئەوەدا پەیوەندی و هاتوچۆی لەگەڵ ماڵی باوکی کەم دەکاتەوە.

سروشتی مرۆڤ وایە کە ئارەزووی نزیکبونەوەی بۆ بێگانە زیاترە تاکو بۆ خزم، بـە تایبـەتیش ئەگـەر پیاوێـك زۆر هاوسـەرەکەی خۆش بوێت، یـان هەسـت بەکەمی لە خۆیدا ببینێ و بترسێت کە زۆر تێکەڵ نەبونەکەی ببێتە لە کەیـەك بـەناو چاویەوە، وەیـان پیاوەکـە کـە سـێکی دەسـتەو سـتان و ئاسـت نـزم بێـت و ژنەکەی لە خۆی زیت و وریاتر بێت، دەکرێت ئەمانـە زوربـەی ئـەو جـۆرە ڕافەیـە بێت کە لەسەر زاری خەڵکی ئاساین، بەڵام لێکدانەوەی تریش هەیـە، وەك ئـەوەی ئـەو پیـاوە کەسـێکی زۆر دیموکراسـخواز بێـت و بـڕوای بـە ئازادیـەکانی مـرۆڤ هەبێت و نەیەوێت دەست وەربداتـە ژیـانی تایبـەتی هاوسـەرەکەیەوە، یـاخود ئـەم دوو هاوسەرە هاوسەریەکەی خۆیان بەسەرکەوتوو نازانن و ژیانیـان تـەنها بریتیـە لەبەرێکردنی ڕۆژەکان و هیچی تر.

دەبێـت ئـەم دوو هاوسـەرە بەشـی ئەوەنـدە شـارەزایی ژیـانی هاوسـەرییان هـەبێت کـە بتـوانن قـەوارەی سـەربەخۆی خێزانیانـەی خۆیـان دروسـت بکەن، بـۆ ئەوەی بۆشاییەك دروست نەبێ بۆ دەست تێوەردانی کەسانی دەرەوەی خۆیان

ئـەو هۆکارانـە زۆرن کـە ڕێگـە خـۆش دەکـەن بـۆ کەسـانی دەرەوەی تـازە خێزانێك تاکو دەست بخرێتە کاروباریانـەوە، بەتایبـەتیش لـە کـاتی لـە دایکبـوونی یەکەم منالی ئـەو خێزانـەدا، چونکە خێزانـە تازەکە شارەزایی و ئـەزمونیان نیـە دەربارەی چۆنیەتی چاودێری و بەخێوکردنی منال و ناچارن گوێ بگـرن لـە هـەر کەسـێك کـە ڕێنومایـیـان بکـات، ئەمـەش ڕێگـە خۆشـکەرە بـۆ چـوونە ناوبـاس و خواسـی تایبـەتی خێـزان و ژیـانی هاوسـەریانەوە، لـە لایـەن کەسـانی دەرەوەی خێزانەکەیان.

ئەو کەسانەی بـە پلـەی یەکـەم دەسـت وەردەدەنـە نـاو کاروبـای خێزانێکی

تازەوە بریتین لە چوار کەس کە ئەمانەن (باوکی زاوا و باوکی بوکێ دایکی زاواو دایکی بوکێ)، بەپلەی دووەمیش ئەو خوشك و برایانەی بوك و زاوا کەلە بوك و زاوا گەورەترن، بە پلەی سێهەمیش براژنی بوك و براژنی زاوا، پلەی چوارەمیش ئەو کەسانەن کەلە دوای ئەمانەوە دێن لە خزمانی هەر دولا و دراوسێ و هاورێ و هاورێیانی کارو فەرمانگە، ئەم خەڵکانە بە چوار پلەی جیاوازە وە لە چەندین دەروازەوە دێنە ناو ئەو بوك و زاوایەی کە تازە بە تازە ژیانی هاوسەرییان پێکهێناوە، هەریەکەشیان بە جۆرێك قسەیان بۆ دەکەن و بەناوی خزمایەتی و دڵسۆزیەوە ئاراستەیان دەکەن، تاکو لە ئەنجامدا دوو هاوسەرە تازەکە بۆیان دەردەکەوێت کە خۆیان خاوەنی خۆیان نین و بوونە بوکەڵەی دەستی کەسانی تر.

دایکی زاوا وا بیر دەکاتەوە کە کچێکی بێگانە کورەکەی لێ داگیر کردوەو وەك خزمەتکارێك بۆ خۆی بەکاری دەهێنێ لەبەر ئەوە بەردەوام بوکەکەی سەرکوت دەکات و هانی کورەکەی خۆشی دەدات کە گوێڕایەڵی ژنەکەی نەکات و پیاوەتی خۆی نەدۆڕێنێ، بەڵکو با وەفای هەبێ بۆ دایکی خۆی و خۆشەویستی خۆی تەنها بۆ دایکی دەربڕێ، چونکە دایکی کورەکە لەو باوەڕەدایە کە ئیتر کورەکەی خۆی لە دەست چوە و تازە ئەو کچە بێگانە یە هەموو شتێکی لە کورەکەی زەوت کردوە،هاوکات دایکی کچەکەش پێی وایە کە کچی بۆ کوڕی خەڵك بەخێوکردوە، لەبەر ئەوە هەمیشە منەت لەسەر کورەکە و کەس و کاری کورەکە دەکات و دەیەوێت زاواکەی هەمیشە گوێ ڕایەڵی خۆی و کچەکەی بێت و خزمەتیان بکات. بەزۆری لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا باوکی کوڕەو باوکی کچ زۆر خۆیان لە کاروباری تایبەتی خێزانە تازەکان هەڵناقورتێنن.

هەرکاتێك ئەم خێزانە تازەیە منداڵیان بوو، ئەوا هەریەکە لە دایکی کورەکە و دایکی کچەکە خۆیان بە خاوەنی ئەو منداڵە دەزانن و دەست دەکەن بە ڕێنومایی کردن و سەر زەنشتکردنی ئەو خێزانە، بەحیساب دەیانەوێت بەو شێوەیە دڵسۆزی خۆیان دەربڕن بۆ خێزانە تازەکە.

منداڵەکە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورە تر دەبێت و سات لە دوای سات پێویستی

زیاتری بە پەروەردە و ئاراستەکردن هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی دایکوباوکی منداڵەکە ڕێگەیان نەدراوە بەشێوەیەکی ئازادو هاوچەرخ منداڵەکەیان پەروەردە بکەن، نا چار منداڵەکە دەبێتە منداڵی ماڵی داپیرەو باپیرە، دوو باپیرەو دوو داپیرە بە خۆیان و منداڵیانەوە، بەنێرومێ وە هەریەکەیان بە جۆرێك ئەو منداڵە پەروەردە دەکەن، تا لە ئاکامدا منداڵەکە سەرگەردان دەبێت و ستایلی کەسێتی خۆی بۆ دروست نابێت و ئاشنای دایك و باوکی خۆی نابێت، بەم جۆرە دایکوباوکەکەی خۆی لێ دەبێتە بێگانە و زۆر هۆگریان نابێت، واتە زۆر خۆشی ناوێن، ئەمەش کوتومت واتە زۆر گوێڕایەڵیان ناکات، کاتێك منداڵەکە دەگاتە قۆناغی هەرزەکاری ئەوسا پێوەی دەردەکەوێت وبۆی ڕوون دەبێتەوە کە شێوازی پەروەردە کردنەکەی ماڵی باپیرانی هەر دوولای هەڵە بووە، چونکە ئەوان بە هەمان مۆدێل ئەمیان پەروەردە کردوە کە کاتی خۆی منداڵەکەی خۆیان پێ پەروەردە کردوە، بەڵام سەردەمی ئەم زۆر جیاواز ترە لەسەردەم و کاتی منداڵێتی دایکو باوکی خۆی، زوربەی کات پەروەردە کردنی منداڵەکە ئامانج و مەبەستی سەرەکی نەبووە، بەڵکو مەسەلەکە خۆتێهەڵقورتاندن و ململانێ و خۆفەرزکردنی لایەکیان بووە بەسەر لایەکەی تردا و لەسەری منداڵەکەدا شکاوەتەوە، لە نێوان ناکۆکی ماڵە باوکو ماڵە خەزوراندا ئەوەی داماو (منداڵەکە) باجەکەی داوە و بوە بە قوربانی.

لە ڕاستیدا ئەگەر دایك و باوك بە ڕاستی یەکتریان خۆش بوێ و لە یەکتری تێبگەن و کەمێك شارەزاییان هەبێت پێویستیان بەڕێنومایی هیچ کەسێك نابێت بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانیان و ڕۆژگار فێریان دەکات، (ناچاریش دایکی داهێنانە) گەلێك جار خۆتێهەڵقورتاندن دایك و باوکی بوك و زاوای تازە لە کاروباری پەروەردەی منداڵەکانیاندا لەبەر دڵسۆزیە، بەڵام نازانن چۆن ئەو دڵسۆزیە بخەنە کار، بۆیە سەر لەشیرازەی پەروەردەی ئەو خێزانە تازەیە تێك دەدەن و پەروەردەی منداڵەکانیشیان دەشێوێنن، زوربەی ئەو کەسانەی کە ئەمڕۆ بوونەتە مایەی سەر لێشێواندنی خێزانە تازەکان خزمە نزیکەکانی ئەو خێزانە

خۆیانن، کاتێکیش زاوا بەخەسوی یان دایکی دەڵێت : دایەگیان منالەکەم فێری فلانە شت مەکە! یەکسەر خەسوی یان دایکی هەڵدەشاخێ بە سەریدا و دەڵێت : ڕۆڵە تۆ هێشتا بۆنی شیری خاو لە دەمت دێت، من دایکتم یان وەکو دایکت وام و چەندین کەسی وەکو تۆم گەورە کردوە، تۆ من فێردەکەی؟! ئێوە هەموو شتێکتان تێکداوە، بە زەمانی ئێمە منال ئاوا بەرەڵا و بێ چاوەڕوو نەبوو، ئاوا بڕوات سبەینێ چاویشتان دەردەهێنن! بەم جۆرە لە دەروازەی دڵسۆزیەوە دەست لە کاروباری پەروەردەی خێزان و منالەکانت وەردەدەن و کاروبارت لێ تێکدەدەن، بەڵام ئەگەر تۆی تازەو باوك یان تازە دایك تۆزێك لە خەمی پەروەردەی خۆت و منالەکانتدا بێت، ئاستی هۆشیاری و ڕۆشنبیری خۆت بەرز دەکەیتەوە، چەند خولێکی خێزانداری دەبینی، چەند کتێب و نامیلکە یەك دەربارەی پەروەردەکردنی منال دەخوێنێتەوە و مێشکت پڕ لە زانیاری دەکەیت، ئیتر بە شێوەیەکی بێ ئاگایانە پشتگیری لە قسە و بیرو بۆ چوونە کلاسیکی یەکانی ئەو کەسانە ناکەیت کە پەروەردەی تۆ و هەزارانی وەکو تۆیان تێکداوە، ئەوانیش لەباو باپیرانیانەوە هەر ئەوەیان بۆ ماوەتەوە، بەڵام نابێت تۆی تازە باوك یان تازە دایك ئەو هەڵەیەی ئەوان دوبارە بکەیتەوە، بەڵکو دەبێت کەسێکی شارەزا بیت لە بواری منالپەروەری و سایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتی و ژیانی هاوچەرخ و ئایندەی پەروەردە و فەلسەفەکەی و ئەرکەکانی.

کاتێك توانیت ببیتە کەسێکی هۆشیارو داناو تێگەیشتوو یان هیچ نەبێ شارەزای بواری خێزانداری، ئیتر خۆت دەبیتە مرۆڤێکی کارامە و بە حیکمەت و بە ئاسانی لە ئەرك و کاری پەروەردەکردنی خۆت و مندالەکانت تێدەگەیت، دڵی هیچ کەسێکیش ناشکێنی و دایك و باوکی خۆت و هاوسەرەکەشت زیز ناکەیت، بەڵکو بە حیکمەت و لێهاتویی خۆت دەتوانیت ئاراستەی بیرکردنەوە و پەروەردەی ئەوانیش ڕاست بکەیتەوە.

# چۆن ڕەفتار لەگەڵ منداڵەکەماندا بکەین وەك دایك و باوك و مامۆستا؟

گەلێك جار، وا ڕێ دەکەوێ کە گوێمان لە دەنگی قریشکە و هاواری دایکێك دەبێت، کە بەبێزاری و تووڕەبونەوە بەسەر منداڵەکەی دا دەنگی بەرز دەکاتەوە، ئەو کەسەی گوێی لەم دەنگە دەبێت، یەکێك لەم دوو بۆ چوونەی بۆ دروست دەبێت و لە لایەن خۆیەوە دەبێتە لایەنگری یەکێك لەو دوو ڕاڤەیە، دەکرێت بڵێین ئەم هەڵچوونەی دایکەکە دوو ئەگەری سەرەکی هەڵدەگرێت. کە ئەمانەن :

١. دایکەکە نەزان و نا هۆشیارە و ئاستی هۆشیاری کەمە بەرانبەر بە چۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵ، چونکە نەیتوانیوە ڕێگە چارەیەکی گونجا و شیاو بۆ هەڵوێست وەرگرتنی سەبارەت بە ڕەفتاری مناڵەکەی بدۆزێتەوە و پراکتیزەی بکات، یاخود دایکەکە ئاستی هۆشیاری بەرزە و شارەزایشی هەیە، بەڵام کت و مت ناتوانێ لەم کاتەدا بچێتەوە سەر هێڵی ڕاستەقینەی چارەسەرە شیاوەکە.

٢. منداڵەکە، منداڵێکی لە ڕادەبەدەر لاسارو بێ گوێ و نەبیستە و هەرگیز ئامادە نی یە گوێ بگرێ بۆ دایکەکەی خۆی و سوورە لەسەر هێنانەدی داواکاریەکەی بەشێوەیەکی خێراو هەنووکەیی، دیارە هەموو منداڵێك بەشێوەیەکی ئاسایی و سروشتی لەم جۆرەیە، بەڵام ئەم منداڵە لەمەشیاندا دەگمەن و بێ هاوتایە و منداڵەکە تاوانبارە.

لە ڕووی لۆژیکیشەوە هەڵەیە کە منداڵ مۆری تاوانباری لەناو چاوانی بدرێت و ڕێژەیەکی زۆری ئەمەشیان هەر دەگەڕێتەوە بۆ دایکەکە و پاشان باوکەکە و ئینجا مامۆستا و پەروەردەکار.

بەهەر حاڵ دایکەکە هاوار دەکات و بەسەر منداڵەکەدا دەنگ بەرز دەکاتەوە بەڵام مناڵەکە داناچڵەکێ و سڵ ناکاتەوە و لەگەڵ ئەو هاوارەی دایکی دا

ڕاهاتووه و بەلایەوە بووه بەشتێکی ئاسایی و دڵنیاشە کە پاش کەمێکی تر دایکەکە هێمن و خاو دەبێتەوە و هیچ دەرەنجامێکی خراپیشی لێ ناکەوێتەوە، ئەمەش وەك پێوەرێکی نەگۆڕ لای منداڵەکە دروست بووه، بەپێی ئەم پێوەرەش دەنگە دەنگی دایك و هاوار و تووڕەبوون هیچ دەورێکی نییە و بگرە زیانی زۆری هەیە بۆ ئاڵۆزکردنی پرۆسەی پەروەردەکردنی منداڵەکە و باری دەروونی دایکەکە.

## دایکی بەڕێز!

دڵنیابە ئەو کارو هەڵوێستەی تۆ، بەرامبەر بە منداڵەکەت هەڵەیە، نەك هەڵەیەکی ساکاریش، بەڵکو هەڵەیەکی کوشندەیە، ڕەنگە زیان و شوێنەواری ئەم هەڵەیەش پاش دەیان ساڵی تر بە تەواوەتی لەسەر باری دەروونی و کۆمەڵایەتی منداڵەکەت دەربکەوێ کە ئەوسا دەبێتە لاوێك، یان کەسێکی کامڵ و بەتەمەن پێگەیشتوو. پێویستە بەرلەوەی هیچ هەنگاوێك بنێیت، بزانیت ئاکامەکەی چی دەبێت؟ هەڵوێستی منداڵەکەت بەرامبەر بەو هەنگاوەی تۆ چی دەبێت؟ ئایا بەرەنجامی کارەکە باشە، یان خراپ؟ باش وایە کاغەزێکی سپی لای خۆتەوە دابنێیت، هەموو هەنگاو و ڕەفتارەکانی خۆت بەرانبەر منداڵەکەت بنووسیت و چەند ڕۆژێك ئەم کارە دووبارە بکەرەوە، پاشان لە ئێوارانی هەموو ڕۆژەکاندا بە تەواوەتی بۆت ڕوون دەبێتەوە کە هەڵە و ناتەواویەکانی تۆ چەند زۆرن بەرانبەر بەو منداڵەت کە تۆ نزیکترین پەروەردەکاری ئەویت، بەڵام چونکە ڕۆژانە هەڵە و هەڵوێستەکانی خۆت تۆمار نەکردووە، وا دەزانیت کە هیچ هەڵەیەکت بەرامبەر منداڵەکەت نەکردووە، بگرە منداڵەکە قەرزاربار دەکەی بەوەی کە گوایە ئەو هەڵە و تاوانی زۆری بەرامبەر تۆ کردەوە، باش وایە بە تەنها خۆت بڕیار نەدەی لەسەر ئەوەی ئاخۆ تۆ هەڵەیت، یان منداڵەکەت بەڵکو پێویستە پرس و ڕاو ڕاوێژ بە چەند کەسێکی شارەزا بکەیت و وەڵامەکان بەراورد بکەیت.

پێویستە بۆ ماوەی یەك هەفتە تەنها هەڵس و کەوتی ڕەفتارەکانی

منداڵەکـە بنووسـیت و تۆماریـان بکـەیت، بـەبێ ئـەوەی جـارێ هـیچ بڕیـارو هەڵوێستەیەك بەرانبەریان بەشێوەی کرداریـی ئـەنجام بـدەیت، چونکە ئـەم کـارە تەنها بۆ ناسـینی شـێوازی ڕەفتاریانـەی منداڵەکەتـە، دوای ئـەوەش ڕەفتـارە تۆمـار کراوەکانت بهێنـە و دابەشیان بکە بۆ چەن تەوەرەیەکی جیـا جیـا، دیـارە هۆکـاری هەریەکـەیان جیـاوازە، ئینجـا لـە قۆنـاغی دواتـردا بڕیـار لەسـەر هەڵبـژاردنی هەڵوێستەکان دەدەیت جا لەبەر ئەوەی منداڵەکە نەیزانیوە هەڵوێستی تـۆی دایـك چۆن دەبێت زوو زوو هەمان کارو ڕەفتار دووبـارە دەکاتـەوە بەمەبەسـتی زانینـی هەڵوێستەکە، ئەوسا کە منداڵەکە لـە هـەڵوێستی (جدی) تۆ دڵنیـا بـوو، ئـەویش لایەنی ڕاستەقینەو ناخی خۆی والا دەکات و هیچ لاری و تەمێکی پێوە نابێ.

ئەمـەش سـەرەتایەکە بـۆ ناسـینی منداڵەکـەت، دەشـزانیت هـەموو منداڵێـك بەلای دایکەکەیەوە بوونـەوەرێکی نـامۆ و نەناسـراوە، ژوورێکـی داخـراوە و هێـشتا دەرگای نەکراوەتەوە، کاتێك مندالەکە بـە تـەواوەتی لای دایکـی ناسـرا، ئـیتر ئـەو دایکـە هـەموو دەروازەکـانی گـۆڕینی منداڵەکـەی بـە ڕوودا ئەکرێتـەوە، بـە داخـەوە هەندێ دایـك و بـاوك لـەو بـاوەڕەدان کـە منداڵـەکانیان لەسـەدا سـەد دێنـەوە سـەر خۆیان یان کەس و کاریان لە ڕووی ڕەفتارەوە، لە کاتێکدا شێوازی پـەروەردەکردنی بـاوی نـاو خێـزان و کۆمـەڵ و هۆکـاری سـەرەکی و کارتێکـەری هـەرە گـەورەن بـۆ داڕشتنی تان و پۆی نەخشەی پەروەردەیی وڕەفتارەکانی.

پـێش ئـەوەی دەسـت بکـەیت بـە هـەر کـارێکی پراکتیزەیـی بەرانبـەر بـە منداڵەکەت پێویستە ڕەچاوی دوو خاڵ بکەیت :

١. دەروونـی خـۆت وا فێـر بکـە و ڕای بهێنـە لەسـەر ئـەوەی کـە دەبێـت هـەموو کارێـك لـە پێنـاوی ئەنجامێکدا بێـت کـە ئـەنجامێکی دڵنیـا و ڕاسـت و دروسـت بێت.
٢. پێویـستە پـێش هـەموو شـتێ بـە ڕوونـی ئەنجامەکـە دیـاری بکـەیت، وە نابـێ چارەنووسی ئەو ئەنجامە بدەیتە دەست ڕەوتی ڕێکەوتانەی هەنگاوەکان.

پێویـستە دیکتـاتۆر نـەبین لـە سـەپاندنی ڕاو بـۆ چـوونەکانی خۆمانـدا بەسـەر

منداڵەکانمانـدا چونکە گوشار خستنە سەر منـداڵ، وای لێ دەکات کـە سروشتی ڕەفتاریانـەی خـۆی پـەردە پـۆش بکـات، کەواتـە بەشـێوەیەکی ئاراسـتەوخۆ منداڵەکانمان فێری درۆ و ڕووپامایی و دەمامککەرایی کارایی دەکەین، بگرە فێری جوو ترووییـی (الازدواجیـە) دەکـەین لـە لایـەکی تـرەوە منـداڵ حـەز دەکات بـە تەواوەتی نهێنـی و شـتە شـاراوەکانی دەوروبـەری خـۆی بزانێـت، کاتێك شـتێکی لێ قەدەغە دەکرێت، مناڵەکە زیاتر لـە بـاری ئاسایی خـۆی سـرەوتی لێ هەڵدەگیرێ و زۆر بـە گـەرمی و بـێ پەروایانـە دەکەوێتـە جـم و جـۆڵ و گـەڕان بـۆ دۆزینـەوەی ناخی ئەو شتەی کە لێی قەدەغە کراوە، یاخود ئـەم گەرانـەی مناڵەکـە بـە شـێوەی بەربەرەکانێ (تحدی) دەردەکەوێ، یان جاری وا هەیە ئەو بەربەرەکانێ کردنە لـە لای مناڵەکـە دەبێتـە گاڵتـە و گـەپێك و مناڵەکـە چێژ لـەوە دەکـات کـە دایکـی ببزێوێتـەوە و تووڕەیـشی بکـات، بـە تایبـەتیش ئـەو منالانـەی کـە دایکیـان بـە (جـدی) گوێیـان لێ نـاگرێ و بەدەمیانـەوە نایـات، مەگـەر تـەنها لـەو کاتانـەدا کەمناڵەکە دەیەوێ کەتنێك بکات، دیـارە منـاڵ حـەز دەکـات دڵنیـا بـێ لـەوەی کـە دایکی گوێی بۆ دەگرێ و لای لێ دەکاتەوە و فەرامۆشی نـەکردووە، بـە زۆریـش لـەو کاتـەدا منـاڵ بـانگی دایکـی دەکـات و پرسـیاری ئاراسـتە دەکـات کـە دایکەکـە زۆر سـەرقاڵە بـە کارێکـەوە، چـونکە منـداڵ ئیشی بەوەیـە کـە بزانێـت دایکـی تـا چ ڕادەیەك گوێ بۆ ئەم دەگرێ لە کاتی سەرقاڵیدا، بە کورتی مناڵ وا هەست دەکات کە دایکـی پـەراوێزی کـردووە و بـە پلـەی دووەمـی بایـەخ دێـت، ئەگـەر کـت و پـڕ دەست بەرداری کارەکەی خۆی نەبێ و نەیەت بەلای مناڵەکەیەوە، ئـەوەی جێگـەی سەرنجە مناڵ بەو پێیە دڵنیا دەبێ لەوەی ئاخۆ دایکی خۆشی دەوێ و حساب بۆ کەسێتی ئەم دەکات یان نا....! خۆ ئەگەر دایکی لـە هـەموو بارودۆخێکدا وەڵامـی نەدایـەوە، ئـەوا مناڵەکـەش بەلایـەنی کەمـەوە ئـەو دەسـتەواژەیەی لـەلا دروسـت دەبێت کە بە پلەی یەکەم لە هەندێ کاتدا لای دایکی خۆشەویست نی یە، لێـرەوە گیانی ڕکەبەرایەتی و سەرکەشی و کەللە ڕەقی تێدا گەشە دەکات.

لەبەر ئـەوە پێویـستە نـەهێڵی ئـەو گیـانی ڕکەبەرایەتیـە لـە منداڵەکەتـدا

گەشە بکات، ئەمەش بە چەند خاڵێك دەبێت :

١. هەرگیز دایك وا خۆی نیشانی منالەکەی نەدات کە لە ئەو زاناتر و بە توانا ترە لە ڕووی هزرو ژیری یەوە، گەر چی لە ڕاستیشدا وا بێت.
٢. هەرگیز دایك دەسەلاتی خۆی و ڕاوبۆچونی خۆی بە زۆر بەسەر منالەکەیدا ئەسەپێنێ.
٣. لە هەموو جۆرە کێشەیەکدا وای دابنێ کە کێشەکە هەیە و پێویستی بە چارەسەر کردنە ونەویش بە هاوکاری دایك و منالەکە پێکەوە چارەسەر دەگرێ و دایکە کە بە تەنیا توانای چارەسەری نی یە.
٤. بە ئەنقەست دایکەکە جاروبار پرس و ڕاو ڕاوێژ بە منالەکەی دەکات و خۆی وا نیشان دەدات کە منالەکەی جێگەی پرس و ڕایە و دایکە کە سەربەخۆ هیچ شتێ بەبێ بڕیارو بەشداری منالەکەی ناکات.

بەڕاستی زۆر کردن و تۆپزی کردن لە منالدا ڕەنگدانەوەی خراپی دەبیت و هاوکات ناکامێکی باشیشی لێ ناکەوێتەوە.

کاتی گەمە و یاری کردن لەگەڵ مندال باشترین کاتی شیاوە بۆ هەنگاو نان سەبارەت بە گۆرانکاری لە ڕەفتاری منالدا، چونکە منال بە چاوی گەمە و یاری دەڕوانێتە هەموو شتێك و ئەم جیهانە گەورەیەش یاریگایەکی گەورەیە و خەلکیش بەگشتی هەموویان یاریزانن، یاریش دەستورو یاسا و ڕەوشت و ڕەفتاری تایبەتی هەیە و بێ سنورو بێ سەرەوبەرە نی یە، هەموو هەنگاوێکیش بەشێوەی هاندان و خۆشی بەرنان دەبێت و هەرگیز ترساندن و تۆقاندنی هانی منال نادەن بۆ گۆرانکاری، کاتێك هەستت کرد منالەکەت ڕەفتارێکی نالەبارو نا پەسەند و هەڵە دەکات، یەکسەر گازندەی ناراستە مەکە و لە ڕێی ئامۆژگاریکردنەوە سەر زەنشتی مەکە، بەلکو بەشێوەی کرداری خۆت ڕەفتارو هەنگاوە ڕاستەکە چەند جارێك دووبارە بکەرەوە لەبەر چاوی، وە دووبارە کردنەوەکەش وامەکە، کە منالەکە هەست بکات تۆ بۆ ڕقەبەرایەتی ئەو دەیکەیت، بەلکو وا نیشانی بدە کە گومانت لەو ڕەفتارە هەیە و بەچەند جار

دووبارەکردنەوەی ڕەفتارەکە دەتەوێت خۆت دڵنیایکەیتەوە لە ئەنجامە ڕاستەکە. خاڵێکی گرنگ هەیە کە پێویستە ئاماژەی بۆ بکەیت، ئەویش ئەوەیە کە هەندی دایك و باوك، یان مامۆستا خەڵات و بەخشیش دەدەن بەو منالەی کەکارێکی چاکی ئەنجام داوە، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر بکرێتە خوو، هەرگیز نابێ منالّ پاداشت بکرێ لە بەرانبەر چاکەکانیدا، چونکە ئەم کارە چەند دەستەواژەیەکی هەڵە لەلای منالەکە دروست دەکەن بۆ نمونە :

١. دوای هەموو کارێکی چاك چاوەڕوانی خەڵاتێکی خێراو بەنرخە.
٢. ئەگەر کارێکی کرد و خەڵات نەکرا، دوور نی یە بۆ جارێکی تر هەمان کارو بەو شێوە باشە دووبارە بکاتەوە.
٣. چاکەکاری و ڕەفتار جوانی وەك شتێکی ئاسایی وەرناگرێ، بگرە بۆ چوونی پێچەوانەی لە لا دروست دەبێت و دەڵێت : کەواتە شێوازی بنەڕەتی ئەوەیە کەمن ئەو کارە چاکە نەکەم، بۆیە کە کردوومە، واتا شتێکی گرنگم ئەنجام داوە و شایستەی خەڵاتم، ڕاستە وایە منالّ بەشێوە ئاساییەکەی وەك ئەرکی ئاسایی و سروشتی سەرشانی خۆی کاری چاکە بکات بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی خەڵات و بەرات بێ.

ڕەفتارکردن، گفتوگۆکردن، یاری و گەمە کردنی دایك و باوك لەگەڵ منالەکەیاندا، بەتایبەتیش لە قۆناغی هەرزەکاریدا هاندەرێکی گەورەیە بۆ دروستکردنی کەسێتی سەرکەوتوو لە ئایندەی منالەکەدا و بەرەو کرانەوە و ئازادی و وریایی دەبات، هاوکات پەیوەندی کۆمەڵایەتی پتەوترو دامەزراوتر دەکات لە نێو ئەندامانی خێزانەکەیدا و پەیوەندی تۆکمە و پەسەند دروست دەبێ و منالەکەش بە ناڕاستەوخۆ فێری هاوکێشەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان دەبێ.

منالانی هەرزەکار بە هەردوو ڕەگەزەوە گرفت و کێشەی جۆراوجۆریان هەیە، دەبێت دایك و باوك گوێیان بۆ بگرن و هاوبەشی ڕێنومایی ناڕاستەوخۆیان بن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان، چونکە ئەگەر دایك و باوك و مامۆستایان

خۆیان لە کێشەی منالە هەرزەکارەکان دزیەوە، ئەوا ئەو منالانە لەگەڵ هاو تەمەنەکانی خۆیان کۆ دەبنەوە و لە نێوان خۆیاندا کێشەکانیان باس دەکەن و بەدوای چارەسەردا دەگەڕێن، جا لەبەر ئەوەی هەموویان لەیەك ئاست و تەمەندان دوورنییە پێکەوە هەر هەموویان نەکەونە هەڵەیەکی ترسناکەوە.

ئەو منالە هەرزەکارانە کەلەناو کێشە و ژیانی پڕ لە ئالۆزی خێزانیدا دەژین، ئەگەر چی هەندێ جار دەمگەرم و قسەزان دەردەچن، بەلام زوربەیان سەرکەوتوو نابن لە چارەسەرکردنی کێشەی خودی خۆیان یان هاوتەمەنەکانیان بێگومان کاری گوێگرتن لە قسە و باس و کێشەی هەرزەکاران کارێکی هەروا سادە و ئاسان نی یە، بگرە یەکێك لە هۆکاری ئالۆزبوونی کێشەی هەرزەکاران لەناو خێزانەکاندا ئەومیە کە دایك و باوك لێزان و کارامە نین لە چۆنیەتی گوێگرتن لە منالە هەرزەکارەکانیان و گەڕان بەدوای چارەسەردا، هەرزەکار کار لە خۆی و هاوتەمەنەکانی دەوروبەری دەکات، هەروەها ئەوانیش کار لەم دەکەن، بەم پێیە کاریگەرییەکان دوو جەمسەرو ئاراستەی پێچەوانە و وەردەگرن و سەرەنجام کەڵەکە بوونی ڕەفتارو هەڵوێستە دژوارەکانی باوان لە منالەکەیاندا کەڵەکە دەبێ و گیانی ململانێ و ڕکەبەرایەتی و کەللەڕەقی تێدا دروست دەکات، بە ڕادەیەکی وا کە منالەکە (هەرزەکارەکە) هەمیشە لەو سەنگەرە دەوەستێتەوە کە دژی خواستی دایك و باوکی یەتی، بە واتایەکی تر (منالەکە) تووڕەبوونی خۆی دەخواتەوە و بە ئاشکرا دەری نابڕێ، بەلام لە ناخەوە پڕە لە سەر کەشی و تووڕەیی دەیەوێ بە هەموو گفتارو کردارێك دایك و باوکی تووڕە بکات، لەم بارەشدا دایك و باوك وا هەست ئەکەن کە گوایە منالەکەیان بە دایك و باوکی ڕادەبوێرێ و بێ گوێ و کەللەڕەقە، بۆیە دایکەکە دەکەوێتە لێدان و تەریق کردنەوە و شکاندنی منالەکەی و بە زۆر دەیخاتە ژێر باری گرانی کاروباری ناوماڵ و خەڵەفاندنی تاکو بیسەلمێنێ کە توانا و دەسەلاتی خۆی بەسەریا بسەپێنێ و بەوەش چاوترسێنی دەکات، لێرەدا نەك کێشەکە چارەسەر ناکرێ، بەڵکو زۆر زۆر ئالۆزتر دەکرێ.

چارەسەری هەموو کێشەکانیش بەوە دەگرێ کە دایك و باوك وەك هاورێ یەکی بچکۆلەی خۆیان ڕەفتاری لەگەڵدا بکەن.

وە ئەم ڕەفتارکردنەی دایکوباوکەکەش لەگەڵ منداڵەکانیان لێزانی و شارەزایی و هۆشیاری دەوێ، چونکە هەندێ دایك و باوك حەز دەکەن هاورێی منداڵەکانیان بن، بەڵام نازانن ئەو هاورێیەتی کردنە دەبێت چۆن بێت، بۆیە سەرکەوتوو نابن، لەو بارەشدا نەدەتوانن ببنەوە بە دایك و باوکەکەی جاران و نەدەشتوانن ببنە هاورێ بۆ منداڵەکەیان لە هەموو بارەکاندا باش وایە دایك و باوکەکە پێشتر پرس و ڕاوێژ بە کەسێکی شارەزای بواری پەروەردە و سایکۆلۆژی بکەن.

ڕەفتار ئەوکارە، یان ئەو گوتەیە کە مرۆڤ دەیکات، یان بیر دەکاتەوە ئەمەش بەپێی سروشتی پێکهاتەی مرۆڤەکە لە ڕووی فەسیۆلۆژی و سایکۆلۆژیەوە دەگورێت، ژینگە و پەروەردە و بوارە ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی یەکانیش کاریگەریان هەیە، تەمەن و کولتورو ئایین و مێژوو نەریتی باوی کۆمەڵگەو ئاستی زلانستی و هۆشیاری و تەکنۆلۆژیش دیسانەوە هەر کار دەکەنە سەر جۆرو چەشن و برو چەندێتی ڕەفتارەکانی مرۆڤ.

ڕەفتار چەسپاوو نەگۆڕ نیە، بەڵکو بەردەوام لە گۆڕاندایە، پەروەردەش دەیەوێت هەمیشە ئەو گۆڕانکاریانە بە ئاراستەیەکی باش و پەسەندو بەجێدا بەرێت ولایبدات لە هەموو چەوتی و نەشیاو یەك کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ و ژینگەکەیدا ناگونجێت، چونکە هەرگیز مرۆڤ چێژ لە ژیان وەرناگرێ و ئاسودە نابێ ئەگەر لە جەنگ و ململانێ دابێت لەگەڵ ناوەندی ژینگەکەیدا بەگشتی.

# کورتەیەکی مێژوویی کاری ڕێنومایی

ڕێنومایی بە چەمك و واتا فراوانەکەیەوە مێژوویەکی دێرینی هەیە و کەوتوەتە پێش زوربەی پەیوەندیە مرۆییەکانەوە، دیارە سروشتی مرۆڤی کۆنیش وا بووە کە خەم و پەژارەو کێشە و گیروگرفتەکانی خۆی لە لای دۆست و هاوڕێ و کەس و کارە نزیکەکانی باس کردوەو داخی دڵی لای ئەوان هەڵڕشتوە، بەو نیازەی کە هاوکاری ویژدانیانەی بکەن و پێکەوە بگەن بەچارەسەرێك بۆ گرفت و کێشەکانیان، بەواتایەکی دیکە مرۆڤ هەر لە کۆنەوە پەراوەی کردوە لەسەر ڕێنومایی و داوای ڕێنومایی کردن، هاوکات لە ڕووی پراکتیکی و ژیانی ڕۆژانەوە وەك ڕێ بەدەری و شوێن ناسینەوە ڕێ دەرکردن سوودی وەرگرتوە لە نیشانە سروشتی و دانراوو دەستکردەکانی سەر زەوی و ئاسمان وەك شاخ و دۆڵ و دارو دەوەن و ڕەوەزە بەرد و ئەستێرە و مانگ... هتد تا ئێستاش ڕێنومایی کردن لە هەندێ شوێن دا وەك شێوەی کلاسیکی یەکەی هەر ماوە. گەرچی لەم سەردەمەدا تەکنیك و تیوری وردی بۆ دۆزراوەتەوە.

لە کۆتاییەکانی سەدەی (١٩) و سەرەتاکانی سەدەی (٢٠) بەرایی وا دەرکەوت کە بوونەتە سەرەتایەك بۆ ئەو زانستەی کە ئەمرۆ پێی دەگوترێت (ئاراستە کردنی پەروەردەیی)، بە تایبەتیش لەو دەمانەدا کە توێژەران سەرقاڵی توێژینەوە بوون بۆ دۆزینەوەی هۆکارەکانی دواکەوتنی قوتابیان لە خوێندن و سستی ژیری، یەکێك لەو توێژەرانەش (ئەلفێرد بینە) ی فەرەنسی بوو کە زانایەکی سایکۆلۆژی یە. لە ساڵی ١٩٠٥ دا یەکەمین تاقیکردنەوەی ئەنجامدا لەسەر دۆزینەوەی ڕێژەی زیرەکی و لە هاوکێشەیەکدا دەری بڕی، کە دەقەکەی بەم جۆرەیە.

$$\text{ڕێژەی زیرەکی} \quad Q.I = \frac{\text{تەمەنی ژیری}}{\text{تەمەنی ئاسایی}} \times ١٠٠ \%$$

لە ساڵی ١٩٠٨ یشدا (پارسۆنز) لە (پۆستن) ی ئەمریکا نوسینگەیەکی ئاراستە کردنی پیشەیی کردەوە و کتێبێکی دانا بەناونیشانی (هەڵبژاردنی پیشە) لە ساڵی ١٩٠٩ دا و بەگەورەترین و نـاودارتـرین کتێبی ئەو بوارە لە قەڵەم دەدرێ، لە ساڵی (١٩٠١) شدا شاری (پۆستن) کۆنگرەیەکی ڕێنماکاری بەسترا.

لە پرۆسەی پەروەردەیی دا، فاکتەرێکی زۆر گرنگ و کارا ڕۆڵی خۆی دەبینێ و کاریگەریەکانیشی بە شێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە سەر تاکەکانی کۆمەڵ دەردەکەوێ، جا ئەو تاکانە لەسەر ئاستی تاقانە کەسی بێت یاخود گروپ و کۆمەڵ بێت، ئەو کارو فاکتەرەش بریتیە لە (ڕێنومایی پەروەردەیی) Education Counseling، ڕێنومایی گەلێك مەبەست و مانای کلاسیکی و نوێ و ویژدانی و تەکنیکی و مێژوویی و ئاینی هەڵدەگرێت و لەهەر سەردەمێکدا چەمکێکی پڕاوپڕی چاخەکەی خۆی هەڵگرتوە.

پرۆسەی پەروەردەیی لە هەرێمی کوردستاندا پێویستیەکی زۆری بە کەسانی شارەزای ئەم بوارە هەیە، ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی کە ڕەگ و ڕیشەی لە نێو ئاراستەکانی هزری جەماوەری و چینەکانی دا نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە (ڕێنومایی پەروەردەیی) لە کوردستاندا مێژوویەکی زۆر کۆن و دێرینی هەیە و بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە بەشێوازێکی پەروەردەیی ڕاستەقینە نەخراوەتە گەڕو کاری پێ نەکراوە، ئەمەش هەر وەکو هەموو لایەن و فاکتەرە پەروەردەیی یەکانی تر، ئاڵۆزکان بەیەکاچونێکی چڕوپڕ لە نێوان واتا و چەمکە هزری و پراکتیکی یەکەی دا بەدی دەکرێت، بەم چەشنە ڕێنومایی پەروەردەیی بوەتە بارست و تۆ پەڵەی بەسەریەکا کەڵەکراوی واتا جوداو فرە مەبەستەکان.

ڕێنومایی پەروەردەیی تەنها پەیوەست نیە بە مامۆستا یان و شارەزایان و کارمەندانی بواری پەروەردەوە، بەڵکو پێویستیەکی هەنوکەیی سەرجەم خەڵکانە لە هەموو چین و توێژەکانی جەماوەردا، لەبەر ئەوە بەکورتی لەم باسەدا ئاماژە بە هێڵە گشتی و ستراتیژیەکانی ڕێنومایی پەروەردەیی دەکەین.

# چەمکی ڕێنومایی :

وشەی (ڕێنومایی)، چەمك و واتای زۆر فراوان و هەمە ئاراستەی هەیە، هەریەکە لەوانەش کۆمەڵێك ئامانجی لە خۆی گرتوە، لەواتا دێرینەکانی.

- ئامۆژگاری کردن
- هاندان
- پێدانی زانیاری
- ڕاڤە کردن و ڕوونکردنەوە
- ڕێنومایی کردن و ڕێ نیشاندان
- شیکردنەوەی دەروونی
- دەربازکردن و ڕزگار کردن لە قەیرانێکی مادی یان مەعنەوی
- دەستخۆشی لێکردن
- ئاڕاستە کردن و..... هتد

هەروەها ڕێنومایی Counseling بەگەڵ مەبەست و مانا بەکار هێنراوە، مەبەستی سەرەکی تیایدا ڕونکردنەوەی ڕاوبۆ چوونە جیاوازەکان بووە بۆ گفتوگۆ کردن دەربارەی بیرۆکە جیاوازەکان و یەکانگیربونیان بۆ پراکتیك کردن، ڕێنومایی بە واتای چاککردن و چاکسازی ڕەفتاری و ڕەوشت و باری کۆمەڵایەتی و کارگێڕی و پیشەیی هاتووە، هەروەها لە بری دورخستنەوەو لادان لە تاریکی و نەزانی و گومڕایی و هۆشیارکردنەوە و پێدانی خزمەتگوزاری مەعنەویش بەکار هێنراوە، ئەم واتایانەش بە ڕادەیەك ئاوێتەی یەکتری بوون کە بە ئاسانی لێك جیا ناکرێنەوە و هەریەکەیان بوونەتە باکگراوندێك بۆ ئەوی تریان.

لە ڕووی پەروەردەییشەوە دەتوانین بڵێین : (ڕێنومایی شێوازێکی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری و هاوکاریە لە لایەن پسپۆڕێکی شارەزاوە بۆ قوتابی، بەمەبەستی یارمەتیدانی لە چارەسەرکردنی ئەو کۆسپ و ناستەنگانەی هاتونەتە

ڕێگەی لە بواری فێرکاری و پەروەردەیی و پیشەیی و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژیدا، تاکو داتاکانی خۆ گونجاندن بدۆزێتەوە و خۆی و تواناکانی خۆی زیاتر بناسێت و بە باشترین شێوە تواناکانی خۆی لە کات و شوێنی شیاودا بخاتە گەڕ بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگەی و دیاریکردنی گەشترین ئاینده بۆ خۆی).

ڕێنومایی کردن کارێکی وردو هەمەلایەنە و درێژخایەنە و مرۆڤ لە هەموو ئاستە ڕۆشنبیری و ئەکادیمی و کارگێڕی و پیشەیی یەکانی تەمەنە جیاوازەکانیدا پێویستی پێی هەیە، ڕێنومایش چەندین جۆری جیاوازی هەیە، لێرەدا بە کورتی سێ جۆری سەرەکی باس دەکەین کە ئەمانەن :

## ١. ئاراستە کردنی پەروەردەیی.

ئامانجی ئەم جۆرە ڕێنومایی و ئاراستەکردنە ئەوەیە کە هاوکاری قوتابیان دەکات تاکو وانە و بواری پسپۆڕی وا بۆ خۆیان هەڵبژێرن کە لەگەڵ سروشت و ئارەزوی خۆیاندا شیاو بێت و بتوانن بە ئاسانی لەو وانانە تێبگەن و لەگەڵیاندا ڕابێن و ببن بە خواست لە لای و زاڵ بن بەسەر ئەو کۆسپ و ئاستەنگانەی لە ژیانی خوێندن و کۆمەڵایەتیاندا دێنە ڕێگەیان.

(عبدالحمید مەرسی) ئاراستەی پەروەردەیی بەم جۆرە پێناسە دەکات و دەڵێت : (ئەو کردارەیەکە بایەخ بە گونجاندنی قوتابی دەدات لەگەڵ ئەو بوارە پسپۆڕیەی لە ئاخیدایە، لەڕووی دەرفەت و هەلە لە بارەکانی فێربوون و خواستەکانی تری لەلایەکی ترەوە، هاوکات بایەخ بە دابینکردنی دەرفەت دەدات کە دەبێتە مایەی گەشە کردنێکی سروشتی تاکی کۆمەڵگە و پەروەردە کردنێکی دروست و سەرکەوتوو).

یەکێکی تر لە نووسەرانی بواری ڕێنومایی پەروەردەیی پێی وایە کە ئاراستە کردنی پەروەردەیی کردارێکی هاوکاریکردنی تاکە لە نەخشە کێشانی پەروەردەیی ئەو تۆدا کە شیاوبێت لەگەڵ تواناو خواست و ئارەزوو ئامانجەکانیدا و سەرپشك و ئازادی بکات لە هەڵبژاردنی ئەو وانە و پسپۆڕیانەی کە دەبنە مایەی دۆزینەوەو بەگەڕ خستنی توانا شاراوەکانی و لێهاتویی یە پەروەردەییەکانی

لــە نێــستای داو خۆســازدانی بــۆ ئاســتێکی زانــستی ئاینــدە و پارمەتیــدانی لەسەرکەوتن و دەرچوونی قوتابی دا بۆ زاڵ بوون بەسەر گرفت و کێشەکانی ڕێگەی پەروەردە و فێربوونی. لەمەوە تێدەگەین کە بواری ڕاستەقینەی ئاراســتەکردن بــە زۆری لــە ناوەنــدی قوتابخانــە و هۆکــارە ڕونکردنــەوە و فێرکاریەکانــدا چــڕوپڕ دەبێتــەوەو قوتــابی تیایــدا سەنتەری ســەرەکی کــارو گۆرانکاریەکانە و هەر خۆشی بڕیاردەری چارەنووسی خۆیەتی.

## ٢. ئاراستەکردنی پیشەیی :

ئەم جۆرە ئاراستەکردنە، ئامانجی هاوکاری کردنی تاکە بۆ تێگەیشتن لە ناسینی خۆی و دۆزینەوەی خۆی بە ڕێگەیەك کە شیاوی خۆی بێت و گونجاو بێت لەگەڵ ئاست و جۆری توانا و لێوەشاوەییەکانی بە چەشنێ ڕابێت لەسەری، هەروەها بۆ کۆمەڵگەش بە گشتی تاکو دوو سودی تەواوی دەست بکەوێت و ئەو دوو ئامانجە سەرەکیەش بپێکێت کە ئەمانەن :

أ – هاوکاری کردنی تاکەکانی کۆمەڵ بۆ خۆ گونجاندنیان لەگەڵ ژینگەدا.

ب - ئاسانکاری کرداری ئابوری کۆمەڵایەتی بە بەکار هێنانی شێوەیەکی ڕاستەقینەی هێزی کار.

بۆ دڵنیابوونیش بە گەیشتنی ئەو ئامانجانە پێویستە لەوە دوو دڵ نەبین کە هەموو کەسێك بەش بە حاڵی خۆی توانا و ئامادەیی و ئارەزوو حەزو خواست و تایبەتمەندێتی خۆی هەیە، بە زانین و دۆزینەوەی ئەوانەش مرۆڤەکە خۆی دەناسێت، یان لەلایەنی کەسانی ترەوە دەناسرێت و ڕوون دەبێتەوە ئاخۆ شیاوی پەرە پێدان و کارکردنی چ جۆرە بوارێکی ژیانە، هەروەها بە وانەش دەزانرێت ئاخۆ توانا و چالاکی و هێزو بڕستی لە چ کارێکدا یە و چۆن وای لێ دەکرێت لە کارو پیشە و بواری کاری خۆی ڕازی بێت و گەشەی پێبدات وداهێنانی تێدا بکات هاوکات خۆی (خۆی) پەسەند دەکات و بە کەسێکی نەزان و نامۆو ناشایستە خۆی لە قەڵەم نادات و هەست بە ئاسودەیی دەرونی و دڵشادی دەکات بە تایبەتیش

کەلـە توانایـدا هەیـە بـوونی خـۆی بـسەلمێنێ و سـوودێك بـەخۆی و دەوروبـەرو گەلەکەی بگەیەنێ.

لێرەوە تێدەگەین کە ئەگەر ئاراستەکردنی پیشەیی بەم جۆرە پێناسـە بکرێت، ئەوا ئاراستە کردنەکە دوو جەمسەر یەو دوو ڕوکارو دوو مانـای جیـاوازی هـەلگرتووە، یەکـەمیان ئامـانجی هاوکـاری کردنـی تـاکی کۆمەڵگەیـە تـاکو خـۆی و دەوروبەربەرەکەی و ژینگەکەی بناسێت و خۆی لەگەڵدا ڕابهێنـێ، واتـا کردارەکە کردارێکی کۆمەڵایەتی ئابووریە.

## ٣. ئاراستەکردنی دەروونی :

مەبەست لەو کردارەیـە کە دەکەوێتـە نێوان دوو کەسـەوە، کەسـی یەکـەمیان پشێوو ئـاڵۆزە و بـە دەست کۆمـەڵێك گرفـت و کێشەوە گرفتـار بـوە کـە ناتوانێت ڕوبـەرویان بێتـەوە، یـاخود بـە تـەنها چارەسـەریان بکـات، دووەمیـشیان کەسـێکی کارامـە و شـارەزایە، چـونکە کەسـێکی پیـشەوەرو لێهـاتوو پـسپۆڕە لـە بـواری کارەکەیدا و دەتوانێت هاوکاری کەسی یەکەم بکات لە ڕێنومایی کـردن و پێـدانی زانیاری و ڕێ بەدەری و دەربازکردنی لەو قەیرانە، ڕێنومایی دەروونی بایـەخ بـەو جۆرە شێوازەی چارەسـەر کردنەکە دەدات کـە کەسـی یەکـەم لـە ڕوی دەرونیـەوە سـازو ئامـادە دەکـات بـۆ بەرەنگاربونـەوەی گرفتـەکان و هـەنگاو نـان بـۆ چارەسەرکردنیان بەر لەوەی بارودۆخەکە ئاڵۆزتر بێت و بگاتـە ڕاددەی لادان یـان دەرکەوتنی نەخۆشیە دەرونیـەکان، خـۆ ئەگـەر ئـەم بـارە چارەسـەر نـەکرا، ئـەوا دەچـێتە چـوار چـێوەی چـاودێری و چارەسـەرکردنی دەروونـی و لـە سـنوری ئاراستەکردنی دەروونی دەچێتە دەرەوە.

پێویـستە بـزانین کـە ئاراسـتەکاری دەروونـی نابێـت هەسـتێت بـە چارەسـەر کردنی دەروونی کەسە گرفتبارەکە، ئـەوەیان ئیـشی سـتافی تایبەتیەکە لـە بـواری چارەسازی دەروونـی دا کـار ئـەکات، ئـەوەی لـە سنوری ڕێنومـایی دەروونـی دایـە، تـەنها شـیکردنەوەی هۆکـارو فاکتـەرەکانی کێـشەکەیە لەگـەڵ هەوڵـدان بـۆ چارەسەرکردنی لە قۆناغی بەرایی و سنووری دیاری کراوی خۆیدا.

کەواتە ئاراستەکاری سایکۆلۆژی ناتوانێت کاری چارەسازی دەروونی بکات، هاوکات دووەمیشیان لە کاری ئاراستەکردندا پسپۆڕ و شارەزایەکی کرداریانە نیە، بە هێندی کەسی یەکەم.

ئاراستەکاری دەروونی و ئاراستەکاری پەروەردەیی و ڕێنماکاری دەروونی و خێزانی و چارەسازی دەروونی و چارەسازی کۆمەڵایەتی ئەمانە هەریەکەیان ئەرك و کارو بواری پسپۆڕی خۆیان هەیە و لەوانی تر جیاوازە، هاوکات (توێژەری دەروونی و کۆمەڵایەتی) کە ئەمڕۆ لە زوربەی دام و دەزگاکانی پەروەردە و کۆمەڵایەتی و تەندروستی دا هەیە، کارو ئەرکەکانیان جیاوازترە لە وانی تر، واتا بواری کارو پسپۆڕی هەریەکەیان دەگۆڕێت.

ئاراستە کردن و ڕێنمایی پێویستی و ئەرکێکی گرنگی هەموو کەسێکە کە تەمەنی لەسەروو (١٨) ساڵەوە بێت، دەبێ هەموو مرۆڤێکی ئاسایی بەشی ژیان و گوزەرانی خۆی لە ئاراستەکاریدا شارەزایی هەبێت چونکە بەلایەنی کەمیەوە بەرپرسە لە ڕێنمایی و ئاراستەکردنی کەسێك لەم جیهانەدا کە ئەو کەسەش خۆیەتی، ئەمە جگە لە هاوسەرو منداڵ و خێزان و خێزانی دراوسێ و خزم و هاوڕێکانی، ئەمڕۆ کاری ئاراستەکردن و ڕێنمایی بومتە زانستێکی سەربەخۆ و فراوان و کۆلیژو زانکۆی تایبەتی بۆ کراوەتەوە کە دەرچوانی ئەو شوێنە ئەکادیمیانە دەبنە چرا هەڵگری ڕێگای ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگە، لێرەدا (١٣) نمونە لەسەر زاری ئەو منداڵانە دەخەینە ڕوو کە پێویستیان بە ئاراستەکردن و ڕشێنمایی گەورەکانیان هەیە، فەرموون :

# دایه.. بەرنامەم بۆ دابنێ!

دایە، بابە، مامۆستا گیان، خۆتان دەزانن کە من منداڵم، هەروەها قوتابیشم، زۆر حەزم لە یاریە لەگەڵ هاوڕێکانم، ئارەزووی سەیری تەلەفزیۆن و چوونە سەیران و پارکەکانیشم هەیە، لەگەل هەموو ئەمانەشدا حەزم لە خوێندن و نمرەی بەرزو خەت خۆشی و وێنەکێشان و کاری دەستی و هونەری هەیە، دەمەوێ یارمەتی دایك و باوك و مامۆستاکانیشم بدەم، ئەمانە هەندێك لە ئاوات و ئیش و ئارەزووەکانی منە، بەڵام من خۆم نازانم چۆن کاتەکانی ڕۆژم بەسەر ئەو کارانەدا دابەش بکەم، لەبەر ئەوە دایەگیان داوات لێدەکەم بە هاوکاری باوکم، یان کەسانی شارەزاو دڵسۆز خشتە و بەرنامەیەکی وردم بۆ دابنێن، کە ئەو کاروبارو ئارەزوانەی منی تێدا بێ، هێشتا سەرەتای ساڵی خوێندنە، نامەوێ ئەمساڵیش هەر وەکو پار وابم، بەڵکو دەمەوێ لە هەموو ڕوویەکەوە لە ساڵی پار باشتر بم، زیرەك تر بم، نمرەکانم بەرز تربێ، خەتم خۆشتر بێ، پاکو خاوێن تربم، دایەگیان وامەزانە کە منی قوتابی دەبێت هەمیشە کتێب و قەڵەمم بە دەستەوەبێ و بخوێنم، یاری و سەیری TV و چونە دەرەوەکانم لێ قەدەغە مەکەن، من منداڵم، لەشم سوکە مێشکم پاکە، چوست و چالاکم، فریای هەموویان دەکەوم، بەمەرجێك تۆخشتە و بەرنامەم بۆ دابرێژی، بۆم دیاری بکەیت ڕۆژانە چەند کاتژمێر یاری بکەم و چەند سەیری TV بکەم و چەندە بخوێنم و چەندیش یارمەتی تۆ و باوکم بدەم لە کاروباری ناو ماڵدا، دایەگیان ئەگەر خۆت نازانیت بەیانی لەگەڵمدا وەرە بۆ لای توێژەری قوتابخانەکەمان، یان مامۆستاکەمان تاکو لە ئەوان نەخشە و بەرنامەی

کاروباری ڕۆژانەی من وەربگریت، منیش پەیمانت دەدەمێ کە ئەو نەخشە و بەرنامەیە جێ بە جێ بکەم چونکە بەهۆی ئەو بەرنامەیەوە دەتوانم لە قوتابخانە سەرکەوتووبم و چێژ لە یاری و سەردانەکانیش وەربگرم، هاوکات هیچ ئیش و کارێکیشم لە بیر ناچێ و تێکەڵ نابن و دواناکەون، ئەو دەمە ئێوە و مامۆستاکانیش لێم ڕازی دەبن، لە هەمووی گرنگتر خۆشم لە خۆم و خوێنەرەکەم ڕازی دەبم.

## بابە.. ڕۆژانـــــەم دەوێ..!

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بەرەو قوتابخانەکەم بەڕێ بکەوم، نانم خواردوە، ددانەکانم شۆردوە، بەرگی خاوێنم لەبەر کردوە، کەل و پەل و کتێب و دەفتەرم ئامادەیە، تەنها بڕێك پارەی ڕۆژانەم پێویستە، بابە گیان لە ڕاستیدا نابێ منی منداڵ پارەم پێ بێ، چونکە تاکو تەمەنی چواردەساڵان پارە بۆ منداڵ بفەیە، بەڵام بڵێم چی لەم وڵاتەدا پێویستیەکان بە تەواوەتی دابین و مسۆگەر نەکراون بۆ ئێمەی قوتابی و منداڵ، لەبەر ئەوە ڕۆژانەم پێویست دەبێت، بابەگیان، هاوڕێکانم لە کاتی پشووی نێوان وانەکان دەچن لە فرۆشگەی قوتابخانە شت دەکڕن، منیش حەز دەکەم لە ئەوان جیا نەبمەوە، ئەگەر کەمیش بێ هەر باشترە لەوەی هیچم پێ نەبێ، دوایی هاوڕێکانم گاڵتەم پێ دەکەن و منیش دڵم لە خۆم دادەمێنێ، جا یان تورە دەبم، یان تەریق دەبمەوە. هەرچەندە خواردنەکانی حانوتیش زۆر باش و خاوێن نین بابە گیان..! تۆ هەموو ڕۆژێك کەمێك پارەم لەلای دایکم بۆ دابنێ چونکە شەرم دەکەم هەموو ڕۆژێ لێت داوا بکەم، ئەگەر پێویستم پێی نەبوو ئەوا خەرجی ناکەم و دەیهێنمەوەماڵەوە، یان لای خۆم دایدەنێم بۆ سبەینێ، یان دەیخەمە ئەم دەخیلەوە و زۆری دەکەم، هاوڕێکانم هی وایان تێدایە پارەی

زۆر زۆری پێیە، چونکە باوکی دەوڵەمەندە، هی واشمان هەیە کە زۆر هەژارو داماوە، قەت.. قەت.. نایات بۆ فرۆشگەی قوتابخانە بۆ شت کڕین، ئەگەر ئەتوانیت باوکە با جاروبار پارەمەتی ئەویش بدەین، حەز دەکەین ئەویش وەکو ئێمە شت بکڕێ و تەریق نەبێتەوە، باوکە گیان ئەتوانیت خۆت ڕۆژێک بێیت بۆ لای بەڕێوەبەری قوتابخانەمان و منالە هەژارەکانت دووربەدور پێ بناسێنێ، تاکو تۆش بەجل و پێلاوو پارە یارمەتییان بدەیت، هەموو ڕۆژێک میوەیەک یان شیرینی یەک لەگەڵ خۆم دەبەم بۆ قوتابخانەو نانی بەیانیش دەخۆم، بۆ ئەوەی زیرەک بم و لە پۆلدا خەو نەمگرێ و هەموو ڕۆژانەکەیشم خەرج نەکەم، باوکە..! قوتابی وا هەیە کە خۆی شاگردی و ئیش دەکات و ناچارە وا بکات، ئەوانە ڕاستە پارەیان زۆر پێیە بەڵام ناتوانن چێژ لە تەمەنی منالی خۆیان وەربگرن، پێویستە هاوکارییان بکرێت.

## پۆلیسی هاتوچۆ... وریا داریم بکە..!

کاکی پۆلیس بەیانیت باش، من تۆم خۆش دەوێت، چونکە نا هێڵێت ئوتومبیلەکان دەعەم دەعمێنە بکەن، بەنۆرە بەڕێیان دەکەیت، لەبەر ئەوە کەس تووشی ڕوداوی ناخۆش نابێت، تۆ کەسێکی ماندویت، بەردەوام وەك مامۆستاکانی قوتابخانەکەمان بە پێوەیت و دەست و دەم و مێشك و قاچەکانت زۆر ماندوو دەکەیت لە پێناوی پاراستن و سەلامەتی خەڵکی دا.
ئیشەکانی ئێوە پڕە لە ماندویی و هەموویشی بەپێی یاسایە، بەڵام ئەوە گەورەکان زیاتر دەیزانن، ئێمەی منال لە قوتابخانە فێر کراوین کە دەبێ لە شۆستەکانەوە بڕۆین و لە شوێنی دیاریکراوی پەڕینەوە وە بپەڕینەوە لە کاتی داگیرسانی گڵۆپە تایبەتەکانی پەڕینەوە و وەستانی ئوتومبیلەکان مامۆستا و پۆلیسی هاتوچۆ لە

قوتابخانە وا ئەمان پێ دەڵێن و فێرمان دەکەن کە دەبێ چۆن و کەی بڕۆین و بپەڕینەوە، دەبێ دەستی نابیناو پیرو نەخۆش منداڵ و کەم ئەندامان بگرین و یارمەتییان بدەین، ئەمانە بەپێی تەمەن و توانای خۆم جێ بە جێ دەکەم، بەڵام من خۆشیم هێشتا منداڵم زۆر بەهێزنیم، بە تەواوەتیش شارەزای نیشانەکانی هاتوچۆنیم، زۆریش ڕقم لە دەنگی هۆڕینی ئوتومبیلە، تەنانەت کەم کەم نەبێت نا هێڵم زرنگەی زەنگی پایسکیلەکەیشم بێ کەلە ماڵەوە هەمە، لەبەر ئەوە داوات لێ دەکەم پێش هەموو شتێك زۆر وریای ئێمەی منداڵ بە، ئوتومبیلەکان بوەستێنەو خۆت وەرە ئەمبەرەوە دەستمان بگرە و بمانپەڕێنەوە، چونکە هەندێ مۆتۆڕو ئوتومبیل هەیە زۆر بە تیژی دەڕۆن، مەهێڵن ئەوانە ئاوا خێرا بن، هەندێکیان بێ مۆڵەتن و هیچ شتێ نازانن دەربارەی سەلامەتی ڕێگەو پەروەردە و چاودێری مافی خەڵکی لە ڕێ و بانەکاندا، من لەبەر دەستی سێ کەسدا پەروەردە دەبم بەسەلامەتی، خێزانەکەم، مامۆستاکانم، تۆی پۆلیس لەبەر ئەوە تکایە وریام بەو بمپارێزە.. منیش لای مامۆستاو هاوڕێکانم باسی دڵسۆزی تۆ دەکەم و سوپاست دەکەین.

## شۆفێرەکان... هێمن لێبخوڕن..!

دەزانم ئێوەش دەست و قاچ و چاوو گوێ و مێشکتان ماندوو دەکەن ئینجا دەتوانن ئوتومبیل لێ بخوڕن، مامۆستا زۆر باسی ئێوەمان بۆ دەکات و ئوتومبیلیش زۆر بە سوودە، ئەم قسەیەش زۆر گوتراوە و گواتراوەتەوە، خۆشتان دەزانن هەندێ جار کە قسەیەك زۆر دەگوترێتەوە، پێچەوانەکەی بەرەو پەیدا دەکات، ئێمە منداڵین، تازە هاتوینەتە دەرەوەی ماڵ و سەرشەقامەکان، بەهۆی بچووکیمانەوە زۆر دیارنین و شارەزاش نین، هەمیشە بەدەم ڕێگاوە جگە لەوەی جانتایەکی قورسمان بەکۆڵەوەیە قسەش لەگەڵ هاوڕێکانماندا دەکەین و هەندێ جار هۆشمان بەسەر ڕێگاو شەقامەکانەوە نامێنێ، لەبەر ئەوە تکاتان لێدەکەین بە

تیــژی و خێرایــی لێ مــەخورن، بەتایبــەتی لــە کــۆڵان و شــوێنە نادیارەکــان و دەوروبــەری قوتابخانــەکان، بــە وردی تەماشــای پێــشی خــۆت و ناوچــەی مــردوی تەنیشتی خۆت و هەر سێك ئاوێنەکان بکە، ساڵانە دەیان منداڵی وەکو ئێمە دەبنــە قوربانی بەهۆی هەڵەی ئێوەوە، ئێمە گوناهمان چیە، ساواین و حەز دەکەین وەکو ئێوە گەورە بین، بۆچی ئەمانکەن بــە ژێــر ئوتومبیلــەوە؟ تکایــە ڕۆحــی بێگــەردی ئێمەتان خۆش بوێ و لەبەر خــاتری ئێمــە بــەهێمنی لێبخــوڕن، زوربــەی جــار لــەو بەری شەقامەکە ڕادەوەستین و زۆر چاوەڕوان ئەبین، بەڵام ئێوەی شۆفێر چــواری هەڵناکەن و خاوی ناکەنەوە، ئێمەش دەترسین و ناوێرین بپەڕینــەوە، یارمــەتیمان بــدەن، بــە هــۆڕنی دەنــگ زل دامــان مەچڵەکێنن، تەنانــەت شــەو لەخەونیــشماندا ڕادەپەڕین، ئەوە ئێوە گەورەو شارەزان بۆیە پەڕینەوەی شــەقامتان بــەلاوە ئاسانە، بــەڵام لای ئێمــە وەکــو پەڕینــەوە لــە دەریــا وایــە، بــەزۆری ئێمــەی منــاڵ پێکــەوە دەپەڕینەوە، ئەگەر یەکمان پەڕیەوە، پەلەمەکە، ئەوانی تریش دێن، بەبەزەیی بە، تۆش مناڵ و کەس و کارت هەیە، بەقسەی ئــەو کەسانە پەلەمەکە، کە لەگــەڵتان لەناو ئوتومبیلەکەتدا، پەلەمەکــە، وا باشــە خــولێکی پــەروەردەیش ببینــی و مــافی مناڵیش بزانی.

## دایە.. هاوکاری، کاری ناو ماڵت دەکەم...!

کــە جاروبــار بــەوردی تەماشــای نــاو ماڵــەوەمان دەکــەم، دەبیــنم هــەموو شتەکان بــەجوانی و خــاوێنی لــە جێــی خۆیانــدان، هــۆی ئــەوەش دەگەڕێتــەوە بــۆ دڵسۆزی و ماندویی تۆ دایەگیان.. لەگەڵ بابە و گــەورەکانی تــری نــاو خێزانەکــەم، هــەموو ڕۆژێ لــە ژوری چێــشتخانە دەتبیــنم کــە چــەندە مانــدوی لــە پێنــاوی ئامادەکردنی چێشت و خواردن بۆ ئێمە، منیش ئەگەر چی منــاڵم و هێشتا توانــای کاری گەورەم نیە و کاتی ئەوەشم ئەهاتوە دەستکاری ئاگر بکــەم، بــەڵام لــە دڵــەوە

زۆر حەز دەکەم یارمەتیت بدەم، دایەگیان کە لەگەڵ هاوڕێکانمدا خەریکی یاری و ماڵە باجێنە دەبم هەمیشە باسی خواردن و چێشتە خۆشەکانی تۆ دەکەین، بۆن و بەرامەکەی لە بیر ناکەین، دەمەوێ یارمەتیت بدەم کە چی تۆ هەموو جارێ پێم دەڵێیت : لاچۆ، ئەوە ئیشی تۆ نیە، خۆم دەیکەم تۆ بڕۆ کۆشش بکەو بخوێنە..! ئیتر منیش تەریق دەبمەوە شەرم دەکەم و ڕووم نایات بڵێم دایەگیان حەز دەکەم یارمەتیت بدەم، هەر خۆشم و چێژ لەوە دەکەم کە بجوڵێم و بەشداریت بکەم، نابێ من هەمیشە هەر سەر بەسەر کتێبەکانمدا بگرم، پێویستە ناو بە ناو پشوو بدەم و فێری کاروباری ناو ماڵیش بم، دایەگیان کاری قورس و گرانم بە زۆر پێ مەکە، بەڵام ڕێگەی ئەو یارمەتیانەشم لێ مەگرە کە دەمەوێ هاوکاریت بکەم و خۆیشم پەراوەی فێر بوون بکەم، ئەی خۆ لە بەرنامەی کاروباری ڕۆژانەمدا خۆتان بۆتان داناوم کە ڕۆژانە (٣٠ – ٦٠) خولەك یارمەتیتان بدەم، حەز دەکەم دەستخۆشی کارەکانم بکەیت و ئەگەر قاپ و پەرداخیش بە دەستمەوە شکا لێم توڕە مەبە، چونکە منی منداڵ تا فێری شۆردنی (٣٠) قاپ دەبم لە وانەیە دوان سیانێك ببنە قوربانی تۆو باوکم، لای خزمان و میوانەکان بە سەرمدا هەڵدەو بەباشی باسم بکە، قەیناکە با خۆیشم لە وێ بم، بەوە هان دەدرێم و لە خۆم بایی نابم، بەڵکو متمانە بەخۆم دەکەم و کە سێتیەکی بوێرو نەترسم بۆ دروست دەبێت، من وەك حەز ئیش دەکەم، حەزم نەبێ، بەزۆر پێم مەکە باشە دایەگیان، مەرج نیە ئەو کاتەی تۆ ئیشت هەیە من حەزم لە ئیش کردن بێت، لەوانەیە ئەو کاتە حەزم لە ئیش کردن بێت کە تۆ ئیشت نیە، بەڵام قەیناکا هەر چۆنێك بێت لەوکاتەدا کە من حەزم لە ئیشە ئیشێکم بۆ بدۆزەرەوە، نەك ئەو کاتەی کە خۆت حەزت لێیە، یان کارو ئیشت هەیە، ئەگەر ئیشکێت پێ وتم و نەمکرد توڕە مەبە، چونکە هێشتا من نازانم کە ئیش و کاری ماڵ پێویستیە، وا دەزانم بۆ حەزە، وەکو ماڵە باجێنە وایە.

# بابه گیان.. بمبه لەگەڵ خۆت..!

به زۆری بابه گیان تۆ دەچیته دەرەوەی ماڵ، منیش کوڕ بم یان کچ نابێ هەر له نێوان چوار دیواری ماڵەوە دا بژیم، ڕاسته تەلەفزیۆن هەیە، بەڵام خۆ تەلەفزیۆن هەندێ جار مرۆڤەکان دەکات بەبت، هەر ئەو قسە دەکات و بینەر گوێ دەگرێ و تەماشا دەکات، تەلەفزیۆن شاشەیەکی شوشەی مردوە و سڕو کاسی کردوم، وەك تلیاکخۆر هۆگری بووم، تکایە پێش ئەوەی دەست و قاچ و چاوو مێشکم لە دەست بدەم لە تەلەفزیۆن دورم بخەرەوە، بەتایبەتیش لەو فیلم و بابەتانەی کە پەیوەندییان بە تەمەنی منی منداڵەوە نیە، تۆو دایکم دەچنە دەرەوە، دنیای دەرەوەی شاشەی TV دنیایەکی سروشتی و زیندوە، دەتوانی بجوڵێی، قسە بکەی، بڕۆی، وردبیتەوە، لەبەر ئەوە تکایە جاروبار لەگەڵ خۆت بمبەرە دەرەوە، باشوێنان شارەزابم و خەڵکی بناسم، ئەگینا سبەینێ وەك ڕۆبۆتم لێ دێت، لایەنی پەروەردە و گەشەی کۆمەڵایەتیانەم لاسەنگ دەبێ، فێر نابم لەگەڵ خەڵکی هەل بکەم و بە ئاسانی ڕانایەم لەسەر هۆگر بوون و چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکی بمبە با ژیان وەکو خۆی ببینم، بابزانم ژیان هەمووی شادی و خۆشی نیە، خەڵکی لە جۆرەها تەمەن و سروشت و شێوەدان، گریان و پێکەنین هەیە، جوانی و ناشیرینی هەیە، مرۆڤی چاك و هی خراپیش هەیە، ئاگر هەیە ئاو هەیە یاسا هەیە لە دایك بون و مردن هەیە، بمبە بابزانم تۆ لە دەرەوەی ماڵ چی ئەکەی؟ چۆن کار ئەکەی؟ کێ ئەتناسێ و کێ ئەناسی؟ منی منداڵ زۆر سوود لەم چونە دەرەوەیە وەردەگرم، وەك خولی ڕاهێنان و فێرکردن وایە گوێ مەدەرێ با ئارەق بکەمەوە، گەرماو سەرمام بێت، با پێڵاوەکانم تۆز زاوی بێت..، بمبە با زمانم بپژێت، با فێری ئەدەب و هونەری ژیان و شێوازەکانی قسە و هەڵسوکەوت بم، زۆر خەم مەخۆ کە جاروبار کەوتم، یان وردە هەڵەم کرد، بمبە با

ژیان خوی فێرم بکات، نابێ ژیان تەنها هەر لە تۆو دایکمەوە فێربم، جیهان قوتابخانەیەکی گەورەیە. (کات) مامۆستای هەموومانە، ناسك و نازدار فێرم مەکە، با زبریەکانیش ببینم بۆ ئەوەی کە گەورە بووم بەرگەی ئەو زبریانەش بگرم.

بمبە...! بمبە...! توخوا بمبە....!

## دایە گیان.. توخوا نایەم بۆ پرسە..!

هەر کە هەواڵی مەرگی کەسێکت پێ دەڵێت , دایەگیان تۆ خەم دەخۆی و منیش دەترسم، بەڵام تا ئێستا ئەم ڕاستیەم پی نەگوتیت، خۆ من دەزانم کە هەموو کەسێك دەمرێت و دەفڕێت بۆ لای خوا گیان، ئەوە نەبوو پار باپیرەم فڕی و ئێمەش پرسەمان بۆ دانا، هەمووماں زۆر گریاین، بەڵام نەگەڕایەوە.

دایە گیان! نەبوو ئەو ڕۆژە لەگەڵ خۆت بردتم بۆ پرسەی باجیەکەی دراوسێمان، من حەزم نەدەکرد لەگەڵتدا بێم، بەڵام تۆ وتت ڕۆڵە گیان ئاخر نابێ تۆ بە تەنها لە ماڵەوە بیت، منیش بەقسەی تۆم کردو هاتم، ئەوە بوو هەر لە دورەوە گوێمان لە دەنگی گریان بوو، خەڵێکی زۆری لێ بوو، هەموویان جل و بەرگی ڕەشیان لەبەردا بوو، کەس پێ نەدەکەنی، زۆر بەلامەوە ناخۆش بوو، چونکە ئێمەی مناڵ هەمیشە حەزمان لە جم و جوڵ و یاری و پێکەنینە، کە چی هیچ کام لە وانەی لێ نەبوو، مەلاکە بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێند، زوربەی ژنەکان هەر لەگەڵ یەکتریدا قسەیان دەکردو بێ دەنگ نەدەبوون، لەناکاو ژنێك هات و بورایەوە و کەوت بە زەویدا، ژنەکان ئاوی ساردیان کرد بەسەریاو دو پیاویش ئوتۆمبیلێك پاڵیان خست و بردیان بۆ نەخۆشخانە، منیش لە ترسانا هەر دەستم بەتۆوە

دەگرت، دایە گیان تەماشایەکی تەمەنی من بکە و لە دوو سێ کەسی ژیر و گەورە بپرسە ئاخۆ تەمەنی من بۆ پرسە ئەبێ؟ خۆمن هێشتا ساوام و سەرمژن نیم، من لای باوکم دابنێ لە ماڵەوە، ئەوسا خۆت بڕۆ بۆ پرسە، من نامەوێ دڵتەنگ بم و ترس دامپۆشێت، ئەگەر وابێ ئیتر ترس ناهێڵێ کەسێکی ئازاو بوێربم، جگە لەوەش هەمیشە بێزار و ماف خوراو دەبم، تۆ مافی ئەوەت نیە ژیانی پڕ لە چێژی منالّیم لێ تالّ بکەیت، نابێ لەم تەمەنەمدا منیش ببرێم بۆ پرسە، لەبەر ئەوە دایەگیان بیرت نەچێ، من بە زۆر نەبەیت.

بمبە...! بمبە...! توخوا بمبە....!

## دایکە.. باکلیلی خۆم پێ بێت..!

هەموو جارێك کە دەرگای دۆلاب و لۆکەرەکان بە کلیلەکەت دەکەیتەوە من زۆر بەلامەوە سەیرو خۆشە، چونکە بەهۆی ئەو کلیلەوە شتە نادیارو هەلگیراوەکان دەردەکەون، وەك ئەوە وایە شتێکی تازەمان کڕیبێ بە تایبەتیش کە میکانۆ و بوکەڵەکان دەردەهێنیت، دایە گیان من حەز دەکەم گەمە و یاریەکانم لای خۆم بێت، خۆ ئەگەر لەناو تاکی دۆلابی داخراو دابن، کەواتە هی من نین، تۆ بۆ چی لێم تووڕە دەبی کە یاری بەو شتانە دەکەم و بەناو ماڵدا بلاویان دەکەمەوە؟ ئاخر هەموو جیهانی من تەنها ئەو ڕۆژەیە، چێژ لە بلاو کردنەوەی کەل و پەلی یاری دەکەم، بەلام هەموو جارێ تۆ تەریقم دەکەیتەوە و ناهێڵی بە ئازادی یاری بکەم، من لە ڕێگەی یاریەوە زمانم دەپژێ و قسە لەگەڵ بوکەڵەکانم دەکەم، خانو دروست دەکەم وتێکی دەدەمەوە، بەوەش فێری زۆر شتی نوێ دەبم، باوەڕ بەخۆ بونم زیاد دەکات، بەتایبەتیش کاتێك لەگەڵ هاوڕێکانم دا یاری دەکەم،

یاری بەشی سەرەکی ژیانی ئێمەی منداڵ، ژیادمان لێ تاڵ مەکەن، وازمان لێ بهێنن باتێر بین لەیاری، دوایی کە وەکو ئێوە گەورە بوین ئیتر نا پەرژێینە سەر یاری و تام و چێژی یاری، ئێمەی مناڵ یاری بە ژیان دەکەین، بەڵام کە گەورە بوین ژیان یاریمان پێ دەکات. دایە گیان..! زۆر حەز دەکەم کلیلی خۆم و ژورەکەم، لۆکەرو دۆڵابەکەم لای خۆم بێت، کەچی ئێوە دەستتان بەسەر هەمووی داگرتوە، تەنانەت ناتوانم بە ئازادی سەیری ئەلبومەکەی خۆیشم بکەم، هەندێ جار بەملاو لادا ئەرۆی و من لە ماڵی دراوسێکان بەجێ دەهێڵیت، ئەوە کارێکی باش نیە، متمانەم پێ بکە و فێرم بکە کە لە ماڵ دەرنەچم و کلیل لای خۆم بێت، پێبوونی کلیل بە ئێمەی مناڵ متمانەمان دەداتێ، بەمەرجێ تەمەنمان لەو ئاستەدا بێ حەز دەکەم کلیلێکم پێ بێت، هیچ نەبێ کلیلی جانتاکەی خۆم، ئەگەر کلیلم هەبێ کەواتە فێری کردنەوەی دەرگاکانی ژیان دەبم و هێندە چاوەڕێی گەورەکان نابم دەرگاکانم بۆ بکەنەوە.

ڕاستە من ژووری خۆم هەیە، باکلیلی ئەو ژوورەیشم لەلای خۆم بێ بەڵام با بەجانتاکەمەوە قایم کرابێ لە دیوی ناوەوە تاکو لێم نەکەوێت، تۆش زوو... زوو... سەردانم بکە کە لە ژوورەکەمدام و لێم بێ ئاگا مەبە موبایل و ئەنتەرنێت بۆمن شیاو نیە، نابێ بە ئارەزووی خۆم سەیری کەناڵەکان و سەتەلایت بکەم، لەبەر ئەوە با ئەو شتانە لەژورەکەمدا نەبێ، لە کۆڵ خۆتم مەکەرەوە بەو شتانە چونکە دوایی زیانی گەورە بەرەفتارو پەروەردەکەم دەگات، دەکرێت بە ئامادەبوونی خۆت ئەمانە بەکار بهێنم تاکو سوودیان لێ وەربگرم و فێری بەکارهێنانیشیان ببم

# مامۆستا گیان... جانتاکەم زۆر قورسە..!

دوێنێ کەمێك نەخۆش بووم، دایکم لەگەڵم هات تا دەرگای قوتابخانە و هەر ئەویش جانتاکەی بۆ هەڵگرتبووم، کە گەڕامەوەماڵەوە دوای تەواو بوونی دەوامی ئەو ڕۆژە، دایکم بانگی کردم وتی : ئا دەی ڕۆڵە گیان جانتاکەتم بۆ بێنە، منیش بۆم برد، هەموو کتێب و کەل و پەلەکانی لێ دەرهێنا و بە بەتاڵی جانتاکەی هەڵسەنگاندو وتی بەڕاستی جانتایەکی سووك و تەنکە، قورس نیە، وا بزانم قورسایی کتێب و دەفتەرەکانتە، منیش بە زمانی حاڵی خۆم پێم گوت :

دایە گیان، تاکو ئێستا دوو سێ جار بە مامۆستامان وتوە کە کتێبەکانمان زۆر گەورە و پانن، لاپەڕەکانیان زۆرە، هەندێ کتێب لە دوو کتێبی تر پێکهاتوەو دەفتەریشی هەیە، کە چی ئەو وتی : ئەمە سستمی نوێی خوێندنە، ئێوە کتێبەکانتان زۆر جوان و ڕەنگاو ڕەنگن، لە ڕاستیدا مامۆستا گیان ئێمە سوپاسی وەزارەتی پەروەردە دەکەین کە سستمی گۆڕیوە، کتێبەکان ئەگەر چی جوانن، بەڵام زۆر قورس و گرانن جایان لۆکەرو دۆڵابمان لە پۆلدا بۆ دابنێن تاکو کتێبەکان دوای دەوام لەو خانانەدا داینێن و کلیل لای خۆمان بێت، یان هەریەکە لەو کتێبە گەورانەمان بۆ بکەن بەچەند بەندو بەشێکی بچوك، شان و قۆڵمان شکابەو کتێبە قورسانە، کە گەورە بوین زیانەکانی ئەو ئەرکە گرانەمان لێ دەردەکەوێ لە چەمانەوەی پشت و ئارەقە و با پەڕیی و بڕبڕەکانی پشت و ملمان، لە هەندێ وڵاتدا باوی کتێب نەماوە هەمووی لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوەیە، یان بە CD و فلاشە، ڕاستە جارێ هێشتا ئێمە ماومانە بۆ ئەو تەکنۆلۆژیایە، بەڵام خۆ ناکرێ ئێمەش بەم منداڵییەمان کۆڵ هەڵگر بین، تکایە چارەیەکمان بکەن مامۆستا بەرزو بەتواناکان،خەممان بخۆن و بەزەییەکتان بەشان ملی ئێستا و کەسێتی ئایندەماندا بێتەوە، مامۆستا تۆ گەورەیت و گوێت لێ دەگیرێت تکامان بگەیەنە شوێنی پەیوەندیدار تکایە.

# دایە....! ئیتر منداڵ نیم

شەوێکی زستان بوو کاتژمێری ژورەکەم نزیك بوومەوە لە (١٠) ی شەو، لەسەر سیسەمەکەم پاڵ کەوتم، چەندە بەلامەوە ناخۆش بوو کە دیسانەوە دەبێ بخەوم خەوتنیش واتا دابڕان لەم جیهانە، ماڵئاوایی کردن لە ڕەنگە جوانەکان، داخستنی دەرگای چاوەکان، بێ ئاگابوون تا سپێدەی بەیانی، هەموو ئەرکەکانی قوتابخانەم تەواو کردبوو، زۆر حەزم دەکرد کە سێك هەبوایە کە هەندێ گوێم بۆ بگرێت و وەڵامی پرسیارەکەڵەکە بوومکانی ناخی دەروونم بداتەوە. گەلێك جار دەمویست بۆ دایکم ئەم قسانە بکەم، بەڵام هەرجارەی بیانوویەکی دەهێنایەوە و دەیگوت : ڕۆڵە جارێ کاتی ئەو قسانە نەهاتووە، تۆ منداڵی دوێنێت، وەکو منالی و تەمەنی ئێستای خۆت بیر بکەرەوە و پرسیار بکە، بازوو پیر نەبیت و وەکو منت لێ نەیەت، ئیتر دەمم دادەخست و پرسیارەکانم هەڵدە لوشیەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتبوون.

بڕیارمدا کە سبەینێ هەندێ پرسیار ئاڕاستەی دایکم بکەم، بەڵام هەر چەندم ئەکرد نەم ئەزانی چۆن و لە کوێ وە دەست پێ بکەم، وامدانا کە پشتیکەم دایکەمە، لەسەر سستمەکە لە بەرانبەر خۆم ڕاموەستاندو کە و تمە پرسیار لێکردنی و هەر خۆیشم لە جیاتی پشتیە بەستەزمانەکە وەڵامی خۆمم دەدایەوە :

دایە گیان : ڕاستە هەتا هەتایە من هەر منالم لە بەرانبەر تۆدا، بەڵام خۆ تۆش لە ئاستی دایك و باوکی خۆتدا هەر منالیت، من ئێستا تەمەنم حەڤدە ساڵە، خۆم ناناسم، نازانم ئایا منالم یان گەورەم؟ تۆ لە دەرەوەی منیت و هەستم پێ دەکەیت، کە چی تۆش وەڵامێکی ڕوونم نادەیتەوە، کاتێك داوای شتێکت لێ دەکەم ئەگەر پێەوێ نەیکەیت دەڵێیت هێشتا منالیت، بەڵام جاری واش هەیە دەڵێت : ڕۆڵە گیان عەیبە خۆ تۆ گەورەیت!

زۆر پرسیارم لە دایە پشتی کرد و هەر خۆشیم وەڵامم دەدایەوە، تا خەوم

لێ کەوت، بەیانی کە بە ئاگا هاتم، هێشتا زرنگەی مێشکم دەهات لە پرسیاری سەیرو سەمەرە و لە کورت ترین دێڕدا وەڵامی هەموو پرسیارەکانم دۆزیەوە، ئەویش ئەو ڕستە جوانە بوو کە توێژەری کۆمەڵایەتی قوتابخانەکەمان لەسەر تەختە سپیەکە نووسیبوی : (پرسابە و دانابە)، بەڵام مەرج نیە وەڵامی هەموو پرسیارێك تەنها لای خۆت هەبێ، تێگەیشتم کە دایکم ڕاستە، بەڵام دەبێ ئەوەشی بیر نەچێ کە هەمیشە هەر بە ژێری منالیم نازیم.

دەبێ دایك و باوکم لەگەڵ گەورە بوونی تەمەنمدا شێوازی هەڵسوکەوتی خۆیان لەگەڵمدا بگۆڕن، ئێستا من هەرزەکارم دەیان گرفت و کێشەم هەیە، سەدان پرسیارم لەلا دروست بووە، پێویستە وەڵامەکانم دەست بکەوێت، جا ئەگەر دایك و باوکم وەلامم نەدەنەوە ئەوا لە خەڵکی تر دەپرسم لەوانەیە ئەوانیش بەڕاستی وەلامم نەدەنەوە و تێرم نەکەن لەبەر ئەوە گوێم بۆ بگرن لەگەڵ باوکم و وەڵامم دەوێ... وەڵام...!

## دایە....! لە بیرکاری تێگەیشتم

دەمە و ئێوارە بوو، ئاسمان تاکو تەرا هەوردایپۆشی بوو، هەورەکان سپی و سوڵ بوون وەك بەفرو لۆکە، هەریەکەیان لە شێوەی شاخ و گیاندارێکدا وە دەهاتنە بەرچاو، هەندێك لە هەورەکانیش ڕەش و بۆر بوون، پڕ پڕ بوون لە هەڵمی پڕو باراناو، جاروبار خۆر دەردەکەوت و ون دەبوو، چاو شارکێی لەگەڵ منداڵاندا دەکرد، لەناو پێخەفی هەورەکاندا دیار نەدەماو دیسان تیشك بارانی دەکردینەوە، دیمەنی لادێکەمان زۆر جوان بوو، سەر لوتکەی چیاکان بەفر، بنارەکان بە چیمەنی سروشتی داپۆشراو بوون، بەفرو بارانی نم نم و هەتاو تێکەڵ دەبوون باوکم لەناو باخەکانی خوار گوندەکەمانەوە وردە.. وردە.. بەرەو ماڵەوە دەهاتەوە، منیش لەگەڵ هاوڕێکانم ماڵاوایم کردو کۆتاییمان بە یاری ئەو ڕۆژە هێنا، بۆن و بەرامەیەکی خۆش دەهات، بۆنەکە لە بۆنی نانی برژاو دەچوو،

چوومە نزیکی تەندورەکە، دایکم لەگەڵ ژنە دراوسێکاندا کولێرەیان دەکرد.

لە دوورەوە هاوارێکی خۆشم بۆ دایکم کرد : دایە گیان کولێرەیەکی گەرم و گوڕم بدەرێ، با منیش مژدەیەکی خۆشت بدەمێ بەدەم کولێرە خواردنەوە بە گوێچکەی دایکمدا چرپاندم : دایە گیان ئیتر ئەتۆ خەم دەخۆیت و ئەمن بێزار دەبم، چونکە ئەمڕۆ بە تەواوەتی لە بیرکاری تێگەیشتم، مامۆستاش سەرسام بوو بوو، دایکم گوتی : ئافەرین ئەدی ڕۆڵە شیرینەکەم.. ئەبوو پێم دەگوتیت : لە بیرکاری تێبکۆشە تێدەگەیت، ئیدی هەرگیز بیرت ناچێتەوە، مێشکی هەموو کەسێك بۆ بیرکاری گونجاوە.. ئیتر لەمەولا شیکار کردنی پرسیاری بیرکاری وەکو خواردنی کولێرەی گەرم و گوڕی سەر تەندوری داری ئەم لادێ جوانە بەتام و چێژ و ئاسانە، با پێت بڵێم : منیش وا بووم لە بیرکاری تێنەدەگەیشتم، بەڵام کە مێشکم بۆ کردەوە بە ڕادەیەکی زۆر باش فێر بووم و تا ئێستاش بەلامەوە خۆشترین وانەیە.

دایەگیان.. بڕیار لای مرۆڤ خۆیەتی.. ئەگەر نەتەوێت تێبگەیت، ئەوا تێناگەیت، ئەگەر بتەوێت تێبگەیت ئەوا تێدەگەیت، بەڵام ویستی تێگەیشتنەکەش هەوڵ و کۆشش و بیرکردنەوەی دەوێت. من بیرم کردەوە، دوایی تێکۆشام بۆ تێگەیشتن بەپێی بیرکردنەوەکەم... لەبەر ئەوە لە کۆتایی دا تێگەیشتم.

# باوکە....!
# حەز دەکەم هاوڕێم بیت

هەموو شەوێك بەر لە خەوتن، باوکم یان دایکم چیرۆکێکی خۆشمان بۆ باس دەکەن، جا یان بیستوویانە، یان خوێندویانەتەوە، یاخود بە ڕاستی بەسەر خۆیان هاتووە... چیرۆکەکەی دوێنێ شەو زۆر خۆش بوو، حەز دەکەم بە کورتی بیگێڕمەوە :

هە موو لە ژوور سەری بابە کۆبووینەوە، باوکم دەیزانی چیمان لێی دەوێت، بۆیە گوتی : ڕۆڵەکانم چیرۆکی ئەمشەومان ڕوداوێکە، کە بە ڕاستی بەسەر خۆم هاتووە...، ئێمەش دامانە قاقای پێکەنین و چەپڵەیەکمان بۆ باوکمان لێداو گوێمان شل کرد، فەرموو بابە گیان!

لە تەمەنی سیازدە ساڵیدا بووم، باوکم هەمیشە هەر ئامۆژگاری دەکردم، هەقی هەموو شتێکی منی هەبوو، دەیویست من کە سێکی زۆر باش و زیرەك و خاوێن و ژیرو دەروون پاك بم، تەنانەت نەیدەهێشت زۆر تێکەڵاوی منالانی گەڕەکەی خۆشمان بکەم، منیش زۆر حەزم دەکرد هاوڕێم هەبێت و وەکو هاوتەمەنەکانم بژیم، دابڕاو و دورە پەرێز نەبم کە چی باوکم دەترسا کە پەروەردە کردنەکەی تێك بچێت، نەمدەزانی بە تەنها لە ماڵەوە چی بکەم، لە هەموو شتەکانی ماڵەوە و یاریەکان بێزار ببووم، سەیر لەوەدا بوو کە باوکم خۆیشی تەنها یەك هاوڕێی هەبوو، ڕۆژێکیان گوتم : بابەگیان.....! هەر چیەکت گوتووە من لە قسەت دەرنەچووم ئایا دەتوانم داواکاریەکت پێشکەش بکەم؟ باوکم : بە چاوان ڕۆڵەگیان منیش بە نەرمی گوتم : بابە گیان من لە هاوتەمەنەکانم دابڕاوم و چێژ لە ژیانم ناکەم، تۆش نا هێڵیت هاوڕێم هەبێت، لەبەر ئەوە داوات لێ دەکەم کە خۆت ببیت بە هاوڕێم، باوکم بە توندی باوەشی پێدا کردم و ماچی کردم و گوتی : ڕاست دەکەی ڕۆڵەی شیرینم، من هەڵە بووم، دەتوانم وەکو هاوڕێ لەگەڵتابم، بەڵام ناتوانم جێی هاوڕێت بۆ بگرمەوە، ئیتر لە دوای ئەوەوە باوکم

ڕێگەی پێداو و منیش تەنها دوو هاوڕێم هەبوو، کە خۆتان هەردووکیان دەناسن نەك هاوڕێکانم ڕەوشتی منیان تێك نەدا، بەڵکو من توانیم بیانکەمە کەسانێکی زۆر باش و نمونەیی و ڕەوشت بەرز.

من بۆیە حەزم کرد باوکم هاوڕێم بێت، چونکە دەزانم کە باوکم ئەزموون و شارەزایی زۆرە و دڵسۆزە لە پەروەردەکردنی منداو نایەوێ بکەومە هەڵەوە، بەڵام مەرج نیە هاوڕێکانم وابن لەبەر ئەوە چێژ لە هاوڕێیەتی هاوتەمەنەکانم وەردەگرم و لە حیکمەت و ڕێنماییەکانی باوکیشم لانادەم.. دایکم و باوکم یان بەخێوکارەکەم خەمی من دەخۆن بۆیە لە ژێر چاودێری و پرس و ڕای ئەواندا هاوڕێ هەڵدەبژێرم و هاوڕێیەتی (١ – ٢) کەسی باش دەکەم، کە فریای هاوڕێیەتییان بکەوم.

# مامۆستا گیان....!
# حەز لە وێنەکێشان ناکەم

هەنار کە قوتابیەکی زیرەکی پۆلی هەشتەم بوو، دوای نان خواردنی ئێوارە، چووە ژورەکەی خۆی بەمەبەستی کۆشش و ئامادەکردنی وانەکانی بەیانی، هەر کە تەماشای خشتەی ڕۆژانەی کرد و چاوی بەوانەی سێهەم کەوت، خەندە و هیوا گەشەکانی سەرلێوی کوژایەوە و چاوەکانی داخست و کەوتە بیرکردنەوەیەکی قووڵ، لەگەڵ خۆی دەدواو دەیگوت :

ئاخ.... دیسان.. بەیانی یەك شەممەیە، چەند خۆش بوو ئەگەر ڕۆژەکانی هەفتە یەك شەممەی تێدانەبوایە..! یان من قۆناغی قوتابیبوونم تێپەڕاندایە..! فیلمەکەی بەیانیم لەبەر چاوە، دوای پشووی وانەی دووەم، زەنگی وانەی سێهەم سەرو مێشکم کاس دەکات، زەنگ لێ دەدرێ بۆ ژوری ئەشکەنجەدانی من، دنیا لەبەر چاوم دەگۆڕێ، تەنانەت ڕەنگی پانکە و گڵۆپەکانی ژوری پۆل، جیڕەی دەرگاکە، بۆنی هەناسەی خۆم، ڕقم لە هەموو ئەو شتانە دەبێتەوە کە تاوانەی

دووەم خۆشم دەویستن، ڕاستە کاتژمێری پۆلەکە چرکە چرک دەکات، بەڵام وا هەست دەکەم کات وەستاوە و میلەکەی ناجوڵێت.

مامۆستای وێنە دێتە ژوورەوە، دوای ڕۆژ باش هەندێ قسەی خۆش دەکات بەرووبەکەوە کە هەندێ لە هاورێکانم دەڵێن : بە ڕوبەکی خۆشەوە قسەی خۆش دەکات، بەڵام من هەست بە وانە ناکەم، دەفتەرەکانتان دەربێنن، بابزانین کێ لە ئێوە وێنەیەکی جوانی نەخشاندوە..! دەگەڕێت، تا دەگاتە نۆرەی من، منیش جوانترین وێنەم کێشاوە، بەڵام مامۆستاکەم باوەڕم پێ ناکات کە خۆم کردبێتم ئینجا وێنە ناکۆکەکانمی نیشان دەدەم، دیسان دەڵێت : ئەوانە کە وێنەن؟ هەنار فیلمی بەیانیەکی نەهاتووی لە خەیاڵی خۆیدا لێدەدا.. هەر چۆنێك بێت مۆڵەتی لێ خواست و نەچووە پۆلەوە، چوو بۆ ژوری توێژەرەکەیان و کێشەکەی خۆی بۆ باس کرد : بەرێزم من زۆر دەستڕەنگینم لە وێنەکێشاندا، بەڵام حەز و ئارەزووم لێی نیە، لە وانەکانی تردا زۆر بەتوانام و نمرە و مامۆستاکانم ئاگادارن، ئایا هیچ لەوە ناخۆشتر هەیە شتێکت پێ بکەن کە ئارەزوت لێی نەبێ؟ توێژەرەکە لە کێشەکەی تێگەیشت، ئەو یەك شەممەیەش تێپەڕی و شەو داهات، هەموو بیرکردنەوەکان کۆبوونەوەو بوون بە خەونێکی خۆشی هەنار، لەخەویا بڕیارێکی وەزارەتی پەروەردە دەرچوو بوو کە دەیگوت : هەڵبژاردنی وانەی مەبەست بەشێکی زۆری دەکەوێتە سەر خواستی قوتابی خۆی و ئەوانی دیکە دەبنە تەواوکەری پاشکۆی پەراوێز بەند، کە بەئاگا هاتەوە هێشتا یەك شەو بەسەر ڕۆژی یەك شەممەدا تێپەڕیبوو...!

# ژیاننامەی پەروەردە ناسێکی جیهانی

توێژەرو نوسەرو زانایانی پەروەردەناس فریشتە ئاسا بەردەوام کار دەکەن وەك نمونەیەك لێرەدا ئەم کورتە باسە دەخەینە ڕوو :

(کۆنفۆشیوس) ناوی ڕاستەقینەی بریتیە لە (کۆنغ – فۆ – تسۆ) لە دەوروبەری ساڵی (٥٥١ پ. ز) لە دایکبووە، لە هەرێمی (شتۆنغ) ی وولاتی (چین)، زانیاری تەواو دەربارەی ژیانی لەبەرەستدا نیە، گەلێك وتە و حیکمەت دراوەتە پاڵی و زۆرێکی تریش لەناو چووە، دوور نیە باوکی سەرباز بوو بێت، (کۆنفۆشیوس) خۆیشی بەرپرسێکی فەرمی حکومەتی هەرێمەکەی بووە، کەسێکی بیر تیژو مرۆڤ دۆست و داناو خۆپارێز بووە، ئەدەبی چینی کۆنی خوێندووە زۆر پابەندی حیکمەتی پێشینەکانی خۆی بووە، لەسەردەمی ژیانی ناوبراودا (چین) لە قەیرانی هەژاری و پشێویدا ئەژیا، چینی ئەستۆکراتی فەرمانڕەوایی وولاتیان ئەکرد، (کۆنفۆشیۆس) هەمیشە لە خەمی ئەوەدا بووە کە وولات ئارام و خەڵکی ئاسودە بێت و پەیوەندی دەسەلآتداران و جەماوەر پەیوەندییەکی ئاشتیانە بێت و توند و تیژی بنبڕ بکرێت، بەلآم لەو چاخەدا کەس بایەخی بە بۆ چونەکانی ئەو نەئەدا و پێیان وابوو کە ئەو لە خەیاڵدا ئەژی.

(کۆنفۆشیوس) سەر لەنوێ کەوتە توێژینەوەی حیکمەتی دێرینی گەلی چین و دارشتنەوەی پراکتیزەکردنی و بەرگێکی نوێی بەبەر ژیاندا کرد و بەردەوام لە هەوڵ کەمکردنەوەی ئازارو کوێرەوریەکانی گەلەکەیدا بوو، خودی خۆی قسە و بیرو بۆ چوونەکانی خۆی کۆنە ئەکردەوە، بەلآم کەسانی دەوروبەری بە پەرۆشەوە ووتەو بۆ چوونەکانیان ئەنوسی. کە ئێستا کراونەتە چەند کتێبێکی قەوارە گەورە و وەك دەستوری کەلتوری چین لە قەڵەم ئەدرێ.

وا دەر ئەکەوێ فەرمانڕەوایی هەرێمێکی کردبێت و لە ماوەی دەسەلآتیشدا کەوتە ڕێگرتن لە دیاردەی دزی و جەردەیی و کەمکردنەوەی باج و باشکردنی گوزەرانی خەڵك و هاندانی دەسەلآتداران بۆ بەرهەمهێنانی زیاتر لە

وولاتدا. وا ئەگێڕنەوە کە کراوە بە وەزیر، ئەم پلە و پایەیشی کاری بۆ ئاسان کردەوە تاکو ئاشتی و تەبایی لەناو خەڵکدا ببوژێنیتەوە و بەشێوەی پراکتیکی جێ بەجێی کردووە، بەڵام بەداخەوە لەو کاتەدا ڕیشەی توند و تیژی و گەندەڵی و زەبرو زەنگ و هەژاری بە جۆرێك ڕەگی داکوتابوو کە هەروا بە ئاسانی بەتەنها بنبڕ نە ئەکرا، بەنا چاری دەستبەرداری کارەکەی بوو لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا کەوتە گەڕان بەناو چین و توێژەکانی خەڵکی وڵاتەکەیدا بەو نیازەی بگاتە دۆزینەوەی کەسێك کەلێی تێ بگات و نرخ و بەهای بۆ چوونەکانی بزانێ، بەداخەوە لە مەشیاندا هیچی دەست نەکەوت و بەهەناسە ساردی لەساڵی (٤٧٩ پ. ز) کۆچی دوایی کرد، دیارە ناخۆشترین کات ئەو کاتەیە کە بەرانبەرەکەت لێت تێنەگات.

دوای کۆچی دوایی خۆی ئەوسا هەست بە گەورەیی و دانایی ئەم پیاوە مەزنە کرا، لەبەر ئەوە پەیڕەوێکی هزری و کۆمەڵایەتی بەناوی (کۆنفۆشیوسی) هاتە ئاراوە، ناوبراو هەمیشە خۆی ئەیگووت : (من هیچ شتێکی تازەم نەهێناوە، تەنها ئەمەوێ حیکمەتی دێرینی گەلەکەم بە ئێوە ڕابگەیەنم)، بەڵام ئەمە کیانی خۆ بەکەمزانی و سادەیی خۆی بوو، ئەگینا لە ڕاستیدا زۆر شتی نوێی داهێنابوو، کولتوری پەروەردە و حیکمەتی دێرینی پوختە و بژار کرد.

چاکسازی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و دادپەروەری خواست و ئاواتی ناوبراو بوو، هەروەك خۆی دەڵێت : (پێویستە هاوسۆز بیت لەگەڵ هەموو شتێکدا، هەموو کەسێکت خۆش بوویێت، بوار بەجێ نەهێڵێت بۆ گەشەکردنی خۆپەرستی، ئەمەش چاکسازیە).

تەنانەت هەندێ کەس دوای مردنیشی کتێب و بەرهەمەکانیان سوتاند، بەڵام دوای ئەوە زۆری نەبرد کە بەپێچەوانەوە وەك زێڕ بە دوای وتە و بۆ چونەکانیاندا ئەگەڕان، بە ڕادەیە کە قوربانی بۆ گیانی بەرزی ئەکرا لە پەرستگاکاندا، هەر وەکو چۆن بۆ مانگ و خۆر قوربانیان ئەکرد.

(٦٠) ساڵ دوای کۆچی دوایی یەکێك لە پیاوە ئاینیەکانی مەسیحیەت

پلەی کۆنفۆشیوسی بەرزکردەوە بۆ پلە و پایەی پیاوانی ئاسمانی، ئەگەر چی (کۆنفۆشیوسی) ئاین نیە و خۆیشی بەو مەبەست و نیازە کاری نەکردووە لەوەش ڕازی نەبووە، بەڵام زۆر بە توندی پەیامەکەی گیرایە بەر تەنانەت خۆی بڕوایەکی زۆری بەخواوەنـدەکان هـەبووە و لـەو بـاوەڕەدا بـوو کـە کاریگـەری دەسـەڵاتێکی گەورەیان بەسەر سروشتدا هەیە و ئاگاداری گیانی پێشینەکانن، ناوبراو ئەیویست ڕێـزی دایـك و بـاوك زۆر بگیرێـت هـەروەها نـرخ و بـەهای خێـزان بزانرێـت و فەرمانڕەوایان دادپەروەر و ئاشتی خواز و مرۆڤ دۆست بن، ئـەبێ هـەموو کەسێك کەسانی تر بەبرای خۆی بزانێت.

بـیرو بـۆ چـوون و ڕێنومایـیـەکانی (کۆنفۆشـیۆس) زیـاتر لـە (٢٥) سـەدە لەمەوبەر دانراون بەڵام تاکو ئێستاش گەبی چین و سەرجەم گەلی جیهان سوود لەو بۆ چوونە کۆمەڵایەتی و پەروەردەییانەی وەرئەگرن.

لە ڕاستیشدا کـاری پـەروەردە دەبێت وابێـت، واتـە دەبـێ کـار بەدەسـتان و دەسـەڵاتدارانی وڵات خـەمی بـۆ بخـۆن و بەرنامـەی وردی بـۆ دابڕێـژن و کـاری بـۆ بکـەن و بەدواداچـوونی وردیـان هـەبێت بـۆ ئـەو کارانـەی لـە بـواری ئـەو پەروەردەکردنەدا دەیکەن.

پـەروەردە تـەنها بـە دایـك و بـاوك و خێـزان و مامۆسـتا ناچـێتە سـەرو سەرکەوتوو نابێت ئەگەر دەسەڵاتێکی گەورەی وڵات و حکومەت پشتیوانی تـەواوی لێ ناکات.

پەروەردە واتا ئامادەکردنی نەوەو وەچەکانی مرۆڤ بۆ ژیان، کـە هـەر ئـەو نـەوەو وەچـانەن کەسـبەینێ دەبنـە ژن و پیـاوی وڵات و کاربەدەسـتانی گـەل و نەتـەوەو حکومـەت بۆیـە دەبـێ حکومـەت خـۆی لـە خـەمی پـەروەردەکردن و پێگەیانـدنی نەوەکانـدا بێـت کـە سـبەینێ دەبنـەوە بـەجێگرەوەی خـۆی تـەنها دیاریکردنی بودجەیەکی زۆرو دروستکردنی بینا بۆ قوتابخانەکان بەس نیە، بەڵکو دەبێ هۆشیاری و عەقڵیەتێکی زیرەکانـەو پـڕ لـە زانسـت و زانیاریـشی لـە پـشتەوە بێـت، کەواتـە بـۆ سـەرکەوتنی پەروەردەیـەکی نایـاب پێویـستمان بـە هۆشـیاری و

زانــست و بودجــه و دڵــسۆزی هەموولایــەك لەگــەڵ پــشتیوانیەکی بــەردەوامی دەسەڵاتی باڵای وڵات لە ڕووی ماددی و مەعنەویەوە سەرەڕای بوونی ئەمانەش بۆ گەلێکی بێ لانەی وەکو کورد چەند ساڵێك لە (کات) یشمان پێویستە.

# کورتەیەك دەربارەی فەلسەفەی پەروەردە

١. **چەمکی فەلسەفە** :

- **پێناسەی فەلسەفە** ١/ توێژەینەوەی ئەزمونێکە بە شێوە گشتیەکەی.

یان توێژینەوەی بە شێکە لەو ئەزموونە لە ڕووی

هەبوونی پەیوەندیەکانیەوە بە (گشتی) یەکەوە

٢/ تێڕوانینــە بــۆ نــاخ و جەوهــەری شــتەکان وەك

خۆیان،

کــە هەولێکــە بــۆ پــەی بــردن بــە ئــەودیوی دیــارو

نادیارەکان

٢. **چەند زانیاریەکی پێویست** :

١. فەلـسەفە، پەروەردەیـە، چـونکە بریتیـە لـە کۆلکەی هاوبەشـی نێـوان هەردوو چەمکی (مــرۆڤ) و (ژیان).

٢. هــەموو کــارێکی چــالاکیەکی پــەروەردەیی، هاوکــات کــارێکی فەلــسەفیە، بــە ڕاتایەکی تر هەموو فەیلەسوفێك پەروەردەکارە و هەموو پەروەردەکارێکی ڕاستەقینەش فەیلەسوفێکی دانایە.

٣. فەلــسەفە ڕێگەیەکــە لــە ڕێگــەکانی (تێڕامــان لــە زانیــاری)، کــە ئەمانــە دەگرێتەوە : (ڕێکخستن، ڕاڤە، ڕوونکردنەوە، ڕەخنەگرتن).

٤. فەلسەفە کاری هەموو کەسێکی ئاساییە، تایبەت نیە بە کۆمەڵە کەسانێکی دیاریکراو، چونکە هەموو کەسێك پرسیاری لەلا دروست دەبێت و هاوکات مــافی خۆشــیەتی بــەدوای دۆزینــەوەی وەڵامــدا بگــەڕێت، دڵنیابێــت بیسەلمێنێت، پاسادانی ڕاستیەکان بکات، هەروەها مافی خۆیـەتی سوود لـە

ژیری خۆی و کەسانی تر وەربگرێت لە پێناوی گەلاڵە کردنی زانیاری و دروستکردنی کەسێتی خۆی.

٥. فیسا گۆرس یەکەم کەس بووە کە وشەی فەلسەفەی ڕاڤە کردوە و دەڵێت لە دوو بەش پێکهاتووە، یەکەم (Philo) کە مانای خۆشویستن و دووەم (Sophia) بە مانای دانایی و حیکمەت دێت.

٦. حیکمەت بریتی نیە لە (معرفە)، بەڵکو تێڕوانینێکی پێگەیشتوانە و تێروتێسەلی بیرو هزرێکی بە توانایانەیە لە (تێگەیشتن، پەی بردن) کە (معرفە) نەیتوانیوە بە تەنها لە بوونی دڵنیا بێت.

*** ئامانج** :

ئامانجی سەرەکی لە توێژینەوەی فەلسەفە، پەراوە کردنی خودی فەلسەفەیە لە جەوهەری مرۆڤەکاندا، بەچەشنێك کە گیانی ڕاستەقینەی هەموو ڕێگەکانمان بێت بۆ گەیشتنی هزرو ژیریمان بە ئاستی کامڵ بوون و پێگەیشتنمان لە سنوری تواناداا.

**سوود** :

ژیان دوبارە کردنەوەی ڕەفتارو هەڵوێستەکانمانە، کە هەموویان خستنە گەڕی توانایەکی ژیری تەواویان پێویستە و سروشتی مرۆڤ وا دەخوازێ کە ئارەزوی زانینی نهێنیەکانی هەیە و دەیەوێت بگاتە دۆزینەوەی واتاکان و هێما گەرایی سیمایەکی دیاری مرۆڤە و بە شوێن ناسودەیی دا دەگەڕێت و خۆی گیرۆدەی گرفت و کێشەکان ناکات و ویستی تەواوکاری هانی دەدات و دەبێت تا ئەو پەڕی سنور ژیری خۆی بفرۆسمێنێت.

کەواتە سوودەکانی فەلسەفە ئەمانەیە :

١. ئارەزووی زانین

٢. بایەخی هێماکاری

٣. گەڕان بە دوای واتاکاندا

٤. ئارەزووی چارەسەرکردنی کێشەکان

٥. هاندان بەرەو تەواوکاری

٦. پێویستی فرۆسماندن (الالهام)

* **چەمکی پەروەردە** :

گەلێك لێکدانەوەی جیاواز هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا بە کورتی چەمکی پەروەردە لە روانگەی (هیپۆرت) ە وە دەخەینە ڕوو :

١. فێرکردن بنیاتنانی مرۆڤە

٢. تێورە پەروەردەییەکان دژنین و پێکەوە کار دەکەن

٣. پەروەردە کارێکی تیۆری و پراکتیکی یە

٤. پەروەردە، بەرهەمهێنە نەك بەکار هێن.

* **پێناسەکانی پەروەردە** :

لەبەر ئەوەی پەروەردە مێژوویەکی دێرینی هەیە، بەپێی جۆری (ژینگە، گەل، کولتور، کات) گۆڕاوە، کەواتە پێناسەکانی پەروەردەش زۆرن، هاوکات بەپێی جۆری کەسەکان و سروشتی مرۆڤ و خەسڵەت و کەسێتی و ئاستەکانیش دیسانەوە جیاوازن، بەڵام هەموو پێناسەکانی پەروەردە لەم بنەمایانەدا هاوبەشن :

١. پەروەردە تایبەتە بە جۆری مرۆڤ.

٢. خزمەتەکانی بۆ تاك و کۆیە

٣. کارێکی بەردەوامی ئامانجدارە

٤. بۆ هێنانە کایەی پێگەیاندنێکی دروستی لەش و ژیری مرۆڤەکانە

٥. جێگەی پراکتیزە کردنی پەروەردە (ماڵ، قوتابخانە، کۆمەڵگە) یە

*** پێناسەی گشتی پەروەردە :**

کارێکی مەبەستدارانەی ئاڵۆزو بەردەوامە، یارمەتی مرۆڤ دەدات لە خۆ گونجاندنیدا لەگەڵ ژینگە جۆراو جۆرەکانی دەوروبەریدا بۆ ئێستا و ئایندە، لە پێناوی مانەوە و گەشە و بەردەوامیدا.

*** ئەرکەکانی پەروەردە :**

١. گواستنەوەی کولتوری ڕۆشنبیری بۆ نەوەکانی ئایندە.
٢. ئەنجامدانی ئاساییکردنەوەی ژیانی کۆمەلایەتی
٣. سەلماندنی گشتیانەی گەشەکردنی بوارە جیاوازەکانی تاك
٤. وەرگرتنی شارەزایی کۆمەلایەتی نوێ، وەك زمان، بەها ڕەوشتیەکان، جوانبینی و.. هتد.
٥. ئاراستە کردن و کۆنترۆڵی کۆمەڵگە

*** ئامانجەکانی پەروەردە :**

پەروەردە چەند ئامانجێکی هەیە (کورت خایەن، درێژخایەن) هەر یەکەلەو ئامانجانەش دوو ڕەهەندی هەیە :

ڕەهەندی یەکەم : هێنانەدی ئامانجی تاکە کەس، واتا پەرەپێدانی تواناکانی تاکە کەس (تاکگیری)

ڕەهەندی دووەم : هێنانەدی ئامانجی کۆمەڵ، واتە پەرەپێدانی تواناکانی کۆمەڵ

بە گشتی.

زانا پەروەردە ناسەكان بوون بەسێ گرووپەوە، هەندێكیان لایەنگری بیری تاككەسین وەكو (كانت، نیتشە)، بەڵام بەشی دووەمیان لەگەڵ پەروەردەی كۆگیریدان، وەك (ئەفلاتون، ئەرستۆ، هێگڵ، جیۆڤانی) گرووپی سێهەم ئەوانە بوون كە ڕەهەندی سێهەمیان دارشت كە هاوبەشە لە نێوان دوو جۆرەكەدا كە بریتی بوون لە (ئەلسێر بیرسمانن) و (جۆن دیوی). بەمەش پەروەردە بوو بە خاوەنی سەرمایەكی گەورە.

* **پێناسەی فەلسەفەی پەروەردە :**

ئەو چالاكیانەیە كە لە ئەنجامی پێكەوە بەستنی (پەروەردە) و (فەلسەفەكەی) دەست ئەكەوێت و پەروەردە دەبێتە مادەیەكی فەلسەفی و هزری ئەوتۆ كە دەكەوێتە ژێر ئەزموون و ڕەخنە و ڕاستكردنەوە وە. جگە لە و پێناسەیە سەدان زانا و فەیلەسوف هەیە كە پێناسەی تایبەتیان بۆ فەلسەی پەروەردەكردوە، لەوانەش بۆ نمونە :

(نیلەر) : جێبەجێكردنی فەلسەفەی تێوریە بەسەر بوارەكانی پەروەردەدا.
(پۆشامپ) : كۆمەڵێك ئەگەر و پێشنیارە كە لە تێڕوانینی فەلسەفیانەوە دەڕوانێتە سروشتی مرۆڤ و كۆمەڵگەكەی.

* **تایبەتمەندیەكانی ناسینەوی فەلسەفەی پەروەردە :**

فەلسەفەی پەروەردە ی هەر گەل و نەتەوە و وڵاتێك تایبەتمەندی خۆی هەیە، لە وڵات و گەلێكەوە بۆ وڵات و گەلێكی تر بەم چوار خاڵە لە یەكتری جیا دەكرێنەوە :

١. پشت بە حەقیقەتی بابەتیانە دەبەستێت.
٢. ناراستە و بەهاکان بە ئاشکرا دەخاتە ڕوو.
٣. گشتی و هەمەلایەنەیە
٤. بەپێی (ئامانج و بەهاکان) فەلسەفەی پەروەردە دەگۆڕێت.

هەروەها فەلسەفەی پەروەردەی هەرگەل و نەتەوەیەك، یان وڵاتێك لە فەلسەفەی گشتی کۆمەڵایەتیانەی ئەو وڵاتەوە دەردەهێنرێت، کە بەرەنجامی کولتوری گشتی ڕۆشنبیری ئەو وڵاتەیە.

* **ڕەهەندەکانی فەلسەفەی پەروەردە :**

١. ڕەهەندی پێکهاتەیی (گشتی و هەمەلایەنەیە)
٢. ڕەهەندی وەسفی
٣. ڕەهەندی شیکاریی
٤. ڕەهەندی پەروەردەیی

ئەو ئەرکانەی لە ئەستۆی پەروەردەکاران و مامۆستایاندایە بۆ پراکتیزەکردنی‌ش فەلسەفەی پەروەردەیی هەرێمی کوردستان :

١. ڕوونبینی فەلسەفەی پەسەندکراوی پەروەردەیی و ئاشکراکردنی و بەئاشکرا کار بۆ کردنی.
٢. گەشە بەخۆدانی ژیری و جەستەیی و هزری مامۆستایان لە ڕێگەی خوێندنەوەی بەردەوام و کۆڕو کۆبونەوە و خول و سیمنارەکانەوە.
٣. دروستکردنی پردێکی پەروەردەیی بەردەوام لەگەڵ پسپۆڕو شارەزایانی بواری پەروەردە و فکری پەروەردەیی جیهانی و هەرێم.
٤. هەڵسەنگاندنی خود بۆ کتێب و بابەتەکانی پرۆگرامی خوێندن بە تایبەتی لە وەرزی هاوین و پشووەکاندا.

٥. پتەوکردنی پەیوەندی یەکی پڕ لە خۆشەویستی لەگەڵ ئیدارەی خوێندنگە و کەس و کاری خوێندکارو قوتابیان وخێزان و ماندوبوونی بەردەوام بە دوای دۆزینەوەی باشترین ڕێگەو شێوازی گونجاوی پێگەیاندن و تێگەیاندنی نەوەی نوێ.

٦. پراکتیزە کردنی فەلسەفەی پەروەردەیی تیۆری لەبواری کرداریدا لە ناخی خۆت و خێزان و قوتابی یەکانتدا.

٧. بڕوا بوون بە پرۆسەی (هەنگاو بەهەنگاو) ی پێشکەوتنی کۆمەڵگە و هۆشیارکردنەوە و گەشە پێدانی کۆمەڵایەتی و زانستی و ژیری تاکەکانی کۆمەڵگە.

٨. هەوڵدانی بەردەوام بۆچەسپ بوونی سستمی نوێی پەروەردە و دۆزینەوەی بە دیل بۆ ئەو کەم و کوڕیانەی تیایدایە لە سنوری توانا و دەسەڵاتی خۆتدا و بەرزکردنەوەی بۆ سەرووی خۆت بەمەبەستی چارەسەرکردن، نەك ڕەخنەگرتنی بێ بەدیل.

# فەلسەفەی پەروەردە و خێزان

لەبەر ئەوەی پەروەردەکردن بەرنامەیەکی گرنگ و کارێکی جێ بەجێکردنی کرداریانەیە، هەنگاونانی بەردەوام و درێژخایەنە بۆ فێرکردنی خۆمان و نەوەکانمان سەبارەت بە وەرگرتنی زانیاری زیاترو فراوانکردنی ئاسۆی بیرو ژیریو هۆشیاریمان، کەواتە پەروەردەکردن کارێکی ئامانجدارو ئامانجدیارە، بەر لەوەی دەست بەکارەکەت بکەیت دەزانیت دەبێ چی بکەیت؟ وە بۆچی دەبێت وا بکەیت؟ دەبێ چی بڵێیت؟ وە بۆچی دەبێ وا بڵێیت؟

کەواتە باش وایە هەندێ زانیاری پێویست بخەینە ڕوو دەربارەی پەروەردە، کە ئەم زانیاریانە پێویستە هەموو لایەکمان لەسەریان کۆك و تەبابین، نابێ هیچ کامێکمان دژیان بین :

١. پەروەردەکردن کارێکی تیۆری و کرداریانەیە.
٢. هەمووومان پێویستمان پێی هەیە.
٣. هەمووومان بەرپرسیارێتی و ئەرکی پەروەردەکردنمان لە ئەستۆدایە.
٤. پەروەردەکردن کارێکی بەردەوام و هەرەوەزی و درێژخانەیە.
٥. شێوازەکانی پەروەردەکردن چەسپاو و نەگۆڕنین، بەڵکو بەپێی ژینگە و کۆمەڵگە و کات و شوێن و نەریتی باو و جۆرایەتی کەسەکان و قۆناغەکانی تەمەن دەگۆڕێن.
٦. دەبێت کاری سەرەکی بریتی بێ لە پەروەردەکردنی نەوەکانمان لەسەر فێر بوونی زانست و زانیاری هاوچەرخ و خوێندەواری و بەدەست هێنانی پلە بەرزەکانی خوێندن، هەروەها فێرکردن و ڕاهێنانی نەوەی نوێ لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیانەی سەرکەوتوو بە دروستکردنی کەسێتی نایاب لەو ڕۆڵانەماندا بۆ ئێستای خۆیان و ئایندەی گشتی گەل و وڵات و مرۆڤایەتی

بە گشتی.

٧. دەبێت هەموو مرۆڤەکان و هاولاتیان لە خاڵە سەرەکیەکانی پەروەدەدا کۆك و هاوبەش و تەباو هاو دەنگ بن و پێکەوە کاری بۆ بکەن و دژی یەکتری نەوەستنەوە، واتا دەبێ هەموومان بۆ نمونە لەم خاڵانەدا کۆك بین :

ا – هەموو کەسێك پێویستی بە پەروەردەکردن هەیە.

ب- دەبێ کەسی پەروەردەکار شارەزای ڕێگە و شێوازەکانی پەروەردەکردن بێ و سەربەخۆ دەست نەداتە پەروەردە، جا ئەو کەسە ئەندامی خێزانێکە یان سەرۆکی خێزان یان مامۆستایەکی فێرکردنە یان مامۆستایەکی ئاینی یان کەسێکی دەسەلاتدارو بڕیار بە دەستە، یان بەرپرسی پەروەردەو ڕۆشنبیری گروپێك یان ڕێکخراوێکە.

ج- دەبێ هەموو کەسێکی پەروەردەکار بەشێوەیەکی هاوچەرخانە و دوور لە توندو تیژی و لایەنگری ئایدۆلۆژیانە پەروەردەکراوەکانی بەردەستی فێری ئازادی ڕادەربڕین و کرانەوە و خۆشەویستی مرۆڤەکان و ئاشتی و دیموکراسی بکات، پەروەردەکارەکە خۆشیی وا بێت.

ء – پەروەردەکراوەکانی فێری خۆ پاراستنی تەندروستی و دەروونی و ژینگە پارێزی و ڕۆشنبیری و ڕاهێنان و پێکەوە ژیان و ئابووری و مرۆڤ دۆستی بکات.

ه – دەبێ بە باشی شارەزای ناسینی مرۆڤ و قۆناغەکانی گەشەکردنی مرۆڤ بێ لە ڕووی گەشەی جەستەیی و ژیری و دەرونی و کۆمەلایەتیەوە، چونکە تا کەسێك کەسەکەی بەردەستی بە تەواوەتی نەناسێت ناشزانێت پەروەردەی بکات.

و- دەبێ هەموومان پابەندی یاسا و ڕێساکانی ژیان بین و مافی مرۆڤەکان و گیانەوەران و ژینگەکەمان بپارێزین.

ز – پێویستە هەریەکەمان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین لە ئاستی نەوەی نوێدا و بە ئەرکی خۆمانی بزانین کە فێری ژیان و سستمی کۆمەڵایەتی و ژیری و هۆشیارییان بکەین، ئەوەش بەلێزانی و زرنگی و بەرنامە ڕێژی و وردەکاریەکانیان و بەدواداچوونی بەردەوامان بۆ پرۆسەی پەروەردەکردن و گۆشکردن و ئاراستەکردنیان.

ح – هەموومان منداڵەکانمان فێری ڕەوشت و نەریت و بەها بەرزەکانی ژیان بکەین وەك ڕاستگۆیی و دەست و زمانپاکی و خاوێنی دڵ و دەرون و لایەنە مرۆڤایەتیەکانی تر تاکو نەوەی نوێ یەکتریان قەبوڵ بێ و لەگەڵ یەکتریدا بگونجێن و هەڵ بکەن، جیاوازی ئەیدۆلۆژی و زمان و ئاین و نەتەوە و وڵات و ڕەگەزو کولتور نەکەنە کێشە، بەڵکو وەك مرۆڤ بژین و وەك مرۆڤیش بیر بکەنەوە و ڕەفتار بکەن.

خ – ڕێزو قەدری بەها کۆمەڵایەتی و خێزانیەکان بگرن و بەچاوی پڕ لە شکۆمەندی یەوە بڕواننە دایك و باوك و مامۆستا و پێشەنگە دڵسۆزەکانیان.

٨. هەموومان یەك جۆرە پەروەردەکردنمان هەبێت لە چوار چێوەی خێزان و قوتابخانە و دام و دەزگا فێرکاری و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتیەکاندا، جیاوازی ئێمەی گەورە لەناوخۆماندا نەبێتە هۆی دروستکردنی جیاوازی جەوهەری لە منالەکانماندا لە خاڵ و هێڵە سەرەکی و گشتی یەکاندا کە پەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگە و مرۆڤایەتیان تێدایە، کە ئەم بەرژەوەندیە گشتیە مرۆڤاییانە بە (هێڵە سورەکانی پەروەردە) دادەنرێن و مافی هیچ کەسێك نیە ئەو هێڵانە ببەزێنێ، واتە تۆ دەتوانیت لەناو خێزانەکەی خۆتدا پەروەردەیەکی تایبەتی

منداڵەکانت بکەیت بەو شێوەیەی کە دەتەوێت بەمەرجێك نەگاتە سنوری هێڵە سوورەکان، کە بەداخەوە ئێمەی گەورەو خێزاندار زوربەی جار کەوتوینەتە ئەو هەڵەیەوە کە خۆمان و پەروەردەی خێزانەکەی خۆمان لەلا دەبێت بە نمونە و هەموو جۆرە پەروەردەیەکی تر ڕەت دەکەینەوە، نەك هەر ئەوە بەڵکو دەمانەوێت بەزۆر بیرو بۆ چوون و شێوازو جەوهەری ئەو پەروەردەی خێزانەکەی خۆمان بەسەر خێزان و منداڵی کەسانی تردا بسەپێنین، کە هێشتا خۆمان دڵنیا نین ئاخۆ ئەو جۆرە پەروەردەیەی ئێمە بەباشی دەزانین، سەرکەوتومیان نا؟ ئایا ئێمە خۆمان بەسەرکەوتووی دەزانین؟ یان لە ڕاستیدا بەپێی ڕای زۆرینەی خەڵکی و زانایانی پەروەردە و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی پەسەندە؟

٩. هەمووومان لە ڕێگەی ڕەفتارەکانمانەوە پەروەردە و جەوهەری فەلسەفەی پەروەردەکەمان نیشانی کەسانی تر دەدەین، واتە گفتارو کردارمان ئاوێنەی ناخمانە، کەواتە دەتوانین لەو ڕێگەیەوە کاری پەروەردەکردنی کردارییانە بکەین و بتوانین خەڵکیش بناسین و خەڵکیش بماننناسێت، بەهاو نرخی ئێمە لە کردارەکانمانەوە دەردەکەوێ کەواتە کردارو گفتاری تۆی پەروەردەکار چۆن بێت دڵنیابە ئەوانەی لەگەڵتدا دەژین و تۆ پەروەردەیان دەکەیت وەکو تۆ یان نزیك لە ڕەفتاری تۆ دەبن، لەبەر ئەوە هەموو ڕەفتارێکی خراپی ئێمەی پەروەردەکار و گەورە مامۆستاو خلوەن خێزان دەبێتە کۆسپێکی گەورەی تێکدان و شێواندنی پەروەردەکردنی نەوەی نوێ و ئەندامانی خێزانەکەمان، جا درەنگ بێ یان زوو.

١٠. هەمووومان دەمانەوێ کولتورو نەریتی جوان بگوازینەوە بۆ نەوەکانمان، منداڵەکانمان، گەنجان و لاوان و هەرزەکارانی گەلەکەمان، تاکە ڕێگەش بۆ گواستنەوەی ئەو کولتورە جوانە تەنها و تەنها بریتیە لە پەروەردەکردن، هیچ ڕێگەو شێوازو دەزگا و هۆکارێکی ترمان نیە کە لەو ڕووەوە جێگەی پەروەردە بگرێتەوە، کەواتە با بزانین چۆن پەروەردە بەکار بهێنین بۆ گواستنەوەی ئەو بەشە جوانەی لە کولتورماندا هەیە بۆ نەوەکانمان، بابزانین چۆن بەشە ناشرین و نەشیاوەکەی کولتورەکەمان دەسڕینەوە و ناهێڵین بگوازرێتەوە بۆ نەوەکانمان،

پێویسته بزانین چۆن هەرزەکارو لاوانمان فێری ژیانی هاوچەرخانەو کارلێکی کولتورە جیاوازەکان بکەین، نابێ نەوەی نوێ لە کولتورە جیاوازەکانی گەلانی تر بێ ئاگا بێ و ناشبێ لەو پێناوەدا کولتورە ڕەسەن و جوانەکەی خۆیشمان فەرامۆش بکات، ڕاست وایە هەموو کولتورەکانی تر بکات بەکەرەسەی یاریدەدەر بۆ تەواو کردنی ئەو بەشە نا تەواوەی کە لە کولتوری ئێمەدا لاوازە، یان نیە، واتە شادەماری سەرەکی کولتوری نەوەی نوێ کولتورەکەی خۆمان بێ و ئەوانی تر تەواوکەر بن، هەر وەکو گەلانی تریش وایانکردوەو وا دەکەن.

# پەیڕەو کردنی فەلسەفەی پەروەردە لە خێزانماندا

ئێستاش بابزانین چۆن فەلسەفەی پەروەردە لە خێزانماندا پەیڕەو بکەین؟

هەرچەندە خێزان یەکەیەکی کۆمەڵایەتی و پێکەوە ژیانی چەند مرۆڤێکە پێکەوە لە تەمەن و ڕەگەزو تایبەتمەندێتی تاکە کەسیدا لە یەکتری جیاوازن، بەڵام بەرژەوەندی هاوبەش و پەیوەندی خوێن و خزمایەتی و زمان و کولتور نەریت لە ژێر یەک بن میچ و یەک ماڵدا کۆیان دەکاتەوە، کەواتە بە هەمان شێوە یەک ڕژێمی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیش سەر لە نوێ تۆ پابەند دەکاتەوە و دەیانکەتە یەکە یەکی فێربون و فێرکردن و ڕاهێنان و ئاراستەکردن لەسەر شێوازو چەشنەکانی ژیان، ئەمەش واتە یەک ڕژێمی پەروەردەییان هەیە. یەکەمین فێرگەی مرۆڤ بریتی یە لە چوار چێوەی ماڵ و خێزانەکەی خۆی هەمووومان سەرەتا لە دایک و باوک و کەسە گەورە ترەکانی ناو خێزانەکەمانەوە فێری هەموو شتێکی ژیان بووین، بە پلەی یەکەم، دواتر لەو کەسانەوە کە تێکەڵی خێزانەکەمان بوون وەک دراوسێ و هاوڕێ و مامۆستایانی باخچەکانی ساوایان و قۆناغەکانی تری خوێندن، ئەوسا کۆمەڵگە و جەماوەری خەڵک و دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی تر، وەک یانەکانی وەرزش و سەنتەرەکان و مزگەوت و شوێنە گشتی یەکان.

کەواتە ئەرکێک لە ئەرکە سەرەکیەکانی خێزان بریتیە لە پەروەردەکردنی ئەندامەکانی و ڕاهێنانیان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و فێرکردنی زانیاری و چۆنیەتی شێوازو ڕەفتارەکانی ژیان و خاوێنی و خۆپاراستن و زمان پژان و شێوازەکانی قسەکردن و هونەرەکانی پەیوەندی کردن و ناسین و ناسینەوەی خەڵکی و مەشق پێکردن بۆ خوێندن و خوێندەواری و پیشە باو و

شیاوەکان، بەکۆی گشتی ئەم ئەرکانە دەوترێت پەروەردە و فێرکردنی کۆمەڵایەتیانەی خێزانی، لە ڕاستیش دا پێناسەی گشتی فێرکردن بریتیە لە (ڕوودانی گۆڕانکاریەکی دیارو بەرچاو لەسەر چۆنیەتی بەجێهێنان و وەڵامدانەوەی دەوروبەر)، بێگومان فێرکردن لە ژێر ڕکێف و کاریگەری شارەزایی و کارامەیی و ڕاهێناندا دەبێت کە ئەمانە بەشێوەی بەردەوام لەکاردا بن، بۆیە باش وایە بە کورتی باسی هەریەکە شارەزایی، کارامەیی، ڕاهێنان، بکەین.

١. **شارەزایی** : هەر هەڵوێستێکە کە مرۆڤ بیگرێتە بەرو کاری پێبکرێت، واتە هەر شتێکی دەرەکی کە ببێتە مایەی وروژاندنی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکی سەرکەوتوانە پێی دەوترێت شارەزایی.

بۆ نمونە : دینەمۆی کارەبا دەری ماڵەوەتان لە کارکەوتوە، دەیبەنە لای وەستایەك، وەستاکە هەڵوێستی هەبێت بەرانبەر بەو دینەمۆیە چونکە لەلایەن دینەمۆکەوە کاری تێکراوە، واتە دینەمۆکە پرسیارێکی لای وەستاکە دروست کردوە. کە (بۆچی لەکار کەوتوە؟) وەستاکەش دەبێ بەدوای چارەسەری کێشەی دینەمۆکەدا بڕوات لە ڕێی گەڕانی بە دوای وەلامی ئەو پرسیارەدا، زانیاری و تواناکانی خۆی لە ڕووی تیۆری و کرداریەوە دەخاتە گەڕ بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە و چاك کردنەوەی، ئەم نمونەیە بۆ هەموو شتێکی ترو هەموو مرۆڤێکیش ڕاستە.

٢. **کارامەیی** : بریتیە لە شارەزاییەکی تا ڕادەیەك ڕێکخراو، ئاماژەیە بۆ دوبارەکردنەوەی هەمان وەلامدانەوە لە هەڵوێستە ژینگەییە ڕێکخراوەکاندا.

**واتە** : هەمان شارەزایی چەند جارێك بەشێوەی ڕێك و پێك دوبارە دەکاتەوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو شتانەی لە دەوروبەری ڕوودەدەن.

**بۆ نمونە** : منداڵێك زۆر بزێو لاسارە، پزیشکی دەرونی لەبەر ئەوەی شارەزاییەکی ڕێك و پێکی پێشوەختی کۆ کراوەی لە لایە لەسەر ئەو جۆرە مندالانە، هەوڵ دەدات ئەو شارەزاییەی چەند جارێك بخاتە کار بۆ هەڵوێستە

جیا جیاكانی دەوروبەری و منداڵەكە تاكو بگاتە وەلامی ڕاست و دۆزینەوەی چارەسەری كێشەكە.

٣. **ڕاهێنان** : لە زمانی كوردیدا واتە (هێنانە سەر ڕێ) ئەمەش واتە زۆرترین وێنەكانی شارەزایی ڕێكخراوی فێركراوی پێشترو لە زنجیرەیەك هەڵوێستی بەدوایەكدا هاتوی ڕیزكراودا دەردەكەوێت.

بۆ نمونە : منداڵێك فێری كرداری دابەشكردن كراوە لە بیركاری دا تۆش چەندین نمونەی بۆ دەنوسیت تاكو ئەو شیكاریان بكات و وەڵامێكی ڕاست و دروستی دەست بكەوێت، منداڵەكە هەریەكە لە هەڵوێستەكانی تۆی ڕاهێنەر بەكار دەهێنێتەوە، كە چۆن چۆنی زنجیرەی هەنگاوەكانت بەدوای یەكدا هێناوە تاكو گەیشتیتە ئەنجامەكە، منالەكە سوود لە هەناوەكان و شێوازی هەنگاوەكانت وەردەگرێ و ئەوانە دوبارە دەكاتەوە كە پێشتر فێرت كردوە. كەواتە ڕاهێنان بە شێكی كرداریی یە لە پرۆسەی فێركردن، بەڵام مەشق پەراوە پێكردنی منداڵەكەیە لەسەر كرداری شیكاركردنی پرسیارەكە هەنگاو بە هەنگاو لە ژێر ڕێنمایی و چاودێری خۆتدا، كە ڕاستەوخۆ لە كاتی هەڵە كردنەكەدا هەڵەكەی بۆ ڕاست دەكەیتەوە.

**بۆ نمونە** : تۆ دەتەوێت كە سێك مەشق پێ بكەیت تاكو فێری شۆفێری ببێ، ئوتۆمبیلەكەی دەدەیتەوە دەست و تۆش لە لایەوە دادەنیشی و پێی دەڵێت فەرموو لێبخورە....! هەر كە دەستی بەلێخورین كرد، لەهەر شوێن و كارێكی دا هەڵەی كرد، ڕایدەگرێت و یەكسەر هەڵەكەی پێ دەڵێی و پاشان سەر لەنوێ بە شێوەیەكی ڕاست پێی دوبارە دەكەیتەوە، بەڵام (ڕاهێنان) بەو چالاكی و كردارانە دەگوترێت كە دەسپێردرێت بە خودی كەسەكە تاكو خۆی بیكات و هەر خۆشی خۆی هەڵسەنگێنێ، ئامانجی ڕاهێنان پشت بە خۆبەستن و گەشەپێدانە بە متمانە بوونی توانای خود و هەڵسەنگاندنی خودو زانینی ئاستی توانا لە لایەن كەسەكە خۆیەوە، بە پرۆڤەیەكی ئازاد و بێ ڕێنمایی و ئاڕاستەكردن.

بەلاّم مەشق هەمان کاری ڕاهێنانە لەگەڵ ئامادەبوونی ڕاهێنەرە کە بەسەر فێر خوازەکەوە بۆ ڕاستکردنەوەی خێراو ئاراستە کردن و چاودێری و وردەکاری ڕێنوێنی کردن، ئامانج لە مەشق دا پەراوەی سەرەتایی یە و دەستپێوە گرتنە بەکات و پشت ئەستور کردنی فێرخوازە بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکی مەیدانی بەراییانە و زانینی سنوری توانای فێرخواز لە لای ڕاهێنەرەکە و دیاریکردنی برو جۆرو هۆکاری هەڵەکردن لە چالاکیەکەدا.

**بۆ نموونە** : تۆ لەبەر چاوی منداڵێکدا بزمارێك بە تەختەیەکدا دادەکوتی تاکو ئەویش سەیرت بکات و فێری هەنگاوەکانی کارەکەی تۆ بێت. ئەمە فێرکردنە , چەکوشەکە دەدەیتە دەستی منداڵەکە تاکو خۆی کردارەکە بکات و تۆش چاودێری بکەیت و ڕێنمایی بدەیتێ، ئەمە مەشقە، پاشان لە منداڵەکە دور دەکەوێتەوە و بەبێ ئامادەبوونی تۆ، کارەکە دەکات، ئەویان ڕاهێنانە. هەموو فێربوونەکانی شتەکانی تر لە ژیانی مرۆڤدا و لەناو چوار چێوەی خێزانیدا بە هەنگاوەکانی (فێرکردن، مەشق، ڕاهێنان) دا دەڕۆن و ئێمەی گەورەش ئێستا هەر چیەك دەزانین و فێری بووین لە سنوری خێزان و قوتابخانەدا بەو هەنگاوانە فێری بووین و ئێستاش وەك کەسێکی شارەزاو ڕاهێنراو ئەو فێربوونە دوبارە دەکەینەوە لەگەڵ چەند گۆڕانکاری و داهێنانی نوێی خودی خۆمان کە بۆمان زیاد کردوە.

**بۆ نموونە** : فێربوین کە کەوچکی چاو کەوچکە چێشت چۆن بگرین و بەکاری بهێنین، کە زوربەمان هەرسێ کرداری (فێرکردن و مەشق و ڕهێنان) مان بەچاولێکردنی کرداریانەی گەورەکانی ناو خێزانمان بووە و بە وەرگرتن و لاسایی کردنەوەی ئەوان فێری بوین و هیچمان خولی ڕاهێنانمان لە ناو خێزانمانەوە بۆنە کراوتەوە لەسەر ئەوانە.

هەروەها ڕەفتارە کۆمەڵایەتی و جوڵەیی و پەیوەندیەکانیش بە هەمان شێوە فێری بووین، وەکو :

دەست و دەم و ددان شۆردن، نینۆك کردن و خۆشۆردن، شێوازی پێشوازی

میوان و خزم و ناهەنگەکان و داوەتەکان و بۆنەکان، ڕاستگۆیی و درۆنەکردن و دەست پاکی و..... هتد، هەموو ئەمانە لە ڕێی لاساییکردنەوە و گەشەی ژیری و پەیوەندی خێزانیمانەوە لە دایک و باوک و گەورەکانی ناو خێزانمانەوە فێری بووین، هەریەکە لەو کارو چالاکی و ڕەفتارو گفتارو کردارانەی کە فێریان بووین ئامانجێك یان زیاتر لە پشتیانەوە هەیە، کەواتە لە پشتی هەموو فێر بونێکەوە ئامانجێك هەیە، بە واتایەکی تر فەلسەفەیەك لەودیوەوە هەیە، کەواتە بەردەوام ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا فەلسەفەی ژیان و پەروەردەو فێرکردن پەیڕەو دەکەین و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش شارەزایی و کارامەیی زیاتر فێر دەبین بە واتا گشتیەکەی بەردەوام لە خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵگەدا. فێرۆخوازین و بۆ خوار خۆیشمان مامۆستاین.

فەلسەفەی پەروەردە جێ بەجێ دەکەین، لە هەموو کارەکانیشماندا هەوڵ دەدەین کە کەمترین و باشترین بەرهەم و خۆشترین ئاسودەیی و ئاسکترین ئاشتی و دڵنیایمان دەست بکەوێت، چونکە ئێمە بە دوای چێژی ژیاندا دەگەڕێین و لەو پێناوەشدا هەموو ڕێگەیەك دەگرینە بەر، کە زوربەی جار دەکەوینە ڕێگەی هەڵەوە، بەمەش بەرهەمەکەمان خراپ و ماوەی کاتەکە بە هەدەر چوو و چێژەکەیش درێژ خایەن نەبووە. ئەمە جگە لەوەی دەبێ سەر لە نوێ لەسەر حسابی کات و تەمەنی خۆمان ڕاستی بکەینەوە.

کاتێك ئێمەی گەورە، ئێمەی دایك و باوك، ئێمەی مامۆستا و بەخێوکار دەمانەوێ کاری پەروەردە بکەین، وە کارەکەشمان سەرکەوتوو بێت، پێویستە چەند تایبەتمەندییەك لە ئێمەدا هەبێت، لێرەدا ئەو خەسڵەتە سەرەکیانە دەخەینە ڕوو تاکو دڵنیا بین ئاخۆ ئێمە بۆ کاری پەروەردەکردنی منداڵ و خێزان و نەوەی نوێ شیاوین یان نا.

# تایبەتمەندییەکانی پەروەردەکار

١. لـــە ڕووی تەندروستی و دەروندروستی و ژیـری و کۆمەڵایەتیــەوە، گەشـەیەکی سروشـتی و ئاسایی کـرد بێت و نـا تـەواوی و نەخۆشی تێدا نـەبێ، یـان بـەو ڕادەیـە نـەبێ کـە کـار بکاتـە سـەر شـێواندنی پرۆسـەی پەروەردە کردنەکە.

٢. ئەرکی پەروەردەکردن بە ئەرکێکی مرۆییانە و ڕاستەقینەی خۆی بزانێت و لـە بەرانبـەردا چـاوەڕوانی پاداشـت و کـرێ و دەستخۆشـی و ناوبـانگ نەکات، بەڵکو چاوەڕوانی پێچەوانەی ئەوا نەبێ، یان هیچ نەبێ یەکێك لـە ئەگەرە چاوەڕوانکراوەکانی ئەوا نەبێت.

٣. دڵسۆز بێت، لێبڕێـت بـۆ ئـەو ئەرکە، بـەردەوام بێـت، سوور بـێ لەسـەر گەیانـدنی پـەیامی پـەروەردەیی خـۆی و پـەیڕەو کـردن و ڕەنگدانـەوەی پەروەردەیەکی ڕاستەقینە لە گفتاری و کرداری و بیرکردنەوەکانیدا، خۆی کەسـێکی بـە ئاگـاو هۆشـیارو شـارەزا بێـت لـە پـەروەردە و لـە هـەوڵی بەردەوامـدا بێـت بـۆ زیـاتر شـارەزا بـوونی خـودی خـۆی و فراوانکردنـی بازنەی تواناکانی، هاوکات لەگەڵ خۆ پەروەردەکردنیـدا، بـەردەوام بـێ لـە پەروەردەکردنی نەوەی نوێ و ئەندامانی خێزانەکەی و کەسە نزیکـەکانی و هاوڕێ و دراوسێ و خزمانی.

٤. بەپێی بەرنامەیـەکی دیـاریکراو هـەنگاو بنـێ و لەسـەر بنـەمای زانسـتی و توێژینــەوەی زانسـتی و ئـەزموون و هەڵسەنداندن و بەدواداچـوون کـار بکات، بەسەلیقە و دانایی یەوە کـار بکـات و لەسـەر هـەموو بیرکردنـەوە و گفتارو کردارێك هەڵوێستەی هەبێ و دوور بین بێ.

٥. پەلـە نـەکات و کاروبارەکـانی خـۆی نـەئالۆزکێنێ و هەڵوێـست و کـردار و گفتارەکانی دژو پێچەوانەی یـەکتر نـەبن، زمـانی زبـرو تیـژی و هەڕەشـەو

سەرزەنشتی کردن و شکاندنەوە و دەنگ دابڕان و سزادانی دەروونی و جەستەیی بەکار نەهێنێ لە پەروەردەکردنی نەوەکاندا، وەك هاوەڵ و هاوڕێ و هاوتەمەن ڕەفتار لەگەڵ فێر خوازو بەردەستەکانی بکات و خۆی نەکاتە ئامۆژگاریکارو ترسێنەرو خۆسەپێن، بەڵکو وا خۆی نیشان بدات کە پەروەردە و فێرکردن ئەرکێکی گشتی و هەرەوەزی یە و هەموو مرۆڤەکانی سەرزەوی تیایدا بەشدارن و کەس لەکەس گەورەتر و بەرپرسیار تر نیە، بەڵکو هەموو مرۆڤەکان پێکەوە بەرپرسیارن و دەبێ پێکەوە بەشدار بین.

٦. دانا بێ لە بەراورد کردنی ژینگەی پەروەردەیی فێر خوازەکانی کەش و دۆخی ئابوری و کۆمەڵایەتی خێزانەکەی و ستایلەکانی ڕەفتار گەرایی و پەیوەندیە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی ئەندامانی خێزانەکە و زانینی (جیاوازیە تاککەسیەکان)، بەوەی کە هیچ مرۆڤێك لەسەدا سەد لە مرۆڤێکی تر ناچێت، تەنانەت ئەگەر منداڵی دوانە (جمك) یش بن و لە ڕوخسارو جەستەشیاندا بە تەواوەتی لە یەکتری بچن، هێشتا جیاوازن لە بەشێك لە ژیری و بیرکردنەوە و لایەنی دەرونی و ئارەزوەکانیان و گەلێك لایەنی تر.

٧. تەنها خۆی و فێرکارەکانی بەسەنتەر دادەنێت، واتە کەسێکی تر لە دەرەوەی خۆیان بەگرنگتر و دانا ترو شارەزاترو نزیکتر لە کارەکە لە قەڵەم نادات، بۆ نمونە کاتێك دایکێك لەگەڵ منداڵەکەیدا خەریکی فێربوون و فێرکردنی ڕەفتارێکی پەروەردەیی شیاون، ئەگەر منداڵەکە وەك پێویست نەهات بەدەم ئامادەبونی خۆی بۆ چاکسازی لەو ڕەفتارەیدا، نابێ دایکەکە بڵێت : (ڕۆڵە گیان ئەم کارەی تۆ هەڵەیە، قەبوڵی ناکەم، ئێوارە کە باوکت هاتەوە ماڵەوە من لەلای ئەو شکاتت لێ دەکەم، با ئەو سزات بدات) ئەوە کارێکی شیاو نیە، چونکە جگە لە دایك و منداڵەکە کەسی سێهەمیش هاتە ناو سەنتەر بوونکەوە، کە دەبێتە مایەی لاوازبونی

متمانەی منالەکە بەخۆی و فێرکارەکەی کە دایکیەتی لەلایەکی ترەوە منداڵەکە دوو جۆرە هەستی تری لەلا دروست دەبێ : یەکەمیان وا بۆی دەردەکەوێ کە دایکی کەسێکی لاوازە و توانای بڕیاردانی نیە و پاشکۆی کەسێکی تری بەهێزترە کە باوکیەتی، کەواتە ئەم دایکە شایستەی ئەوە نیە کە هاوسەنتەر بێ لەگەڵ منالەکەیدا بۆ ئاراستەکردن و پەروەردەکردنی ڕەفتاریی. دووە: منداڵەکە ئەو هەستەی لا دروست دەبێ کە ئەو ڕەفتارەی ئەو لەسەریەتی ڕاست و دروستە، بەڵام بە دڵی دایك و باوکی نیە، لەبەر ئەوە دەیانەوێت بەزەبری هێز بەسەریدا بیسەپێنن، لە ڕاستیدا دەبێ منداڵ خۆی بەشێك بێ لە چارەسەرکردنەکە و بەشداریی تەواوتی هەبێ، نەك بەلادەرو نەخۆشی و کێشە دار لە قەڵەم بدرێ و من و تۆش خۆمانی لێ بکەین بە حەکیم و چارەساز، بەپێچەوانەوە ئەو پێش من و تۆ حەکیمە و ئەرکی من و تۆ ئەوەیە کە ئەو منالە ڕابێنین لەسەر بەگەڕ خستنی توانا و حیکمەتەکانی خۆی.

٨. مرۆڤێکی واقعخوازو قەبوڵکەری واقیع و خۆیشی بێت، لە یەك گۆشە نیگای تەسکەوە نەڕوانێتە مرۆڤەکان و نەڕوانێتە ژیان، کەسێکی کراوە و داهێنەرو زرنگ و خوێنەرو ڕۆشنبیر بێ، جل و بەرگ و پێڵاو نینۆك و دەم و دانی خاوێن و ڕێك و پێك بێت، بۆن و بەرامەی خۆش بێ، زمان شیرین و ڕووخۆش و گەشبین و کار ئاسانکار بێت، پەیوەندی گەرم و گوڕو بەردەوامی هەبێت بە خودی فێرخوازەکە و ئەو کەسانەیشەوەکە لەگەڵ فێرخوازەکەدایە پەیوەندیدارن، بەخشندەبێ و ڕەزیلی نەکات لە بەخشینی زانست و زانیاریەکانیدا بە فێرخوازەکانی بە (جدی) خۆی ماندو بکات لە پێناوی ئەوەدا کە فێرخوازەکەی لە خۆی زاناترو چاکتر و دەربچێت، هونەرو شێوازی گەیاندنی بەهێزبێ، لە هەموو شتێك بزانێ، شارەزایی چاکی هەبێت لە بواری پەروەردە و زانستی پەروەردەکردن و ئاراستەکاری و سایکۆلۆژی و منداڵناسی و کۆمەڵناسی و خێزانپەروەریدا.

٩. گرفت و كێشه و كەم و كورپیە تایبەتیەكانی خۆی تێكەڵی كاری پەروەردەكردنەكەی نەكات و ئەو جۆرە شتە تایبەتیانە كاری تێ نەكات و خاوی نەكاتەوە و سەری لێ تێك نەدات، شێوازی كاری پەروەردە كردنەكەی بە میزاج نەبێ، بەڵكو لەسەر بنەمای زانستی و ژیری و پێویستی و ئەركی ڕاپەڕاندنی كار بێت.

١٠. كەش و هەواو ژینگە و شوێنی وانە وتنەوەو پەروەردە كردن و فێركردنەكەی ناو بەناو بگۆڕێت، وەك باخچە و پارك و لادێ و دەشت و دەرو سەیرانگە و تاقیگە و هۆڵی زانكۆیی و...... هتد، ناوبەناو گەشتی زانستی و سەیرانی بە كۆمەڵ پێكەوە بكەن و یاری و چالاكی وەرزشی و هونەری و شانۆیی ئەنجام بدەن.

١١. گرنگە مامۆستا و دایك و باوك خەتی جوان و دەفتەرو جانتاكەی ڕێك و پێك و گەش و خاوێن بن، بڕوای بە گۆڕانكاری و ڕەخنەو ڕاستكردنەوە هەبێت، نەهێڵێت فرمستیاریی (الحساسیە) دروست بێ لە نێوان خۆی و فێركارەكانی دا، نەبادا بگاتە ڕاددەی گوێ لێ نەگرتن و فەرامۆشكردن و ڕق لێ بونەوە و ململانێ و دژایەتیكردن، چونكە هەمیشە لە ڕێی خۆشەویستی یەوە دەتوانیت پەیامی خۆت بگەیەنیت بە بەرانبەرەكەت، واتە ئەو كەسەی كە تۆ دەتەوێت پەروەردەی بكەیت یان فێری زانستێك یان پیشەیەكی بكەیت سەرەتا زۆر خۆشت بوێت، ئەویش هەست بەوە بكات و دڵنیا بێ كە تۆ لە ناخەوە خۆشت دەوێت بۆیە دەتەوێ فێری بكەیت، هیچ منداڵێك گوێ لە دایك و باوكی و كەسانی گەورە ناگرێت تا دڵنیا نەبێ لە بونی خۆشەویستی ئەوان بۆی، هیچ قوتابیەك فێربون و زانین ناخاتە پێش خۆشەویستی مامۆستاكەیەوە.

١٢. دەبێ فێركارو پەروەردەكار، مامۆستا و دایك و باوك، توێژەری دەرونی و كۆمەڵایەتی، ئاراستەكارو ڕێنماكار، ئەو ڕاستیە چاك بزانن. كە مێشكی هەریەكە لە مرۆڤەكان لە كەسانی تر جیاوازە، بۆ ئەوەی بچیتە ناو

مێشك و دەروونـی بەردەسـت و قوتـابی و فێرخـوازو منداڵەكەتـەوە دەبـێ (كلیل) ی تایبەتی كردنەوەی مێشكی ئەو كەسەت پێ بێت، كلیلی مێـشكی هـیچ كەسـێكیش بـۆ كەسـێكی تـر نابـێ، هـەر وەكـو چۆن سویـچی هـیچ ئوتۆمبیلێك بۆ ئوتۆمبیلێكی تر نابێ، لە كاتێكدا هـەموویان ئوتـومبیلن و چوار پێچكەیان هەیە و لە یەك كارگەش دروست كراون.

١٣. دەبێ فێركار بەشێك بێ لە ژیانی فێرخوازەكەی، لـە خۆشـی و ناخۆشـی و شادی و بۆنەو ئاهەنگەكانیدا بەشدار بێ، وەكو ئەو شادبێ بە شاد بـوونی، وەكو ئەو خەمبار بێ بە خەمبار بونی لە ناخ و ڕۆح و دەرونەوە ئاوێتەی بێ، لـە كـاتی تەنگانـە و نارەحەتیەكانیـدا یەكـەم كەسـی فریـاگوزاری بـێ، دەبێ مامۆستا و دایك و باوك و بەخێوكارو فێركار بۆ خۆیـان نمونەیـەكی بـەرز و بەرچـاوو دەرەوشـاوە بـن لەبـەهاو ڕەوشـتی بـەرزو نمونـەی كـاری بـەجێ و كەسـێتی سـەركەوتووی كۆمەڵگـە و پێـشكەوتو خـواز و دانـاو حیكمەتــدارو بــە ئەمــەك و شــكۆمەندی، بــە چەشــنێك كــە زوربــەی هەرمزۆری خەڵكی پەنجەی بۆ ڕابكێشن لە نمونە بـوون و دەگمـەنی و نـاو بانگبەرزی و خزمەتگوزاری سادە و بـێ فیـزی و پـڕ لـە زانـست و زانیـاری نوێ و كار بەجێی و سەرفەرازی و خۆشەویستی، دەبێ بڕوای بە ئـازادی و ئازادی ڕادەربڕین و دیموكراسی و دادپەروەری هەبێت و خۆیشی یەكەمین كەس بێت كە ئەو چەمكانە بەكردەوە جێ بەجێ بكات.

١٤. دەبـێ خـاوەنی كەسـیەتیەكی سـاخ و سـەركەوتوو بێـت، لـە هـەموو كـات و شوێنێكدا یەك ئامانجی نەگۆڕی هەبێت و كار بـۆ هێنانـەدی ئـەو ئامانجـە بكات، ئەویش بریتیە لە (كۆشش و هەوڵدان بـۆ پـەروەردە و فێركـردن و پێگەیاندن و ئاراسـتەكردنێكی ڕاسـت و دروسـتی سـەركەوتوانەی كەسـانی دەوروبـەری و فێرخوازەكـانی لـە ڕووی جەسـتەیی و دەرونـی و ژیـری و كۆمەڵایەتی یەوە).

١٥. شارەزاو ئاشنا بێ بـە سـایكۆلۆژیای پـەروەردە و پرۆگرامـەكان و كولتـوری

ڕۆشنبیری گەلانی جیهان و گەلەکەی خۆی و هەمیشە بۆ هەموو قسەو وتەیەکی دەیان نمونە و پەندو هۆنراوەو حیکمەت و کورتە چیرۆك بهێنێتەوە، شارەزای ڕێگە و شێوازەکانی گەیاندن و تێگەیاندن و پێگەیاندن و وانە بێژی بێت لە ڕووی تیۆری و پراکتیکی یەوە. ئەو (١٥) خاڵەی کە باسمانکردن، خەسڵەتی جەوهەرین و دەبێ لە هەریەکە لە دایك و باوك و مامۆستاو فێرکارو نێمەی گەورەدا هەبێت، دیارە جگە لە مانەش خاڵی جەوهەری تریش هەیە کە پەیوەندی بە لایەنی خودی مامۆستایان خودی فێرخواز یان ناوەندی ژینگە و پەروەردە و ڕۆشنبیری و زانستی یەوە هەیە، بەلام ئەم (١٥) خاڵە لە هەر کەسێکی فێرکارو پەروەردەکاردا هەبێت بە ڕادەیەکی زۆر کەسێکی سەرکەوتوو دەبێت لە پەروەردە و فێرکردنی نەوەی نوێ و ئەندامانی خێزانەکەیدا.

## چەند نمونەیەکی کرداریی

لە پەیڕەوکردنی فەلسەفەی پەروەردە لە خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵگەدا دیارە هەزاران هەزار لاپەڕەی سپی ڕەش بکەینەوە، بە نوسینی ورد و بیرو بۆ چوونی جوان و شیکردنەوە و ڕاڤەی پڕ لە وردەکاری و حیکمەت و فەلسەفە و پێشنیاری نایاب هیچ ڕۆڵێکی ئەو تۆی نیە و تەنها کارێك کە کردومانە (فەلسەفاندنە) هەموو مرۆڤێکی ئاسایش دەتوانێ بفەلسەفێنێ، وتەی جوان و مرواریانە لە زاری هەڵڕێژێت، بەوتە بەرزو بەنرخەکانی بمانهەژێنێ و هەمووومان بخاتە ناو بازنەی واق و ڕمان و سەرسامی یەوە، بەلام ئێمە ئەمڕۆ پێویستمان بەوە نیە و لەسەرئەوەش پەکمان نەکوتوە، ئەمڕۆ لە سایەی کرانەوەی جیهانی و زۆر بوونی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندی و کەمبونەوەی ڕێژەی نەخوێندەواری و قەرەباڵغ بوونی شارەکان و دام و دەزگا و دامەزراوە مرۆیی و مەدەنیەکانەوە

زوربەی هەرە زۆری خەڵکی ئەم قسانە دەزانن و دەشزانن زۆر چاکتر لە من و تۆ دەریانبڕن و خەڵکیش لە دەوری سەری خۆیان کۆ بکەنەوە، بەڵام دیسانەوە ئەمەشیان ئەوە نیە کە ئێستا و لە ئەمڕۆماندا پێویستمانە، بەڵکو تەنها سێ خاڵی گرنگ هەیە کە پێویستمانە (شارەزا بوون لە پەروەردەکردن بە شێوەیەکی زانستی و تیۆری لە سەر ئاستی جیهانی، بەکردار کردنی پەروەردە وەك ئەرکێکی مرۆیی هەموولایەکمان، دڵسۆزی و بەردەوامبوونمان لەسەر ئەو دوو خاڵەی تر)، لێرەدا بە پێویستی دەزانین چەند نمونەیەکی زیندوو بخەینە ڕوو لەسەر پەیڕەوکردنی فەلسەفەی پەروەردە لە چوار چێوەی خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵگەدا :

بەردەوام ئێمە ڕادەکەین بەدوای دەستکەوتنی پێداویستی یەکانی ژیانماندا، چونکە لە قوڵایی ناخی هەمووماندا ئارەزوەکان چێنراون، بەهۆی ئەو ئارەزوانەمانەوە وێڵی گەڕانین بۆ گەیشتن بەو پێداویستیانەمان، هەریەکە لەو پێداویستیانە لەلای ئێمە دەبنە (ئامانج) ێك، ئیتر دەکەوینە جوڵە و چالاکی جۆراو جۆر بەمەبەستی گەیشتنمان بەو (ئامانج) ە، هەر کە ئەو (ئامانج) ە بە دیهات ئیتر لە لایەکەوە لە هەوڵی ئەوەداین ئامانجەکە تێرو تەسەل و پڕ بکەین، لە لایەکی تریشەوە هەوڵ دەدەین کە (ئامانجی دووەم) ی دوای ئەوەی یەکەم دیاری بکەین، تاکو ئینجا کار بکەین بۆ هێنانەدی و تێروپڕکردنی ئەویش، لەم کارەماندا دەیان پرسیار ڕووبەڕوومان دەبێتەوە و یەکە بەیەکە بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارانەدا دەڕۆین تا دەگەینە وەڵامی خۆمان، کە ئەوەش مانای هێنانەدی ئامانجەکەیە، بۆ نمونە : تۆ دەتەوێ ببیتە یاریزانێکی سەرکەوتوی تێنس، ئارەزووی ئەومت تێدایە، ئیتر لە خۆت دەپرسی :

- ئایا دەتوانم فێری تێنس ببم؟
- چۆن؟
- کێ فێرم بکات؟
- چەندی تێدەچێت لە ڕووی خەرجی و کاتەوە؟

- ئایا ئەو خەرجی و کاتەم هەیە؟
- یەکەم هەنگاوم چی بێت؟
- لە کۆتاییدا چ سوودو بەرژەوەندیەکم دەست دەکەوێت؟
- ئایا ئەو سودو بەرژەوەندیە بایی ئەوە دەبێ بەو ڕادەیە کات و خەرجی بۆ تەرخان بکەم؟

ئەمە بۆ خۆی فەلسەفە و پەیڕەوکردنەکەیەتی، چونکە کاری فەلسەفە مشت ومڕی پرسیارو وەڵامدانەوە و گەڕانە بە دوای وەڵام و سەر لەنوێ پرسیار کردن و پرسیارکردنەوەیە، کە جوڵە و چالاکی و چێژێك بە مرۆڤ دەبەخشێ و دەیبزوێنێ بەرەو پەراوە پێکردن هزرو مێشك و حیکمەتکاریی و جوانبینی ژیان و بوون و گەردون و بەها گەردونیەکان و جێکەوت و پێگەی مرۆڤ لە پانتایی (کات) و (شوێن) دا.

## چەند نموونەیەکی سادەتر دەخەینە ڕوو :

**نمونەی (١)** : بازرگانێکی دەوڵەمەندی شارنشین کە ناوی (ئومێد) ە، خانویەکی نایابی لە گەڕەکێکی پێشکەوتوودا کردوە، خاوەنی (٦) سەر خێزانە لە هەر دوو ڕەگەزەکە، هاوسەرەکەی ناوی (شیلان) ە، خوێندنی پەیمانگەی تەواوکردووە، ئێستا ژنی ماڵەوەیە و هیچ کاروپیشەیەکی تر ناکات، ئارەزووی لە خۆڕازاندنەوە و داوەتکردنی کەس و کاری خۆی و هاوسەرەکەیەتی، کارەکەرێکی بیانی لە ماڵیاندایە، یەکێك لە منداڵەکانی ئەم ماڵە ناوی (ئاریا) یە، لە پۆلی (٧) ی بنەڕەتیە، ئەم پیاوە هیوایەتی کۆکردنەوەی سامان و پارەو پولە، بەڵام درێغی ناکات لە خەرجکردنیدا، بە تایبەتی بۆ ماڵ و منداڵ و خزمانی، زوربەی کات چەند شەوو ڕۆژێك نایەتەوە ماڵەوە و جاروبار بە هەفتە لە دەرەوەی وڵاتە،

ڕۆژێکیان (ئاریا) نامەیەکی یەکێك لە مامۆستاکانی لە زەرفی داخراودا هێنابوەوە و دایە دەستی دایکی، دایکی نامەکەی کردەوە نوسرابوو : (بۆ بەڕێز بەخێوکاری ئاریا، دوای سڵاو من کە مامۆستای بیرکاریم، وا هەست دەکەم کە (ئاریا) باش لە بیرکاری تێناگات و زوربەی ڕاهێنانەکانیشی بە هەڵە شیکار کردوە و بەشداری ڕۆژانەی لە پۆلدا زۆر کەمە، هیوادارم ئاگاداری ئەو بارودۆخەبن و لە هۆکارەکەی ئاگادارم بکەنەوە.... لەگەڵ ڕێزدا.. ناو و واژۆی مامۆستای بیرکاری و ڕێکەوت).

(شیلان) نامەکەی بە وردی خوێندەوە، لەوکاتەدا باوکی (ئاریا) لە دەرەوەی وڵات بوو، خۆی نامەیەکی بۆ مامۆستاکە نووسیەوە : (بەڕێز مامۆستای بیرکاری، سوپاس بۆ نامە و ئاگادارکردنەوەکەتان، لەوانەیە بەڕێزتان تا ئێستا نەتانزانیبێ کە (ئاریا) توانای بیستنی لاوازە و پێویستە لە ڕیزی پێشەوەی پۆل دابنیشێت و...)

## هەڵەکە لە کوێدایە؟

١. دەبێ ئامانجی یەکەمی دایك و باوك خەمخۆری منداڵەکانیان بێ لە ڕووی پەروەردە و فێرکردن و تەندروستی و بەدواداچوونەوە، نەك سامان کۆ کردنەوە و داوەتکاریی، چونکە چارەنوسی منداڵەکە بەندە بەخوێندنەوە نەك بە پارە و پول لە ڕووی ڕۆشنبیریەوە.

٢. دەبوایە یەکەم ڕۆژی دەوامی ساڵ باوکەکە یان دایکەکە بە نوسراوێکی خۆیان و بەڵگە پزیشکییەکان بەڕێوەبەرو مامۆستایانی (ئاریا) یان ئاگادار بکردایەتەوە لەوەی کە (ئاریا) توانای بیستنی لاوازە، ئەگینا منداڵێکی زیرەکە.

٣. دەبێت مامۆستایان و بەڕێوەبەرو توێژەرەکانی قوتابخانە بە تەواوەتی زانیارییان لەسەر هەریەکە لە قوتابییەکان لە لابێت لە ڕووی تەندروستی و دەرونی و کۆمەڵایەتی و لایەن و بوارە پێویستەکانی ترەوە.

فەلسەفەی پەروەردە لێرەدا بەو جۆرە ڕۆڵی هەیە کە نابێ دایك و باوك لە ماڵ و

قوتابخانـه و كـۆلآن بـێ ئاگـابن لـه ڕەوتـی ژیـانی منالـەكانیان و گرفتـەكانیان و پێویستە خێزان و قوتابخانە لە پەیوەندی گەرم و گوڕو بەردەوامدا بن.

**نموونەی** (٢) : لە پشووی هاویندا، بەرنامەی خشتەی ژیانی ڕۆژانـەی منـداڵی خێزانێك وایـە كـە لـە كاتـژمێر (٥ – ٣٠ ر٦) ی ئێـوارە هەفتـەی سـێ ڕۆژ لەگـەڵ منداڵانی گەڕەك تۆپ تـۆپێن دەكـەن لـە گۆڕەپـانی گەڕەكەكـەیان ئـەمڕۆ كاتـژمێر بووە بە (١٥ ر ٧) ی ئێوارە و منـداڵەكە نەگەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە لە كاتێكـدا ماڵەكـە و گۆڕەپانەكە زۆر دوور نین و منداڵەكەش لـە پـۆلی (٧) ی بنەڕەتیـە، دایكەكـە بـە منالەكانی تری دەڵێت : ئادەی بزانن بۆچـی (دیـدەن) لـە یـاری نەگەڕاوەتـەوە (٣) چـارەكە كاتـژمێر لـە كـاتی خـۆی لایـداوە. بـراو خوشـكەكانی (دیـدەن) بـەرەو گۆڕەپـانی یاریەكـە دەڕۆن (دیـدەن) نـا دۆزنـەوە، كەسـیش لـە گۆڕەپانەكەمانـەوە، دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە دەبینن (دیدەن) لە لایەكی ترەوە بەرەو ماڵەوە دێتەوە، كە لەوە ناچێ لە گۆڕەپانەكەوە بێتەوە، بەگەیشتنی ماڵەوە، دایكی لێی دەپرسێت :

- كوڕم ئەم ئێوارەیە زۆر دواكەوتیت، لە كوێ بویت؟
- دایە ئەی نازانێ ئەم ئێوارەیە نۆرەی یاریمان هەبوو؟
- باشە بەڵام كاتەكەت لایداوە.
- ئاخر دوای تەواو بوونی یاریەكە، هاوڕێكەم گەیاندەوە ماڵی خۆیان...!
- باشە كوڕم، بەڵام جارێكی تر وامەكە، لە كاتی خۆیدا بگەرەوە ماڵەوە.

## هەڵەکە لە کوێ دایە؟

١. دایکەکە خشتەی چوونە دەرەوەی منداڵەکەی و کاتەکەی نازانێ و لێی بێئاگایە ئەی چۆن ئەو منداڵە چوەتە دەرەوە و ئەو نەیزانیوە و پرسیشی نەکردوە.

٢. کاتێك منداڵەکە درەنگ گەیشتە ماڵەوە، دایکەکە بۆچی هەروا بە سادەیی وتی : دەباشە کورم جاری تر دوا مەکەوە لە گەڕانەوەت بۆ ماڵ، ئەی نابێ ئەو دایکە وردەکاری بکات لەوەدا ئاخۆ ئەو (٤٥) خولەکە زیادە.

- لە کوێ بوە؟
- لەگەڵ کێ بووە؟
- خەریکی چی بووە؟
- بۆچی بە ئاراستەی پێچەوانەی گۆڕەپانەکە هاتووەتەوە بۆ ماڵەوە؟
- بەچی دڵنیایە کە هەر چویشە بۆ یاریەکە؟

فەلسەفەی پەروەردە لێرەدا لەوەدا ڕەنگ دەداتەوە کە پێویستە دایك و باوك (جدی) بن لە پەروەردە کردنی منداڵەکەیانداو ئامانجەکەش هەر ئەوە نیە کە منداڵەکە ون نەبوە و گەڕاوەتەوە بەڵکو ئەوەیە ئایا لە کوێ بووە و لەگەڵ کێ بووە و چی کردوە؟ چونکە ئەو شتانە نابێ هەروا بە سادەیی تێپەڕن.

**نمونەی (٣)** : (شەماڵ) کوڕێکی تەمەن (٢٩) ساڵە، دوو ساڵ لەمەوبەر ژیانی هاوسەری پێکهێناوە، لەگەڵ هاوسەرەکەیدا زۆر ئاسودەن و گونجاون، تەنها یەك بەبەی ساوایان هەیە، ناوبراو فەرمانبەری میریە، زۆر ئارەزووی لە خوێندنەوەیە، بە تایبەتی کتێبی چیرۆك و پەروەردەیی، دوای دەوامی خۆی ئیشی تەکسی دەکات، ئەمڕۆ لە گەڕەکێکەوە تێپەڕ بوو، لە دورەوە قەرەباڵغی کۆمەڵێك منداڵی بینی، کە چووە پێشەوە بینی (٣) منداڵ زۆر بە توندی بەرەنگاری یەك بونەوە و شەڕ دەکەن، (شەماڵ) ئوتۆمبیلەکەی خۆی لە دورەوە وەستاندو بەرەو منداڵەکان ڕۆیشت، بینی کە (٣) منداڵ بەو پەڕی توندو تیژیەوە شەڕ دەکەن و یەکێکیان ئاسنێکی ژەنگاوی نوك تیژی بەدەستەوەیە و دەیەوێ بیکێشێ بەسەری

بەرانبەرەکەیدا، شەماڵ بە خێرایی منداڵەکەی گرت و ئاسنەکەی لێ سەند، بەڵام منداڵەکە ڕایکردو کەوت، هەندێ دەست و پلی بریندار بوو، ئاپۆڕای منداڵەکانیش کە تەنها سەیرکەر بوون بڵاوەیان لێ کرد و لەو ناوەنەمان، منداڵە کەوتوەکە بەگریان خۆی کرد بە ماڵی خۆیاندا و دایکەکەش کە ئەوەی بینی کەوتە هاوارو جنێودان بەرەو ڕووی شوێنی ڕوداوەکە، (شەماڵ) وتی : خانمە بەڕێزەکە، من گرتم و نەمهێشت شەڕ بکەن، ژنەکە قۆڵی منداڵە خوڵاوی و خوێناویەکەی خۆی گرتبوو، کەوتە جنێودان بە هەموو کەسێك، هەڕەشەی دەکرد کە ئێستا تەلەفۆن دەکات بۆ پۆلیس ژمارەی تەکسیەکەیشی نووسی و وتی : کاکە گیان تۆش نەڕۆییت من دڵنیام تۆ ئەم شەڕەت ناوەتەوە، شەماڵ هەر چەند قسەی نەرم و نیانی دەکرد، ژنەکە هەر توڕە دەبوو، ئەوەی دەیگوت نەیدەگوتەوە، هەر قسەی دەکرد، قسەی نەدەبیست، دەیگوت بەخوا هەتا ئەو منداڵە بە دەستی منداڵەکەی خۆم تۆڵەی خۆی نەکاتەوە وازناهێنم، منداڵەکەش هەر دەیگوت : دایکە بەخوا تاوانی کەس نیە، خۆم کەوتم بە زەویدا، بەڵام نەقسەی شەماڵ و نەقسەی منداڵ نەدەچوو بە مێشکیدا.

## هەڵەکە لە کوێدایە؟

١. بەخێوکارو دایك و باوك بۆچی بێ ئاگان لە منداڵەکانیان، ئایا منداڵ ناناسن کە زوو توڕە دەبێ، زوو سارد دەبێتەوە، کەتوڕە بوو سنورو مەترسیەکاننازانێ و هەرچی بیەوێ دەیکات.

٢. لە کاتی چوونە دەرەوەیدا بۆچی بەدواداچوون و چاودێری ناکات؟

٣. ئەرکی یەکەمی دایکەکە ئەوەیە دەست و دەم و چاو بۆ منداڵەکەی بشوات و ئەگەر برینداره تەداوی بکات و بەرگەکانی بگۆڕێت، نەك خۆی بئالێنێتە شەڕی منداڵان، کە تاوێك ئاش و تاوێك ماشن، واتە منداڵ قینی تیا ناوەستێ و هەرساتێکە و دواتر ئاشت دەبنەوە و پێکەوە یاری دەکەنەوە، ئیتر پێویست بەوە ناکات شەڕی منداڵان بکرێتە شەڕو ناکۆکی گەورەکان و دراوسێکان.

٤. گوێ لە شۆفێری ئەو تەکسیە بگرە، کە نەتۆ دەیناسێت و نە ئەو تۆ دەناسێت، تا بزانێ ڕوداوەکە چۆنە، بۆچی بڕیاری بێ زانیاری و یەکلا کەرەوە و سەربەخۆ دەدەیت، لە بنەڕەتدا ئەو شۆفێرە شەڕەکەی کپ کردۆتەوە و منداڵەکەی تۆ، یان منداڵەکەی تری لە مەرگی بە ئاسنە ژەنگاوی ڕزگار کردوە، شایستەی سوپاسە.

فەلسەفەی پەروەردەیی فێرمان دەکات کە هەمووومان بەرپرسین لە پەروەردەکردنی نەوەکانمان، منداڵەکانمان هی هەموومانن، ئێمەی گەورە بەرپرسین لە ئاراستە کردن و چاککردنی ڕەوشت و ڕەفتاریان، گرنگ نیە ئایا خۆمان پیشەمان چیە و ئەو منداڵانە هی کێن و کێ خاوەنیانە، چونکە لە بنەڕەتدا منداڵی ئەم گەلەن و مرۆڤن و ژن و پیاوی دوا ڕۆژن و ئەمڕۆ ئێمە خاوەنی هەموویانین و سبەینێش خاوەنی هەموومانن بە خۆمان و وڵات و ژینگە و نیشتمان و حکومەت و کولتورو ژیانمانەوە، کەواتە دەبێ هەموومان بە ئەرکی پەروەردەیی خۆمان هەستین و کەمتەرخەمی نەکەین، ئامانجمان پەروەردە کردنێکی ڕاست و دروست بێ، ئەگەر چی لەو پێناوەشدا بەهەڵە سزا بدرێین یان وەك شەماڵ بانگهێشتی بنکەی پۆلیس و بەندیخانەش بکرێین، پەروەردەکردن شۆڕش کردنە، گۆڕانکاریە، دروستکردنی مرۆڤی ئایندەیە، کاری وا گەورەش بێ گومان کۆسپ و تەگەرەی تێدایە و ڕێگەی گەیشتن بە ئامانج بە گوڵ و گوڵزار نەڕازاوەتەوە.

**نمونەی** (٤) : (ڕێبوار) و (کامەران) دوو دراوسێی یەکترین، لە یەك گەڕەکدان ماڵەکانیان بەرانبەری یەکتریە، ڕێبوار کەسێکی هۆشیارو چاکە و مرۆڤێکە خەم لە کاسپی و پەروەردەی ماڵ و منداڵی خۆی دەخوات، فەرمانبەرێکی بەرپرسە لە بەشێکی هونەری لە وەزارەتی ڕۆشنبیری، (کامەران) بە تەمەن (٦) ساڵ لە (ڕێبوار) گەورەترە، خێزانێکی زۆر تری هەیە و زۆر گوێ ناداتە ماڵ و منداڵ. هیوایەتی خواردنی خۆش و ڕاوەماسی و کۆڕو کۆبوونەوەیە لەگەڵ هاوتەمەنەکانی نووسینگەی ئاڵوگۆڕی دراوی هەیە، بارودۆخی دەرامەت و

گوزەرانی لە سەرووی مام ناوەندیەوە، زوربەی کات لـە دەرەوەی ماڵەوەیـە، لەگـەڵ خاتوو (دەریا) ی خێزانـی زۆر نـاکۆك و نـەگونجاون، لـە یـەکتری نـاڕازین و لەبـەر چاوی منداڵـەکانیان دەم بـە دەمـەو شـەڕە جنێـو سوکایەتی بـە یـەکتری دەکـەن، بەڵام خاتوو (بەفرین) ی هاوسەری (ڕێبوار) ژنێکی هێمن و وریا و دانایـە، لەگـەڵ (ڕێبوار) دا زۆر تەباو گونجاون، زوربەی جار ڕێبوار زوو دەگەڕێتەوە بۆ ناو مـاڵ و منداڵەکانی، قسەی خۆشی و یارییان لەگەڵدا دەکـات، هاوکـاری (بـەفرین) دەکـات لـە ئیش و کاری ماڵدا، ناوبەناو گسك دەدات و قاپ دەشـۆرێ و جاروبـار چێـشتیش لێ دەنێ، ماڵی (کامەران) بەگشتی زۆر چارەی ماڵی (ڕێبوار) یـان نـاوێ و دەنگیـان لـە یەکتری دابڕیوە و گەلێك جار گرفت و کێشەشیان بـۆ دروست دەکـەن، بـەڵام مـاڵی (ڕێبوار) گوێ بە وشتانە نادەن و حەز ناکەن هیچ کەسێك لێیان ناڕازی بـێ، هـەر چـەندە خـاتوو (دەریـا) زۆر جـار لـە نهۆمی دووی مـاڵی خۆیانـەوە چـاو دەبرێتـە پەنجـەرەی ژوری چێـشتخانەکەی مـاڵی (ڕێبـوار) و دەبینـێ کـە (ڕێبـوار) خـەریکی ئیش و کاری ناوماڵ و قـاپ شـۆردنە ئـیتر دێتـە خـوارەوە خێزانـی خـۆی و ژنـانی گەڕەك تێدەگەیەنێ کە ڕێبـوار بوەتـە کارەکـەری ژنەکـەی و ئیـشی ژنانـە دەکات، دەیـەوێ بـەم شـتانە سـوکایەتی بـە کەسـێتی ڕێبـوار بکات، بـەڵام مـاڵی ڕێبـوار لـە گەڕەکدا بە ماڵێکی نمونەیی و پەروەردەیی ناسراون، تەنانـەت خـودی ڕێبـوار وەك پیاو ماقوڵێکی نـاوداری گەڕەکـە سـەیر دەکـرێ و بـۆ زوربـەی بۆنـەو ئاهەنگـەکان بانـگ دەکرێ و بوەتە جێگەی متمانە و پرس و ڕای خەڵکی گەڕەك، ماڵی کامەران، لە گەڕەکدا خۆشەویست نین و زوربەی خەڵکی گەڕەك سەردانیان ناکەن مەگەر لە بۆنە زۆر گرنگەکاندا، منداڵەکانی خۆیان وا فێر کردوە کە تێکەڵاوی کەس نـەبن و هاتوچۆی کـەس نەکەن. هەمیـشە کامـەران و دەریـای خێزانـی سـەرەڕای نـاکۆکی نێوان خۆشیان لە منداڵەکانی خۆیـان دەدەن و هەڕەشـەیان لێ دەکـەن و ڕێگـەیان لێ دەگـرن کـە بێنـە دەرەوە و تێکـەڵاوی خـەڵکی ببن، بـە منداڵـەکانیان دەڵـێن : ئێمـە خۆمان بە ڕەفیقی ئەم گەجەرو گوجەرانەی گەڕەك نـازانین، زۆر لـە وانـە نـاودار تـرو مـەزنترین، خـەڵکی ئـەم گەڕەکـە بـۆ ئـەوە نـابن تێکـەڵاو یـان بـین، قاچتان

دەشكێنین لەگەڵیاندا بتانبینین.

دەمەو عەسرێك كامەران بەرەوماڵەوە دەهاتەوە، لە كۆڵانەكەی خۆیان بینی كوڕە تەمەن (١٠) ساڵەكەی خۆی لەگەڵ منداڵەكانی ماڵی ڕێبوار یاری دەكات، بەڕق و قینەوە هەڵمەتی بۆ براو بە گوێچكە ڕاكێشان كردیەوە بە حەوشەداو بە توندی دەرگاكەی داخست، بردیە ژورەوە و تێرو پڕی تێ هەڵدا و بە تووڕە بونەوە وتی :

ئەمە دواجارە لەگەڵ ئەوانەدا بتبینم..! چەند جارێكی تریش پێم گوتیت، ئەوانە هاوشانی ئێمە نین، من هەزاری وەك ڕێبواریش بە پیاو دانانێم، سەد جار سڵاوم لێ دەكات ئینجا جارێك وەڵامی دەدەمەوە، من هیچ پێویستم بە وانە نیە، هەر ئەوان پێویستیان بەمن هەیە، من ماڵ و منداڵی خۆم لە ژورەوە قایم دەكەم و لەشەڕو هەرای ئەم گەڕەكەش خۆم دور دەخەمەوە، ئەگەر دایكتان بەشەر بوایە كە من لە ماڵەوە نیم ڕێگەی چونە دەرەوەی نەدەدان، بەڵام هەموو گێچەڵەكە لە ژێر سەری ئەو دایە، من دەمەوێ هیچ پەیوەندیەكتان لەگەڵ منداڵ و خەڵكی گەڕەكدا نەبێ، دەمەوێ بێزت نەیات لەگەڵ ئەو منداڵە پیسانەدا یاری بكەیت، دەبێ وەك باوكت پیاو بی، لەو منداڵانە بێ، بەم جۆرە منداڵەكە وردە.. وردە... كەوتە ڕق و دژایەتی كردنی منداڵانی گەڕەك و شەڕیان پێ دەفرۆشێت و یاری لێ تێكدەدان و.... هتد.

# هەڵەكە لە كوێدایە؟

## جا هەڵە لە كوێدا نیە؟

١. نابێ ناكۆكی خێزانی، بە تایبەتی ناكۆكی و ناتەبایی ژن و مێرد بگوازرێتەوە بۆ منداڵەكانیان و ئەو حاڵەتەی گەورەكان نابێ كار بكاتە سەر تێكدانی پرۆسەی پەروەردەی منداڵەكان.

٢. بەزەبرو زەنگ چارەسەری كێشەكان ناكرێت.

٣. هەموو مرۆڤەكان مرۆڤن، هاوشانی یەكترین و كەس لە كەس گەورەتر و گرنگتر نیە.

٤. دەبێ هەر تاکێك لە کۆمەڵگە هۆشیارو و بە ئاگا بێ و شارەزا بێ لە بواری پەروەردە دا.

٥. مرۆڤەکان پەیوەندی مرۆڤایەتی بەیەکیانەوە دەبەستێ، نەك پەیوەندی بەرژەوەندی و ئیش بەیەکتری بوون.

٦. منداڵ لاپەڕەی سپی یە بۆ نوسین، هەر چی تێدا بنوسیت، سبەینێ ئەوەشی تێدا دەخوێنرێتەوە، لەبەر ئەوە فێری ڕق و قین و دوبەرەکەییان مەکە، دەرگای ماڵ و ژیرییان لێ دامەخە، لە کۆمەڵگە دایانمەبڕە، چونکە سبەینێ کەسانێکی نەگونجاوی کۆمەڵایەتی و شەڕەنگێزیان لێ دەکەوێتەوە.

٧. ئێرەیی بردن مەکەرە هۆکاری تێکدانی ئاشتی و تەبایی کەسانی دەوروبەرو خزم و هاوڕێ و هاو پیشە و دراوسێکانت.

فەلسەفەی پەروەردە لە وەدایە کە نابێ میزاج و حاڵەتەکانی هەڵچوونەکانمان تێکەڵ بکەین بە پرۆسەی پەروەردەکردن و دەبێ بیر لەوە بکەینەوە ئاخۆ خەڵکی چۆن و بەکام شێواز گەیشتونەتە بەختەوەریو ئاسودەیی و دڵشادی و سەرفرازی ئێمەش ئەو ڕێگایانە تاقی بکەینەوە، چونکە هەرگیز دۆستایەتی و ئاشتی بەجەنگ و ململانێ و توڕە بوون و خۆ خواردنەوە و دابڕان بەرپا نابن، هەموو جەنگ و ناکۆکیەکیش تەنها دوو ئەنجامی لێ چاوەڕوان دەکرێت یەك (مەرگ)، دوو (پەشیمانی) دەتوانیت خۆت یەکە بە یەکەی هەڵوێست و کارەکانی هەریەکە لە ئەندامانی خێزانی (ڕێبوار) و (کامەران) تاوتوێ بکەیت و چارەسەریان بۆ دابنێیت.

**نموونەی (٥)** : مامۆستا هاتە پۆلەوە، بینی پۆلەکە زۆر پیسە و چەندین پارچە کلێنکس و کاغەزو بەرگی بسکیت و بنێش بە ملاولای پۆل و ژێر کورسیەکاندا بڵاو بوەتەوە. مامۆستا کە ئەمەی بینی بەبێزاری و توڕەییەوە گەڕایەوە دواوە و وتی : بەخوا نایەمە پۆلەوە هەتاکو پاکی نەکەنەوە...!

## هەڵەکە لە کوێ دایە؟

زوربـەی هەڵـەو کەموکوریـیـەکانی ئێمـە لـە ئـەنجامی خـراپ بـەکارهێنانی و شـەو شـێوازی دەربڕینەکانماندایـە، شـێوازی دەربڕینـی ڕسـتە زۆر گرنگـە و کاریگـەری گەورەی هەیە بۆ سەر بەرانبەر، بۆ نمونە هاوڕێیەکت لە دەرگای ماڵـەوەتان بـدات، تـۆش خـۆت ئامـادە کـردوە بـۆ چـوونە بـازاڕ، کاتێـك دەچـیتە دەرەوە، دەبینـی هاوڕێکەتە دەیەوێت بێت بۆ ماڵتان، تۆ دەتوانیت بـە چـەند شـێوازێك بـۆ چـوونی خۆت دەربڕیت، ئـەو شـێوازانەش کەوتونەتـە سـەر ڕای خـۆت کـە ئـاخۆ دەتـەوێت ئێستا ئەم هاوڕێیـەت خولـق بکـەیت بـۆ هاتنـە ژورەوە و مانـەوە یـاخود دەتـەوێت بڕوات و نەیەتە ژورەوە، چونکە تۆ بەنیازی بازاڕیت، بۆ نموونە ئەم چـەند جـۆرە وەڵامەت لەبەردەستدایە :

- لە کاتێکی باشدا هاتیت، ئەی نافەرمووی بۆ ژورەوە؟!
- قەی چێ ئەکا فەرموو وەرە ژورەوە، ئەی بۆنا؟
- ببورە، من ئیشێکی زۆر گرنگم نیە، دواییش بێت دەکرێت.
- خۆزگە زووتر بهاتیتایە، یان تەلەفۆنێکت بۆم بکردایە! ئەمانە هـەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ناتـەوێت بێتـە ژوورەوە وخولقەکەت بەگـەرم و گوڕ نیە، جگە لەوەش شێوازی قسەکردنت و ڕەنگـی ڕوخسـارت و سـاردو سڕی چاوەکانت بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ناتـەوێت بێتـە ژورەوە بـەڵام ئەگەر بە ڕاستت بێت و حەز بکەیت بێتە ژوورەوە، ئەوا وشەو ڕسـتەکانی دەربڕینەکـەت و شێوازەکەیـشی جیـاوازترە لـە جـاری پێـشوو، بـۆ نمونـە یەکێك لەم ڕستانە بەکار دێنێت :
- دەگ بەخێر بێیت، زۆر بیرم دەکردیت، باشتر کە هاتیت، فەرموو.
- مـن بـەنیاز بـووم بـێم بـۆ لات، دڵ ئاوێنـەی دڵـە، بـەڵام باشـتر کـە خـۆت هاتیت.
- بەخوا دێیتە ژورەوە، من لەبەر دەرگا هیچ ناڵێم.

- گەشامەوە بەدیدارت، دەی فەرموو گوڵەکەم بۆ ژورەوە.

**لە نمونەی پاککردنەوەی پۆلەکەشدا هەڵەکە لەوەدایە کە** :

١. مامۆستاکە نابێت بڵێت پۆلەکە ئێوە پاکی بکەنەوە، بەڵکو دەبێ بڵێت : وا هەست دەکەم ئەمڕۆ پۆلەکەمان کەمێك پیسە، با هەرمومزێك بکەین و پاکی بکەینەوە، مامۆستا خۆی یەکەم کەس بێت کە دەست پێبکات.

٢. بۆ پەیرەوکردنی هەموو فەرمانێکی چاکەکاری دەبێ فەرمانکارەکە (فەرماندەکە) خۆی یەکەم بێت کە بەجێبەجێکردنەکە هەڵدەستێ.

فەلسەفەی پەروەردە لەوەدایە کە کاری پراکتیکی پەروەردەیی کارێکی هەرمومزیانە و گشتیە و دەبێ هەمووتیایدا بەشدار بین.

**نمونەی (٦)** : خێزانێك کە لە دایك و باوك و (٥) منداڵی تەمەن و ڕەگەز جیاواز پێکهاتووە پێکەوە دانیشتوون و سەیری فیلمێکی کەناڵێکی تەلەفزیۆنی بیانی دەکەن، فیلمەکە باس لەوە دەکات کە کۆمەڵێك دزی دەمامکدارو چەکدار چوونەتە سەر ماڵی دەوڵەمەندێك، لەو ماڵەدا تەنها کوڕێکی ئازاو جەربەزەی تەمەن (١٢) ساڵی لێیە، کوڕەکە لێیان ڕادەپەڕێ و بە زیرەکی و وریایی و ئازایی خۆی بە هۆی چەقۆکانی چێشتخانەکەیان و دەمانچەیەکی منداڵانەوە دزەکان ڕاودەنێ و ماڵ و قاسەکەی باوکیشی دەپارێزێت و دواتر تەلەفۆن بۆ پۆلیس دەدات و پێش دەرباز بونیان دەیانداتە پۆلیس.

## هەڵەکە لە کوێدایە؟

١. بۆچی منداڵێکی تەمەن (١٢) ساڵ بە تەنها لە ماڵەوەیە؟

٢. ئەم منداڵە لە کێ فێربووە کە چەقۆ و دەمانچەی منداڵانە بەکار بهێنێ؟

٣. ئایا ئەو منداڵە لەو ئاستەدایە ئەو بەربەرەکانێیە بکات؟

٤. ئەو منداڵانەی دانیشتون بۆ سەیری ئەو فیلمە تەمەنیان شیاوە بۆ ئەو بینینە و دەبێ هەڵوێستیان بۆ ڕوداوی لەو جۆرە چۆن بێ؟

فەلسەفەی پەروەردەلەوەدا ڕۆڵ دەبینێ کەنابێ منداڵ چێژی ژیانی منداڵێتی لێ زەوت بکرێت و کاری گەورە کەسانی پێ بکرێت، دەبێ دەزگاکانی ڕاگەیاندن تەواو کەری ئەرکی پەروەردە کردنی واقعیانەی منداڵ بن و شتی دەگمەن گشتاندنی بۆ نەکەن و بترسن لەوەی کە هەر فیلم و بەرهەمێك لایەنی نەشیاوو ڕوویەکی لێڵی هەیە لەسەر پەروەردەی نەوەکان و منداڵان و نابێ بەبێ بوونی سانسۆری پەروەردەیی بە ئارەزووی خۆیان فیلم و بابەت لە هەموو کاتێکدا پەخش بکەن، بەڵکو ئەمانە بابەتی گەورەکانت و دەبێ لە دوای کاتی خەوتنی شەوانەی منداڵ پەخش بکرێن و بینەرەکانی تەنها کەسانی گەورەبن کە تەمەنی منداڵییان تێپەڕاندوە، هاوکان خێزانیش بەرپرسە لەوەی کە کاتی دیاری کراودا بنێ بۆ منداڵەکانی بۆ سەیری TV لەبەرنامە شیاوەکانی منداڵان، نابێ منداڵ لەگەڵ خێزان سەیری TV بکات بەڵام ئەوەیان شتێکی باشە کە خێزان لەگەڵ منداڵ دابنیشێت بۆ بەرنامەی منداڵان، چونکە منداڵەکە دڵشاد دەبێ کە ئەندامانی خێزانەکەی دەبینێ لەگەڵیدا دانیشتوون و سەیری بەرنامە و ماوەی منداڵان دەکەن، لە ڕاستیدا ئەمە لای منداڵەکەم واتا دان پیاتان بەکەسێتی ئەو منالە و بەرنامەکەی و دەبێتە هاندەری بۆ ئەوەی سوود لە TV و ماوەی خۆی وەربگرێ.

**نموونەی** (٧) : پیاوێك پسوڵەی داوەتنامەی لە خوێندنگەی کچەکەیەوە بۆ هاتووە لە ڕۆژی پێنج شەممە دا تاکو ڕۆژی شەممە، واتا دوای ڕۆژێکی تر لە کۆبونەوەی باوکاندا ئامادەبێ، چونکە کچەکەی خوێندکاری پۆلی (٩) ی بنەڕەتیە، لەوکاتەشدا باوکی کچەکە لە پرسەی کەسێکی نزیکیانە لە شارێکی تر، دایکیشی نەخۆشە و لە ماڵەوە کەوتوە، ناچار تەلەفۆن دەکات بۆ خاڵی کچەکە لە جیاتی بچێت بۆ کۆبونەوە کە.

## هەڵەکە لە کوێ دایە؟

١. دەبێ بەڕێوەبەرو مامۆستاکان هەر لەسەرەتای ساڵی خوێندنەوە پلانی خۆیان دابڕێژن لە ماوەی (١) مانگدا، کە بریتیە لە پلانی ڕۆژانە و هەفتانە و مانگانە و ساڵانە، لەو پلانە دا کاتی کۆبونەوە کانیان لەگەڵ دایکان و باوکان بە تەواوەتی دیاری بکەن و هەر لە سەرەتای ساڵەوە نوسخەیەك لەو پلانە بدەن دایك و باوکی قوتابیەکانیان، لە ڕاستنیدا باشتر وایە باوك و دایك بەشداربن لە پلانی ساڵانەی قوتابخانەدا و قسە و ڕاوبۆچونیان لێ وەربگیرێت.

٢. ئەگەر دایك و باوك نەتوانن ئامادەی کۆبونەوەکە بن، دەبێت کە سێکی تر لە جیاتی خۆیان نەنێرن، هەروەها دەبێ مامۆستاکان لەو جۆرە بارودۆخانەدا کاتی تر دیاری بکەن بۆ ئەوانەی کە نەیاتوانیوە ئامادە بن.

٣. هەندێ خوێندنگە دوو ڕۆژ پێش کاتی کۆبونەوەکە پسولەی داوەت دەنێرن کە ئەمە شیاو نیە و لانی کەم دەبێ هەفتەیەك پێش کات بێت.

٤. پێویستە کۆبونەوەکان گشتی نەبن بەڵکو هەر جارێك و کۆبونەوە تەنها بە (١٠ – ٢٠) باوك و دایك بکرێت، وە پێویستە دایك و باوك پێکەوە ئامادەبن نەك تەنها یەکێکیان بچێت، تاکو بە وردی هەموو لایەنێکی ژیانی قوتابیەکە تاوتوێ بکەن لە ڕووی کۆمەڵایەتی و هیوایەت و پەروەردە و زانستی و ئابووری و تەندروستی و دەرونی یەوە.

پێویستە فۆڕمی زانیاری هەڵسەنگاندنی خوێندکار بەشێوەی مانگانە لە لایەن قوتابخانەوە ڕەوانە بکرێت بۆ هەموو دایك و باوکێك.

فەلسەفەی پەروەردە لەوەدا ڕۆڵ دەبینێ کە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن پرۆسەیەکی بەردەوامی هەرەوەزیانەی ئەو تۆیە کە دەبێ هەموو کەسە پەیوەندیدارەکان بە منالەکەوە کۆ بکاتەوە، تاکو یەك شێوازو بەرنامەی یەکانگیریان هەبێ بۆ پەروەردە کردن، نەبادا دوو جۆرە پەروەردەی دژ بە یەك لە نێوان خێزان و قوتابخانەدا ئاراستەی مندال بکرێ، چونکە ئەگەر وا بێت ئەوا

منداڵەکـە نازانــێ کـام جـۆرە پەروەردەکردنــەیان ڕاسـت و دروسـتە و سـەری لێ دەشـێوێ. هـەروەها دەبــێ دایـك و بـاوکیش بـە یـەك جـۆرە شـێواز یـەك جـۆرە پەروەردە ئاراستەی منداڵەکەیان بکەن و دژە پەروەردەی یەکتری نەبن.

## یەکانگیری بیری پەروەردەیی

مرۆڤـەکان هەمـە جـۆرو هەمـە چەشـنن، لـە قیافـەت و بـاڵاو شـێوەی جەسـتەو ڕوخسارو دەنـگ و ڕەنگیانـدا جیـاوازن، لـە تەمـەن و ئاسـتی ژیـری و ڕۆشـنبیری و کۆمەڵایەتی و دارایی و بیرو بۆچوندا لـە یـەکتری ناچـن، ئـەم جیـاواز بوونەشـەکە ڕوویـەکی گـەش و جـوانی بـە ژیـان بـە خـشیوە، بـەڵام ئـەوەی دەمانـەوێت لێـرەدا ڕوونی بکەینەوە ئەوەیە کە مـەرج نیـە بـوونی جیـاوازی لەهـەم و کـات و شـوێن و ئاسـت و دۆخێکـدا بــە سـوود بـێ، لــە هەنــدێ باروکـات و دۆخـدا جیاوازیــە جەوهەریەکان کوشندەن و نابێ بوونیـان هـەبێت. ئـەو شـوێن و دۆخانـەش هێڵـە سورەکانی پەروەردەن و مافی هیچ کەسێك نیـە بیانبـەزێنێت و بـەپێی خواسـت و میزاجی خۆی بەکاریان بهێنێ، بۆ نمونە :
دەبێ هەموو مرۆڤەکان کۆك بـن لەسـەر ئـەوەی کـە نابـێ ژینگـە پـیس بکـەین و پێویستە کار بکەین بۆ پـاکراگرتنی، لەبـەر ئـەوە دەبـێ هـەموو مرۆڤـەکان لـەوەدا هاو دەنگ بن و پێچەوانەی یەکتری بن، ئەگەر پێچەوانە بوون هـەبوو، واتـە هێڵـە سورەکان بەزێنراون کە زیانی گشتی تێدایە.

## با نموونەیەکی ڕوونتر بخەینە ڕوو :

نابێـت مـرۆڤ تونـدو تیـژ بێـت و هـیچ کەسـێك بـۆی نیـە مرۆڤـەکان و ئـاژەڵ و گیانداران ئازار بدات (نە ئازاری جەستەی و نـە ئـازاری دەروونـی) وە نابێـت هـیچ پاساوێك بکەینە بیانوو بۆ ئازاردانی خەڵکی، کەواتە نابێ توندو تیژی لە خێزاندا هـەبێت، نابێ ژن و مێـرد یـەکتری ئـازار بـدەن، نابـێ گـەورەکانی خێـزان ڕێگـەی

توندو تیژی بگرنە بەر لە سەپاندنی بڕیارەکانیاندا بەسەر منداڵەکانیاندا هاوکات نابێ توندو تیـژی لـە قوتابخانەکانیـشدا هـەبێت، بـە هـەمان چەشـن نابـێ لـە کۆمەڵگەشـدا توندوتیـژی هـەبێت، خـۆ ئەگـەر لـە یـەکێك لـەو شـوێنانەدا (مـاڵ، قوتابخانە، کۆمەڵگە) توندو تیژی هەبوو، بەڵام لە دوانەکەی تردا نەبوو، ئەوا وەك ئەوە وایە لە هەر سێکیاندا هەبێت، لە ڕووی پەروەردەییە یەوە چونکە لە بنەڕەتدا نابێ توندو تیژی هەبێت لە هیچ شوێن و هیچ کاتێکدا، ئەگەر هەبوو مانای وایە یەکانگیری و یەکدەنگی نیە لە پرەنسیپی پەروەردەیی دا. دەبێ هەموو مرۆڤـەکان خـاوەنی یـەك جـۆرە بیرکردنـەوە و بڕیـار بـن لـەو هێڵـە سـورو ستراتیژیانەدا، واتە بۆ نمونە کاتێك دەڵێن نابێ لە کۆمەڵگەی کوردستاندا منداڵ جگەرە بکێشێت، کەواتە دەبێت لەپەرلەمانەوە بە یاساو بڕیار دەربکرێت کە نابێ جگەرە بـە منـداڵ بفرۆشـرێت لـە دوکانـەکان و بازارەکـان و کارگەکانـدا، وە دەبـێ سزای فەرمی و دیاریکراو دابنرێت بۆ ئـەو کەسانەی کـە فرۆشیاری جگـەرەن بـە منداڵان یان هاندەریانن بۆ جگەرەکێشان، یان ڕێگریـان نـین لـە جگەرەکێشانیاندا، هاوکـات دەبـێ وەزارەتـی (پـەروەردە و تەندروسـتی و کۆمەڵایـەتی و نـاوخۆو بازرگانی) یش پێکـەوە بڕیـارو بـاج و ڕێنمـایی و هەڵمـەتی هۆشیاروکردنەوەیان هەبێت، بەم جۆرە هەموو مرۆڤەکانی کوردستان خۆیان لەو کارە خراپە دەپارێزن و بە ئەرکی سەرشانی خۆیانی دەزانن کە ڕێگە لە منـداڵ بگـرن و نـەهێڵن جگـەرە بکڕێ و بفرۆشـێت و بکێـشێت، لـەو بارەیـەوە هـەموو کەسـەکان وەکـو یـەك بـیر دەکەنەوە وەکو یەکیش هەڵوێست وەردەگرن و ڕەفتـار دەکـەن، واتـە دژی یـەکتری بیر ناکەنەوە، لەبەر ئەوە پرۆسـەکە سـەرکەوتوو دەبـێ. ئـەوەی قازانجیش ئـەکات بـەرەی نـوێ یـە لـە ڕووی وەرگرتنـی پەروەردەیـەکی ڕاسـت و دروسـتەوە، واتـە بەرانبەر بە (یەك کاری هەڵە) هەموو کەسەکان هاو دەنگ بوون، مامۆستا و دایـك و بـاوك و خـەڵکی سـەر جادەکـان و قەسـاب و لێخـوڕینی تەکـسی و پیـشەوان و کاسـبکاران لـە شـارو لادێ بـە هـەر دوو ڕەگـەزەوە یـەك دەنـگ بـوون و بـیرو بـۆ چونیان تەواو کەری یەکتری بوون،

ئەمەیە یەکانگیری بیری پەروەردەیی، بەڵام ئەگەر منداڵ لە خێزانەکەیدا ئازار بدرێت و لە گوڵ کاڵتری پێ نەوترێ ئەمە خراپە، دەبێت خێزانەکەیش و فێر بکرێت کە لە گوڵ کاڵتری پێ نەوترێت، ئەوسا دەتوانین بڵێین کارمان کردوە دەتوانین بڵێین کارمان کردوە بۆ رێگەگرتن لە بڵاو بوونەوەی توندو تیژی لە پرۆسەی پەروەردەدا.

کەواتە دەبێ سەرەتا هەموو لایەکمان بیرمان یەکانگیر بکەین و هەموومان بە هەمان ئاراستە بیر بکەینەوە بۆ دژ وەستانەوەمان بەرانبەر دیاردەیەکی دزێوی نا پەروەردەیی، ئەگەر بیرەکانمان وەکو یەك نەبێ واتە رەفتارو هەڵوێستمان وەکو یەك نابێ و جیاواز دەبین، جیاواز بونیش لە زیانی پرۆسەکەیە.

## ئەرکێکی پەروەردە فێرکردنە و ئامانجی فێرکردنیش پەروەردەیە

فێر بوون، ئەو کردارە خۆرسك و بەردەوامە سروشتیەکە ئەزمونی ژیان پێمان دەبەخشێ، بەڵام فێرکردن چەند هۆکارو شێوازێکە بۆ خێرا کردنی کرداری فێربوونە کە، واتا فازانج لە (کات) دادەکەین، هاوکات روودانی گۆرانکاریەکە بەسەر بەجێهێنانەکانی ژیانماندا وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ کارتێکەرو وروژێنەرەکانی دەرەوەی خۆمان و (شارەزایی و پەراوەو راهێنان) رۆڵی تێدا دەبینن، لە رووی فەسیۆلۆژیشەوە (فێرکردن) کردارێکی ژیریەو لە ناخی مرۆڤدا بەرپا دەبێت لە رووی زانیاری و باربۆکردنی ئەو مرۆڤە بە زانیاری نوێ بە چەشنێك لەگەڵ شارەزایی پێشووتری ناویادگەکەیدا بگونجێ و گۆرانکاری یەك لە بیرو هزریدا دروست بکات).

بەهەر حاڵ لە هەموو بارەکاندا فێرکردن و فێربوون کرداری گۆرانکاری و دەگرێتەوە جا ئەو گۆرانکاریە زیاد کردنی زانیاری یان رەفتاریی بێت، مرۆڤەکە خۆی ئەنجامی بدات یان رێنمایی بکرێ و فێرکارێکی هەبێت، پاڵنەرەکە لە ناخی خۆیدا یان لە دەرەوەی خۆی، واتە فێربوون و فێرکردن دوو کردان و بە پێویستیە سەرەکیەکانی ژیانی مرۆڤ دادەنرێت، کەواتە یەکێك لە ئەرکە سەرەکیەکانی

پەروەردە بریتیە لە فێرکردن، جا ئەو فێرکردنە پراکتیکی بێ یان تیۆری، ڕاستەوخۆ بێ یان نا ڕاستەوخۆ، بە خواست بێ یان بەتۆبزی، کەم بێت یان زۆر، چاك بێ یان خراپ، بەلام دواجار ئەم فێرکردنەی کە پەروەردە پێوەی هەلۆێستاوە بێ مەبەست نیە بەلکو ئامانجێکی هەیە ئەویش فێرکردنی مرۆڤە بە پەروەردەکردنی خود، کەواتە کاتێك پەروەردە دەبێتە ئامانج ئەوا فێرکردن هۆکارێکی کارایە بۆ ئەو پەروەردەکردنە و کاتێکیش فێرکردن دەبێتە ئامانج ئەوا پەروەردە ڕیخۆشکەرێکی گرنگە، بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، بەم پێیە (پەروەردە) و (فێرکردن) لە یەکتری جیا ناکرێنەوە جا پرۆسەکە لە سنوری خودی تاکە کەسدا بێت یان لە چوار چێوەیەکی کۆمەلایەتی وەك خێزان و کۆمەلگە یان لە دەزگایەکی فەرمی وەك قوتابخانە و پەیمانگە و ڕێکخراوەکاندا بێت.

ئەندامانی خێزان هەریەکەیان بە جیا خاوەنی بیرو بۆ چوون و ڕێچکەی ژیانی خۆیانن، ڕاوبۆچوون و هزرو بیری تایبەت بە خۆیان هەیە، هاوکات بەکۆی گشتی ئەندامەکانی ئەو خێزانەش هزری گشتی فەلسەفەی خێزانەکەی و سستمی پەروەردەیان دێتە بەرهەم، کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری کۆمەلگە و کۆمەلگەش هەر دەکەوێتە ژێر کاریگەری تاکە کانیەوە.

خێزان کارگەیەکی بەردەوام لە کاردایە بۆ دروستکردنی تاکی نوێ و دەیخاتە بازاڕی کۆمەلگەوە / کۆمەلگەش لە قالبی دەدات بەو چەشنەی کە شیاو بێ بۆ مانەوە لەناو سنوری ئەو کۆمەلگەیەدا بۆ بە کۆمەلێك پاساو نەریت و سستمی بەسەردا دەسەپێنێ و لە بەرانبەریشدا مرۆڤەکەش بەشێکی زۆر لە حەزو ئازادیەکانی دەکات بە قوربانی کۆمەلگە و لە نوێ دەست بەخۆدارشتنەوەیەکی تری خۆی دەکاتەوە بەو چەشنەی کە کۆمەلگەکەی پەسەندی بکات.

کۆمەلگە بە پێوەری ڕەفتار تاکەکان هەلدەسەنگێنێت و پۆلێنیان دەکات و توانای وردەکاری نیە لە هەلسەنگاندنی هزرو بیرەکانیدا، لەبەر ئەوە مرۆڤەکان هەوڵ دەدەن بیرە سەلبیەکانیان بشارنەوە و ڕەفتارە ئیجابیەکانیان زەق بکەنەوە

تاكو زۆرترین ڕەزامەندی كۆمەڵگە بۆ خۆیان مسۆگەر بكەن، لێرەوە مرۆڤ فێری شاردنەوەی بیرو هزرە ڕەسەنەكانی خۆی دەبێت لە پێناوی پاراستنی هەندێ لەبەر ژەوەندیەكانیدا، ئیتر دەرگای دوو ڕوویی و درۆكردن و دەمامكداری بە رووی خۆیدا دەكاتەوە، تەنانەت هەندێ كەس هێندە لەوانە قاڵ دەبنەوە كە (كەسێتی خودی خۆشیان) لێ ون دەبێ و نایناسنەوە سەرەنجام تەرازووی مامەڵەكردنیان لێ لاسەنگ دەبێ و نازانن چۆن و بەكام شێواز مامەڵە لەگەڵ خودی خۆیان یان خەڵكی تردا بكەن، دەروازەكانی ژیری لە خوی دادەخات و دەروازەكانی سۆزو میزاجگەرایی دەخاتە سەر پشت، تا دەگات بەو ڕادەیەی بەزەیی بە خۆیدا بێتەوە و بەو پەڕی میهرەبانیەوە دڵنەوایی خۆی بكات و هەزاران بەهانە و بیانوو بێنێتەوە تاكو كەمتەرخەمیەكانی خۆی پەردەپۆش بكات و كەسانی تری پێ تاوانبار بكات، بەو جۆرە زووربەی خەڵكی ئەم هەڵەیە دوبارە دەكەنەوە و هەمیشە خۆیان بە چاك و پاك و بێ گوناه دەزانن و كەسانی تریش بە تاوانبارو تێكدەر لە قەڵەم دەدەن، لە كاتێكدا هۆكاری ئەمە بریتیە لە (كپ كردنی بیرە ئازادەكانی خۆت) كە نەتتوانیوە ڕاستگۆبیت لەگەڵ خۆتدا، بۆیە ناشتوانیت ڕاستگۆ بیت لەگەڵ خەڵكی تردا.

یەكێك لە ئەركە سەرەكیەكانی خێزان ئەوەیە كە ئەندامەكانی فێری ڕادەربڕینی ئازادانە بكات و نەهێڵێت هزرو بیرەكان خۆیان بخۆنەوە و كپ بكرێت، چونكە هەر ڕۆژێك بێت كپ كراوەكان دەتەقێنەوە و مەنجەڵە داخراوەكان سەرقاپیان لەسەر لا دەبرێت، ئەو ساكەش زۆر بە خراپی دەشكێتەوە بەسەر ئەندامانی خێزانەكەت و كۆمەڵگە و وڵات و نیشتمانەكەتدا.

## فەلسەفەی پەروەردەیی و ئامانجەکانی
## لە کاری پەروەردەی خێزانیدا

لەبەر ئەوەی هەموو خێزانێك پابەندی سستمێکی کۆمەڵایەتی و بەڕێوەبردنێکی تایبەت بە خۆیەتی، جا بەرپرسانی ئەو خێزانە خۆیان لەوە ئاگادار بن یان نا، گرنگ ئەوەیە ئەگەر بەرپرسی خێزان خۆی ئەو سستمە دانە ڕێژێت و پەیڕەوی نەکات، ئەوا بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی جۆرە سستمێك خۆی دروست دەکات و خۆی دەسەپێنێ ن کە زوربەی کات سستمی خۆسەپێن دیاردەکانی پەرچەکرداری زیاتر پێوە دیارە لەوەی کە کردار بێت. بۆیە بەرهەمە کەیشی بە زۆری سەلبی یە، بۆ ئەوەی خێزان تووشی ئەو کێشەیە نەبێت و ئەندامەکانی نەبنە قوربانی سستمێکی لابەلای، پێویستە بەرپرسانی خێزان خۆیان وردەکار بن لە دارشتنی سستمێکی شیاو بۆ ئیدارەی خێزان و سکێجی فەلسەفیانەی ڕەوتی خێزانەکەیان، ئەمەش وا پێویست دەکات کە بەرپرسانی خێزان ئامانجی گشتی خێزان و ئامانجە ستراتیژیەکانی و ئامانجی تایبەتی بۆ هەریەکە لە ئەندامانی خێزان دیاری بکەن، کە ئەو ئامانجانە واقعی بن و شیاوی جێبەجێکردن بن لە ڕووی توانا و لێهاتویی و تەمەنی هەریەکەیانەوە، هاوکات بەرپرسانی خێزان (باوك، دایك، برای گەورە، خوشکی گەورە، بەخێوکار... هتد) دەبێ بەردەوام کار ئاسانی بکەن بۆ هاوکاریکردنی ئەندامەکانی خێزانەکەیان تاکو بیانگەیەننە ئامانجەکانیان و بەدواداچوونی بەردەوامیشیان بۆیان هەبێت.

## دیارکردنی ئامانج و ئامانجە یە دەگەکان

گەیشتنی هەموو مرۆڤێك بە ئامانجێکی دیاریکراوی خۆی پێویستی بە (کات) و (بودجە) دەبێت، واتە دەبێت ئامانجەکە بە هێندی قەبارەی ئەو وزەو کات و بودجە یە بێت کە کەسەکە هەیەتی، کەواتە کرداری گەیشتنە ئامانج

پرۆسەیەکە لەسەر دوو بنەمای سەرەکی دانراوە کە بریتین لە (کات) و (بودجە)، مەبەستیش لە (کات) ئەو ماوەیەیەکە مرۆڤ لە یەکەم هەنگاوەوە ئەیەوێت تا دەگاتە ئامانجەکەی کە لە وانەیە بە خولەك دەست پێ بکات و بە ساڵ کۆتایی بێت، واتە هەندێ وردە ئامانج لە ماوەی چەند خولەکێکدا دێتە دی، بەڵام ئامانجی وا هەیە کە هەفتە و مانگ و ساڵی دەوێت، هەروەها (بودجە) مەبەست تەنها لە بوونی پارەو پول نیە، بەڵکو ئەمانە دەگرێتەوە : (پارە و پولی پێویست، پارەو تێچوونی یەدەگ، نەخشە و پلان، توانای ژیری و جەستەیی و دەروونی، وزەی ماددی و مەعنەوی : متمانە و باوەڕ بە خۆ بوون، سووربوون و بەردەوامی و... هتد).

بۆ نمونە یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەت خوێندکاری پۆلی یازدەی زانستی یە، ساڵی داینده ساڵێکی گەورە و چارەنووس سازە بۆ دیاریکردنی داهاتوی، پێویستە لە ئێستاوە پلانی ورد دبرێژی بۆ گەیاندنی ئەو ئەندامی خێزانەکەت بە ئامانجەکەی بە شێوەیەکی سەرکەوتوو، دەبێت سەرجەم ئەو هۆکارو شێوازانە بگرێتە بەر کە دەبنەمایەی نزیك کردنەوەی ئەو خوێندکارەت لە ئامانجەکەی و هەموو پێویستیە مادی و مەعنەویەکانی بۆ دەستەبەر بکەیت، هاوکات خۆشی بوروژێنی بۆ خستە گەڕی سەرجەم توانا و ناوخۆی یەکانی خۆی، تا ئێرە ئەرکی تۆی بەرپرسی خێزانەکە و خوێندکارەکەتە بەڵام ئەگەر هاتوو نەتانتوانی بەو هەموو ڕێ و شوێن و پلانەوە لەو ساڵەدا سەرکەوتووبن ئەوا دەبێ ئامانجی یە دەگت ئامادە کردبێ بۆ ئەوەی پەیڕەوی ئەگەری ئەنجامەکانت کرد بێ و ئەو بە ئامانج نەگەیشتنە بە (شکستی) ناونەبەیت.

کەواتە گەورە و بەرپرسی خێزان دەبێ لەگەڵ دیاری کردنی ئامانج بۆ هەریەکە لە ئەندامانی خێزانەکەی دا ئامانجە یەدەگەکانیشی دابنێ، هەر وەکو چۆن کاتێك مامۆستا پرسیارەکانی تاقی کردنەوەی خولی یەکەمی ساڵانە دادەنێت، هاوکات پرسیارەکانی خولی دووەمیش دادەنێت و هەر ڕووکی پێکەوە دەسپێرێت بە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی، تاکو ئەو خوێندکارانەی لە خولی یەکەمی

تاقیکردنەوەکانیـدا نەگەیەیـشتونە ئامـانجی دەرچـوون، لـە خـولی دووەمـدا پێـی بگەن.

ئـەرکی مـرۆڤ هـەوڵ و کۆشـشە بـۆ گەیـشتن بـە ئامانجـەکانی بـەو پـەڕی دڵسۆزی و بـەردەوامی و گرتنـە بـەری ڕێوشـوێنی پێویـست، ئەمـەش گـەورەترین ئەزموون و سەرکەوتنە بۆی، خۆ ئەگەر بەو جۆرەش هەر نەگەیـشتە ئامانجەکـەی کەواتە سەرکەوتنی یەکەمی لە دەست نەداوە و دەشێت هۆکارەکەی بگەڕێتـەوە بـۆ بـوونی هەڵەیـەکی تـەکنیکی، هەڵـەی تـەکنیکیش بـە چەسـپ قـایم نـەکراوە بـە ئامانجەکانەوە دەشێت لە هەموو تەمەنتدا یـەك جـار ڕوویـدات، ئـەو جارەش ئـەو جارەیانە کە پێت وایە گـەورەترین زیـانی لـەتۆ داوە، بـەڵام ئـەم بیرکردنـەوەی تـۆ وایە مەرج نیە ڕووە لۆژیکی یەکەیش وابێت.




ڕاستە ئامـانج هەمیـشە لـە لوتکـە دایـە بـەڵام کاتێـك کـە ئـەو لوتکەیـە لـە ئاسـتی تواناى

مرۆڤەکەدا بێ، خۆ ئەگەر وانە بوو ئەوا ئامانج دابەزێنەرەوە خوارەوە، ئەوسا بە گوێرەی تواناکەی تۆ لە کام شوێنی سێگۆشەکەدا وەستایەوە ئەوە

گەورەترین ئامانجی لوتکەی تۆیە دوورنیە ئـەو ئامانجـە لـە ڕووی بـەهاوە کەمتر بێ لەوەی کە تـۆ دەتـەوێت، بـەڵام لـە ڕووی پانتـایی و واقعـەوە لەوەیـە کـە توانیوتـە بـە دەسـتی بهێنـی، کەواتـە دەکرێـت لـە هـەنگاوەکانی دا هاتووتـدا سـەر لەنوێ بـەرەو ئامانجـە لوتکـەیی یـە کـانی تـریش بڕۆیـت ئـەم ڕوونکردنەوەیـە بـۆ خێزان و قوتابخانەش ڕاستە، بۆ نمونە :

کاتێك مامۆستا دەیەوێت وانەیەکی بیرکاری بـە قوتابیـەکانی بڵێـت، دەبـێ

ئامانجی ئەو وانەیەی دیاری بکات و بزانێت ئایا (کات) و (بودجە - وزەو توانا) ی پێویستی بۆ دەستەبەرو مسۆگەر کردوە ن ئەگەر وا بوو ئەوا بێ گومان سەرکەوتووە، ئەگەر وا نەبوو دەبێ باشتر خۆی ئامادە بکات و بەدواداچوونی ورد بۆ ئەنجامی کارەکەی و هۆکارەکانی بکات، بۆ نمونە : مامۆستای زمانی ئینگلیزی دەیەوێت لە ماوەی (١) هەفتەدا قوتابیەکانی پۆلێکی دیاری کراو فێری سەرجەم ئەو ڕستەو دەستەواژانە بکات کە مرۆڤ لە چوار چێوەی ماڵی خۆیدا بەکاریان دەهێنێ بە زمانی ئینگلیزی، کەواتە دەبێ سەرەتا سەرجەم وشە و ڕستە و دەستە واژەکان بەرێز بە دوای یەکتریدا بنووسێت، بۆ قوتابیەکانی بنوسێتەوە، پێیان بخوێنێتەوە، بە شێوەی نواندن و پراکتیك پێیان بکات بە سپێڵ و واتا و شێوازی دەنگی دروست پێیان لەبەر بکات، لێیان بپرسێتەوە سەرەنجام بۆی بۆی دەردەکەوێت کە لە ماوەی ئەو (١) هەفتەیە دا ئامانجی خۆی پێکا، ئێستا ئامانجی هەفتەی دووەم دادەرێژێت بە خۆی و پەدەگەکەیەوە.

بەم پێیە کاری گەیشتن بە ئامانج کارێکی هەرەمەکی نیە، بەڵکو پێویستی بە پلانی پێش وەخت و بە دیلەکان و پێداویستیەکان هەیە، هەموو ژیان بریتیە لە پرۆسەیەکی بەردەوام بۆ گەیشتن بە ئامانجە باڵاکان و هەوڵی هەموو مرۆڤەکانیش هەر ئەوەیە، بۆ نمونە : کە سێکی کرێنشین دەیەوێت ببێت بە خاوەنی خۆی، لەبەر ئەوە دەبێت بودجە دەستە بەر بکات، واتە دەبێ کار بکات، دەبێتە شاگردی چێشتخانەیەك ئامانجی ئەم پیاوە پەیدا کردنی پارەیە بۆیە لە چێشتخانەیە، ئامانجی خاوەنی چێشتخانەکە پێشکەشکردنی خۆراکی باشە بە میوانەکانی بۆیە ئەم شاگردەی هێناوە و لە بەرانبەر کارەکەیدا پارەیەکی دەداتێ، بەم شێوەیە هەریەکە لە مرۆڤەکان کەلە کارو چالاکی و جم و جۆڵدان لە ڕاستیدا لە هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ئامانجە دیاریکراوەکانی خۆیان، لە ئامانجێکەوە بۆ ئامانجێکی تر.

## ڕێزگرتن و خۆشەویستی
## دوو بنەمای پەیڕەوی فەلسەفەی پەروەردەن

هەر یەکە لە مرۆڤەکان هەڵگری بەرنامەیەکی فیکری تایبەت بە خۆیانن، هەر ئەو فکرو بیرەیشیانە کە بووەتە مایەی دروستکردنی هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانیان هەر ئەو ڕەفتارانەشن بونەتە مایەی دیاری کردنی جۆرایەتی کەسێتی ئەو مرۆڤانە، ئەو بیرانە ڕاست بن یان هەڵە، گرنگ ئەوەیە بە شێکن لە پێکهاتەی کەسێتی مرۆڤەکان لەبەر ئەوە لە بنەڕەتدا ڕێزی هەموو بیرو بۆ چونەکانی مرۆڤ دەگیرێت و دواتر کار لەسەر ڕاستکردنەوەی بیرە هەڵەکانیان دەکرێت، نابێ ڕقمان لە هیچ کەسێك بێتەوە کە ڕەفتارەکانی هەڵەیە، بەڵکو دەبێ ئەو کەسانە بە نەخۆشی لە قەڵەم بدەین و بە میهرەبانیەوە کار بکەیت بۆ چارەسەرکردنی ڕەفتارەکانیان و بیرە هەڵەکانیان، (ڕێزگرتن) و (ڕق لێبونەوە) دوو شتی جیاوازن و نابێ تێکەڵیان بکەین و دەبێ بە جیا جیا کاریان لەسەر بکەین. خۆشەویستیش کە گەورەترین نامەی دڵنیابوونەوە و سەلامەتیە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، هەزاران بەرهەمی نایابی لێ دەکەوێتەوە، هی جۆرە پەیوەندیەکی مرۆڤەکان بە یەکتریەوە چێژی دەروونی و ئارامی بە مرۆڤەکان نا بەخشێت ئەگەر هەوێنی ئەو پەیوەندیە خۆشەویستی نەبێت. ڕاستە لە زۆر شوێن گوڵەکان دروێن، بەلام گوڵە گەشەکان تەنها لە باخچەی خۆشەویستیدا دەبینرێن، تۆی مرۆڤ ئەگەر خۆتت خۆش نەوێ هەر زوو لە خۆت بێزار دەبێت تۆ نزیکترین کەسیت لە خۆتەوە کە هەمیشە لەگەڵ خۆتدایت، کەواتە ناخۆشترین ژیانت هەیە ئەگەر لە خۆت بێزار بیت و خۆت خۆش نەوێ، هەنگاوی یەکەمت ئەوەیە کە بە خۆت ڕازی بیت، بەو شێوەیەی کە هەیت، هەنگاوی دووەمت خۆت ڕابێنە بەو کەسانەش ڕازی بیت کە وەکو تۆ نین. بۆ ئەوەی لە هەنگاوی سێهەمدا لە ڕێگەی خۆشەویستیەوە بۆیان بتوانیت بیانکەیتە ئەو

مرۆڤەی کە ئەوانیشس وەکو تۆ  بە خۆیان ڕازی بن و بە تۆش قایل بن، ئەمەش کرداری دروستکردنی تۆڕەی گۆرانکاری ژیانە بەرەو ئیجابی بوون کە هەوێنەکەی بریتیە  لە خۆشەویستی.

ئەندامانی خێزان و قوتابیان لە قوتابخانە و فەرمانبەران لە فەرمانگەکانیان و پیشەوەران لە کارگەکانیان و خەڵکی لە شەقام و بازاڕ و کۆڵان و گەڕەك لادێکاندا تەنها بە یەك شێوازو یەك ڕێگا گوێ لە یەکتری دەگرن و فرمانی یەکتری جێ بەجێ دەکەن. ئەویش (ڕێزلێگرتن و خۆشەویستی) یە، هیچ کەسێك ئامادە نیە گوێ لە تۆ بگرێت تاکو دڵنیا نەبێت لەوەی کە تۆ قەدری دەگریت و خۆشت دەوێ، کەواتە هیچ پەیامێکی پەروەردەکردن و فێرکردن و پیشە و کار بەبێ بوونی هەوێنی خۆشەویستی ناگاتە بەرانبەرەکەت، هیچ وتەیەکی زاری تۆ بەبێ بوونی ناوەندیگی گەیە تەر لە زمانتەوە بۆ گوێچکەی بەرانبەرەکەت بە باشی ناگات و وەرناگیرێت، بێگومان ئەو ناوەندەشی تەنها (خۆشەویستی) یە، کەواتە بۆ ئەوەی گۆرانکاری بکەین و پەروەردەیەکی دروستی نەوەکانمان دەبکەین :

- دایك و باوك و ئەندامانی یەکتریان لەلایە ڕێزو خۆشەویستی
- مامۆستایان لە نێوان خۆیاندا یەکتریان خۆش بوێ.
- بەرێوەبەر هەموویانی خۆش بوێ
- مامۆستا قوتابیەکانی خۆش بوێ
- قوتابیان مامۆستاکانیان خۆش بوێ
- فەرمانبەران و کارگوزارانی قوتابخانە یەکتریان خۆش بوێ.
- دایکان و باوکان مامۆستاکانیان  خۆش بوێ بە پێچەوانەیشەوە ز
- هەمووومان یەکتریمان خۆش بوێ لە چوار چێوەی خێزانی و کۆمەڵگەکەماندا بە تاك و کۆمانەوە.

ئەوسا پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن و کۆمەڵایەتیمان سەرکەوتوو دەبێ، بێگومان لە هەر وڵاتێکیشدا پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن سەرکەوتوو بوو، ئەوا

**بەرزی ئامانج :**

بیرم پیر نیە، بۆیە (بیری پیر) م نیە

هەمیشە بەبیرم.... لاوم

گەرچی لە ڕوودا وەکو پیرە لە بەرچاوم

هەر چەندە جەستەم بەرەو پیریم دەبا

دەبا وانە با، ئەوسا دەتبینی کە با

جەستە شکست دەکا و تەمەن دەبا

زۆرمان بیژا کە باوا باو وانەبا

تەمەن ئەمرۆ نی تۆیە و تۆزی

کە باهەلگا، گیان ڕادەکا (خەرمانی بوون) دەکا بە با

ئەمرۆ گەنج و سبەی بۆزی، ئیستا زیرو سبەی تۆزی

بەلێ هەر وایە ئەم ژینە شاییە یاخود شینە.. ئاواتە لەشەو تا سەبا.

هانمان دەدا، لە ناخماندا بیرمان بەرەو ئامانج دەبا

بابە ئامانجێك ناویرێ کە تابیبا

هەر وا گەشە و بەرەوگەشتریشی دەبا

هەموو پرۆسەكانی تریشی سەركەوتوو دەبێ وەكو  پرۆسەی ئابوری و سیاسی و... هتد لە مانەوە گەیشتینە ئەو ڕاستیەی كە هەموو شكستیەك كەلە كۆمەڵگەدا رووبدات هۆكارە سەرەكیەكەی پەروەردەیە لە (خێزان و كۆمەڵگە) وە هەموو سەركەوتنێك كە بەدەست بێت هۆكارەكەی پەروەردەیە. كەواتە (پەروەردە) گۆچانێكە سەرێكیانی ئاڵۆز و خوارو پێچاوپێچە، سەرەكی تریشی ڕاست و دروست بێ گرێ یە، پەروەردە هۆكارە بۆ خولقاندنی  هەموو كێشە و گرفتەكانی كۆمەڵگە و چارەسەریشە بۆ هەموو گرفت و كێشەكان، ئیتر خۆتان ئازادن. لە بەكار هێنانیدا، ئایا ئەو گۆچانەی كە ناوی (پەروەردە) یە بەكام سەرەیاندا دەیخەیتە كار؟ بێگومان ئەو ئەنجامەی دەستیشت دەكەوێ شیاوە لەگەڵ جەمسەرە بەكار هاتوەكەدا.

لە كۆتایی ئەم كتێبەدا ئەگەر چی من شاعیر نیم بەلام لە خۆشەویستیم بۆ ئامانجەكان هەستێكم دەربڕیوە و پێشكەش بە تۆی بەڕێزی دەكەم هیوادارم لە شعر بچێت و وەك دیاریەك لێم وەربگریت بە بۆنەی تەواو كردنی خوێندنەوەی ئەم كتێبە.

## سەرچاوەکان


١. المعلم.. نظريات و تطبيقات — دكتور أنور محمد الشرقاوى
٢. تأريخ حضارات العالم — شارل سنيو بوس
٣. الفكر التربوي المعاصر — دكتور حسن جميل طة
٤. علم النفس النمو — دكتور حامد عبدالسلام زهران
٥. صفات المعلمين الفاعلين — دكتور محمد صالح خطاب
٦. الأدارة والتخطيط التربوى — دكتور محمد حسنين
٧. قاموس علم النفس — دكتور عبدالستار طاهر شريف
٨. علم النفس التربوى — دكتور عبدالمجيد نشواتى
٩. نەخۆشی گرفتە دەرونی و کۆمەڵایەتیەکان — دکتور کریم قەرەچەتانی
١٠. گۆڤاری پەروەردە و فێرکردن ژمارە(٢) ساڵی ٢٠٠٩ — وەزارەتی پەروەردە
١١. تەفسیری خاڵ بەرگی ١ — شێخ محمدی خاڵ
١٢. هێزی بیرکردنەوە — دکتور ابراهيم حليمه
١٣. ئەو سەرچاوانەی سودم لی وەرگرتون بۆ کتێبی فەلسەفەی پەروەردە کە کتێبی یەکەمی ئەم زنجیرەیە و نزیکەی (٥٠) سەرچاوەیە.